# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕان و کەلتووری بیانی

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

ژمارە (8) نیسانی. 2000 – ساڵی دووەم



خاوەنی ئیمتیاز : شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر : ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین : ئازاد بەرزنجی

دەستەی نووسین :

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری : قادر میرخان



ناونیشان:

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن : 29839 یان 4347

بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە

سەنتەری سەرچنار

Tel: 0044 162 84 86008

Fax: 0044 162 84 77660



بەرگ: ئۆفسێتی دلێر

# سەردەم

ژمارە (8) نیسانی. 2000 ساڵی دووەم

# ئێمەو بەجیهانی بوون

کۆمەڵگای ئێمە، وەك هەر کۆمەڵگایەکی پەراوێز، هەمیشە لەبەردەم دڵە ڕاوکێی دیاردەو ڕووداوە فیکری و تەکنەلۆژیاکانی دنیادا لە گێژەنی قبووڵ کردن و ڕەت کردنەوەدایە، کە دەشێت پێکهاتە ئاینی و چینایەتیەکەی دەوری سەرەکی لەم حاڵەتەدا ببینن. قبووڵ کردن وەك هزری سەردەم و بە پیرەوەچوونی ئەو داهێنانە فیکری و تەکنیکیانەی کە دنیایان بۆ مرۆڤ کردۆتە گوندێکی بچووك و قبووڵ نەکردنی یانی دواکەوتن و خۆهێشتنەوە لەنێو بەستەڵەکی ئایین و بیرە کۆنەپەرستەکاندا. ڕەت کردنەوەیشی وەك خۆ بەستنەوە بەو کلتورو پێشینەیەوە کە بە درێژایی سەدان ساڵ مێژووی ئێمەی بەرهەم هێناوەو، تا ڕادەی بە پیرۆز ڕاگرتن و دەست کاری نەکردنی بەهاکانی کاری لەسەر کردووەو خۆی لەسەر ڕاهێناوە. کە لە حاڵەتی قبووڵ کردندا هەموو ئەو تایبەتمەندیانە لەکیس دەچن. دیارە هەر لایەنەو پاکانەو پاساوی ئامادەی خۆی هەیە، هەندێك قبووڵ کردنەکە بە بەشێك لەو ڕوانینە بەجیهانی بوونە (عولمە) دەزانێت کە دەشێت بێ ویستی خۆیشمان بێتە ناو ژیانی: ئابوری، سیاسی، ڕووناکبیری، کۆمەڵایەتی و.. هتد مانەوەو کەلە خودی خۆیشیدا لە بەرژەوەندیماندایە. چونکە نە تایبەتمەندیەکی شارستانی گەورەی خۆمان دەدۆڕێنین، نە

ئەو کلتوورەی کە تێکەڵ بە کلتورێکی شێوێنراوی کەسانی تر- تەنانەت نەیارەکان- بوەو، نە ئەو مەدەنیەتە نەڕسکاوەیش کە هێشتا کۆمەڵگای کورد نەك نەگەیشتۆتە پراکتیزەکردنی بەڵکوو زوربەی خوێندەوارەکانیشی لە خەسڵەتەکانی نەگەیشتوون.

ئێمە لەبەردەم باهۆزی ئەم بەجیهانی بوون و سیستمە نوێیەدا کە دەشێت سەراپاگیر بێت و، ئەو بۆچوونە بەر تەسکەی پارێزگاری کردن لەو مێژوە کۆنە بۆمان هەیە ڕاڕابین، چونکە لەلایەکەوە سروشتی خودی مرۆڤ، سروشتێکی کۆمەڵایەتیە، ئەویش لە ڕاهاتن و ژیانی بە کۆمەڵ و خۆبەستنەوە بە داب و نەریت و بە پیرۆزکراوەکانیەوە خۆی دەنوێنێت و، لێ لادانی بە تاپۆو ناجۆر دەزانێت، لەلایەکەی ترەوە پێکهاتەی کۆمەڵگایەکی ناسەقامگیری پڕ لە کێشەی چینایەتی و مەزهەبی و پاشماوە و بۆماوە هەرە قووڵەکانی هەر لەوکاردانەوانەدا خۆی دەبینێتەوە، لەم جۆرە کۆمەڵگا خۆرهەڵاتیانەدا ئەم بیرو بۆچوونانە تا ڕادەیەکی زۆر لەسەر هەموو ئاستەکان خۆیان نمایش دەکەن و، دەیان فاکتەری ئاکاری و ئاینی و دەرونی لێ بەرهەم دێنن، بە تایبەتیش کە هەندێك لەو بەڵگانە قەناعەت بەخش بن بە بەشێکی کۆمەڵ و پەیوەندیان بە ئایندەی سەرجەم مرۆڤایەتیەوە هەبێت لەسەر ئاستەکانی: بەختەوەری مرۆڤ، یەکسانی، پاکۆ دانی ڕژێمە توتالیتارزمەکان، چاك کردنی باری ئابوری و... ئەمەیان وەك بانگەشەو، پەرەسەندن و بەرهەم هێنانی ئەم دام و دەزگاو کەرەسەی قڕکردنانەی کە لە خودی ئەو وڵاتانەوە -خۆراوا- بەرەو دەزەوەی خۆیان و بە تایبەت بۆ وڵاتانی پەراوێز ڕەوانە دەکرێن، وەك پراکتیزە. تەنانەت لەناو خودی ئەو وڵاتانەدا کە بانگەشەی بیری بەجیهانی بوون دەکەن و لافی خۆشی گوزەرانی لێ دەدەن جیاوازی لە ژیانی چینە جیاوازەکانیدا زۆرەو لەو پەڕی سەرمایەدارەوە تا ئەم سەری برسی دەگرێتەوە.

ئەوەی جێی سەرنجە لە دوو ئایدیای جیاوە ئەم بیرە ڕەت دەکرێتەوە، کە هەردووکیان لە توندو تیژترین هەڵوێستی بەر یەکتر کەوتندان و هیچ پێکیان ناگەیەنێت و تەنیا لەسەر ئەم ڕەت کردنەوەو بە دوو تێ ڕوانینی جیاواز یەکانگیرن. یەکەمیان مارکسیستەکانە کە بەجیهانی بوونەکە بە پیلانێکی تازەی ئیمپریالیزم دەزانن و، هەر خودی سیستمەکە بە پرۆسەیەکی بیری سەرمایەداری دادەنێن بۆ زیاتر کردنی چەوسانەوەو هەژارکردنی گەلانی دی لە پێناو کۆلۆنیال کردنێکی تری بە بەر نامەو ناوێکی مودێرنەوە.

دوەم:- لەو ڕەت کەرەوانە- ئەو مەزهەبیانەن کە مەترسی لەناوچوونی کلتوری ئاینیان لەوێوە دەبێنن و، هەست بە نەمانی بەها پیرۆزەکانیان- کە لە ئاسمانەوە هاتوە- دەکەن و

وەك خۆیـان دەڵێـن: پشـت لـە ڕابردوویـان ناکـەن، ئـەم هەوڵـە لای ئیسـلامیەکان بـەهێزتر دەبیـنرێت و عەرەبـە ناسیونالیسـتەکانیش کەمانـەوەو تایبەتمـەندی خۆیـان هـەر لـەو ڕوانگەیەوە هەست پێدەکەن لەم ڕەوتی ڕەت کردنەوەیەدا بەشدارن.

ئێمەی کورد- وەك نەتەوەیەکی چەوساوە لەسەر ئاستی ئابوری و قەوارەی نەتەوەیی و فیکری- کەم وێنەین، ئێستایش لـە سەرانسـەری کوردستانی گەورەدا هـەزاران بێ سەوادو هەژارو ڕەنجبەرمان هەیە.تا ئێستاش فەلسەفەیەکمان نیە کە ڕەنگ ڕێژی ژیان و ئایندەو وجودمان بێت و، بتوانین لەوێوە دەست بە کاری بەرنامەی سیاسی، ڕوناکبیری، کۆمەڵایەتی خۆمان بین، بەرنامەی ئایندەو چارەنووسی کورد لە چوارچێوەی خەیاڵێکی پەتی- ئەویش تەنیا لەسەر ئاستی تاکەکان نەك حیزب و ڕێکخراوو دەزگای فیکری- تێنەپەڕیوە. واتا چەوسانەوەی کاملی لایەنی مادی و ڕۆحیمان، ئەمیان بەلایەك.

بەلای دووەمدا: کورد تەنانەت لە سیستەمە مەزهەبیەکشدا هەر پەراوێز و پاشکۆ بووە. ئەوەندەی گەلی کورد بە بیانووی ئاینەوە ستەمی لێ کراوە، شەڕی بۆ خەڵکی تر پێکراوە، ڕێگا لە بیرکردنەوەو داهێنانی گیراوە، قفڵ لە عەقڵی دراوە و لـە دەسـتکەوتەکانی ئـاین- بەلایەنە مادیەکەیدا- بێ بەشکراوە چ میللەتێکی دی ئەوەی پێ نەکراوە. کلتوری ئاینی بۆ کوردێك ئەوەندە پیرۆز و پڕ بایەخ نیە کە بۆ عەرەبێك هەیە یان بۆ تورکێك کە لە هیچەوە ئیمپراتۆریەتێکی پێ دروست کرد، هەر ئەو کلتورەش بۆتە بەهانە بۆ داگیرکردنی وڵاتی کوردو بەزۆر بە برا کردنی نا بەرامبەرو چەوساندنەوەی سەدان ساڵەی. کە ئەمە لە خۆیدا بۆتە هۆی ئەوەی کەسایەتی کورد کەسـایەتێکی بـەردەوام ڕاڕاو لـەرزۆك و بـێ ئیرادەبێت قە[illegible]ارەی گەورەی ئێستای عەرەب- چ وەك جوگرافیای وڵاتەکەی و چ وەك ژمارەی خـودی [illegible]ەب- لە ئاینەکەیەوە سەرچاوەی گرتوە. ئەگینا نە بیابانە گەرم و ڕووتەڵەکەی لە چیاو پێ[illegible]ەشتەکانی کورد جوانترو بە بژوێن ترە و،نە دۆشاوی خورمای عەقڵ و ئیدارەیشیان لە [illegible]ەنگوینی خەڵکی دی شیرین و ڕەسەنتر بوە، هەر ئەم فاکتەرە پۆزەتیڤە بۆ عەرەب بۆتە هۆی بچووك بوونەوەو قووتدانی وڵاتی کوردو کەم کردنەوەی ژمارەی دانیشتوانی و بەسەرهاتە مەرگبارەکانی.

لێرەدا، لەم دوو ڕێیانەدا، ئێمە چی بکەین؟ ئێمە لە هەموو حاڵێکدا بە وتەکەی مارکس: بێجگە لە ئارەقەی ناوچاوو کۆت و پەیوەندەکانی دەست و قاچمان چیمان لە کیس دەچێت؟ ژێر دەستەیی، هەژاری، نەخوێندەواری، بێ فیکری و بێ کیانی، دڵە ڕاوکێی مێژوو کردی

سەدان ساڵەی ترس و تۆقینی قڕکردن و کیمیاباران، پیلانی هەموو ڕۆژە بۆ نەهێشتنی بوونی نەتەوەیمان، هەموو ئەمانە لەناو ناخی مرۆڤی کوردا بەردەوام لە زاووزیـدان، ئـەم پێکهاتە دەرونیە کەڵەکە بووی ڕووداوو کارەساتە جگەربڕەکانی مێژوی کۆن و نوێمانە، من بێگومـانم لەوەستان و بێ جوولەیی و بێ دەربەستی و بەشداری نەکردنمان لە ڕەوتە خێراکەی ئێستای دنیادا لە گرێی ئەم چەق بەستن و تەلیسمی خۆبە هیچ زانینە دەرناچین و، لەوانەیشە ئەوەی ماومانە لە دەستی بدەین، مێژوی مرۆڤایەتی بریتیە لە بەشداری کردن و چوونە ناو کێشەکانەوە، ئەگینا لە شوێنی خۆتدا دەپووکێیتەوە، تاقە شتێك بۆ ئێستای کورد هەوڵدان و بەشداریە لەو ڕەوتە خێرایەی بە جیهانی بوونەدا-لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا سیمایەکی تەواو ئاشکرای نیە- و خۆ فڕێدانە ناو گێژەنەکەیەتی، یان خێراترکردنی چوونەوە پێشەوەو ئامادەبوونیەتی.

چونکە من بێگومانم، کورد لە -سیروان-یش بدات لە ئێستای هەر چاکتر دەبێت و، ئەگەر ئەمە نەکات لە هەزارەی سێیەمیشدا هەر بەبێ پێناسەیی دەمێنێتەوە.

***سەرنووسەر***

# فیکرو فەلسەفە



- ئۆگست کۆنت ب2.    لویس ئەی کۆسەر
- سنوورەکانی مەعریفەی فەلسەفی    بێرتراند ڕەسڵ
- ڕەچەڵەکەکانی ئایین لەمناڵدا    ئیلکایند
- کۆمەڵگەو دەسەلات لە تیۆرەکانی پەیمانی کۆمەلایەتیدا    جۆرج تەرابیشی

# ئۆگست کۆنت

■ لویس. ئەی. کۆسەر

● و. لە ئیتالیەوە: د. ئەلبێرت عیسا

*-بەشی دووەم-*

**3-دەقی فیکری**

ئۆگست کۆنت بە دڵنیایی ئەو نەوەیەی رۆشنگەری (التنویریە illualiaism) بوو کە ترادیسیۆنی (Tradition) فەیلەسوفەکانی پێشکەوتنی سەدەی هەژدەهەمی بەردەوام پێدا، بە تایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی بە بیری تورگۆت (Turgot) و (کۆندۆرسێ Condorcet) وە هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم خاڵە کە بێگومان ڕاستەوخۆیە و لە خۆیدا لادانێکی گەورەیە لە ڕێگای بیری (فکر)ی کۆنت دا. لە ڕاستیدا ئەم بیریارێك بوو کە دەچووەوە سەر ترادیسیۆنی (Tradithion) دێ بۆنالدو دێ مێتر (Debonald) و (Demailtre) کە دژێکی تەواوی روانگەی فەردانیەتی (individualist) کۆمەڵی مرۆڤایەتی بوو کە لە سەدەی هەژدەهەم بە تەواوی بڵاو بووبووەوە. خاوبوونەوەو تێکشکانی پێشڕەوی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە، ئەمی بێزار کردبوو و هەر وەکو بیریارە ترادیسۆنالیستەکان داوای دروست کردنەوەی کۆمەڵی ئەخلاقی ئەکرد. بە قێزکردنەوەی لەو "ئەنارکیەی (فوضی) کە رۆژ لە دوای رۆژ کۆمەڵی تێك دابوو" پاڵی پێوە ئەنا بەرەو پشکنینێکی بەردەوامی پێڕەو. پشکنینی پێڕەو هەموو دێڕەکانی ئیشە گەورەکەی داگیر کردبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوانەی دوای خۆی کە قسەیان لە سەر ئیشەکانی (کۆنت) کردووە، ئەم لایەنەی ئیشە گەورەکەیان روون نەکردۆتەوە و هێڵیان نەهێناوە بە ژێر تەوژمی ترادسیۆنی رۆشنگەری بۆ سەر بیرەکەی.

ئۆگست کۆنت لیبرالی بوو، بەڵام ئەمەی کە وتمان هەرچەندە لایەنێکی ڕاستی تێدا هەیە، کەمتر دەتوانرێ بەرگری لێ بکرێت: کەمتر لەو دوو شتەی کە وتمان. ڕاستە کە لە کاتێك لە

کاتەکانی ژیانیدا و بە تایبەتی سالآنی گەنجی، کۆنت زۆر زۆر بیریارە لیبراڵەکان، بە تایبەتی زانایانی ئابووری Jean Baptiste say, و Adamsmith کاریگەریان لە سەری هەبوو. ئەتوانریَ ئەو ترادیسیۆنە باس بکریَت کە کۆنت پێوەی بەسترابووەوە، بۆ نموونە هەندێ لە نووسینەکانی کانتی (Kant) ی ئەناسی وەکو ئەو نووسینە بە پیتەی "بیری مرۆڤایەتی گشتی (Univrsal) لە روانگەی جیهانەوە" و بە "نزیکترین میّتافیزیك لە فەلسەفەی پۆزێتیڤەوە" حسابی بۆ دەکرد، لە سالّی 1824 لە نووسینێکیدا دەلّێت ئەگەر پێش ئەوە بیخوێنایەتەوە "زۆر ماندوو نە دەبوو"(53).

کۆنت خۆی بە درێژە پێدەری ترادیسیۆنی زانستی بیکۆن (Becon) و دیکارت دادەناو، لە راستیدا روانگەی کاتۆلیکی بۆسۆ (Bossuet) زۆر کاریگەری کردبووە سەری و مۆنتسکیۆ (Moutesquieu) و هیوم (Hume) و کۆندییاك (Condillac) و ئایدیۆلۆژەکان و زۆربەی زانا سروشتیەکانی سەردەمی نیوتن (Newton) یش لە نووسینەکانیدا بە ئاشکرا دیار بوون. بێگومان، دەتوانریَ بگوتریَ کە قەرزاری زۆر رێڕەوی (فکری) بوو، بەلّام لەبەرئەوەی خۆی لە هیچیاندا نەدەدۆزیەوە، بیری جیاواز جیاوازی پێکەوە کۆکردەوەو پوختەیەکی دروست کردبوو کە بوو بە هی خۆی؛ ئەم پوختەیە دەتوانریَ بوتریَ بەرامبەر ئیشە گەورەکەی سان سیمۆن ئەوەستێتەوە کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی کاری کردبووە سەر کۆنت. هەر لە گەنجیەوە تا سیی و پێنج سالّی (لەو تەمەنەی کە ئیتر وازی لە خوێندنی نوسینی خەلّکی دی هانی)، کۆنت لە زۆر سەرچاوەوە ئیلهامی وەردەگرت. لەم سەرچاوەیە زۆر لایەنی هەلّبژارد و تێهەلّکێشی کرد بە نووسینە بەرزەکەی خۆی.

شیکردنەوەی زیاتری ئەم مەسەلەیە لە ئەنجامی ئەم پەرتووکە دەچێتە دەرێ و وا بە باش دەزانریَ کە تەنها هەندێ لایەنی بیری ئەم نووسەرە بە شێوەیەکی قووڵ روون بکرێتەوە.

## 3-1- ترادیسیۆنی پێشکەوتن

لە سالّی 1750 بارۆن Anne Robert Teaques Turgot، وەزیری داهاتووی لویسی شانزەهەم، کە ئەو کاتە تەمەنی سیوسێ سالّ بوو دوو کۆنفرانسی لە سۆربۆن بەست کە بە گوێرەی قسەکانی Frank Manuel دادەنرێن بە "یەکەمین و گرنگترین رەنگدانەوەی چەرخە تازەکەی ئایدیۆلۆژی پێشکەوتن"(54).

بە دانانی پێڕەوی سروشت (کە بە شێوەیەکی ئەبەدی خۆی بە قەدەر خۆیەتی) بەرامبەر ژیانی مرۆڤایەتی، تورگۆت Turgot ئەیوت: "مێژووی مرۆڤ.. لە سەدەیەکەوە بۆ سەدەیەکی دی ئەگۆڕیَ.. هەموو چەرخێك بەستراوەتەوە بە یەکتریەوە بە هۆی چەند فاکتەر و ئەنجامێکەوە کە حالّەتی ئێستای جیهان دەبەستنەوە بە دۆخەکانی پێشووەوە" ئامرازی پەیوەندی و نووسین دوو شتن کە بە هۆیانەوە خەلّکی کولتووری خۆیان دەگوێزنەوە و "هەموو فۆرمە تایبەتیەکانی زانین دەگۆڕێن بۆ گەنجینەیەکی گشتی و هەموو نەوەیەك ئەیانگوێزێتەوە بۆ نەوەی داهاتوو هەروەکو پاشماوەی میراتێکی بەردەوام کە دەولّەمەند دەکریَ لە لایەن دۆزینەوەکانی هەر سەدەیەك؛ بەم شێوەیە رەگەزی مرۆڤایەتی... وەکو تەنها کۆی فراوان دەردەکەویَ کە وەکو هەموو فەردێك (کەسێك) بە قۆناغی منداڵی و بە پێشکەوتندا تێدەپەڕێت"(55).

تۆرگۆت Turgot دڵنیا بوو کە پێشکەوتن بەردەوامە و هیچ وەستانێك لە تەشەنە سەندنی میراتی فیکری روونادات، هەرچەندە زانست و ئەخلاق و تەکنەلۆژی و هونەر ئەتوانن بە ریتمی جیاواز جیاواز پێشکەون، بەم شێوەیە پێشکەوتنی نایەکسانی بێپێرەوی کاتی دروست دەکەن، بەڵام زانستەکان و بە تایبەتی زانستی ماتماتیکی هەمیشە پێشرەوی پێشکەوتن بوون. رەوتی بەرەو پێشەوە چوونی زانست بە هیچ شێوەیەك رێگەی پێناگیرێت.

ئەو گرنگیەی دراوە بە بوونی پەیوەندیەکی توند لە نێوان سەردەمە جیاوازەکانی مرۆڤایەتی و ئەو تەئکیدەی کە خراوەتە سەر لە سەدا سەدی تەشەنە سەندنی کەلەپووری کولتووری و بروا بە دەسەلاتی زانست کۆی زۆربەی رەگەزە سەرەکیەکانی سستمێکی کۆنتی دروست دەکەن و، کۆنت دەکەن بە بەردەوامدەری ئەو تراديسيۆنەی کە تۆرگۆت Turgot دەستی پێ کردووە.

هەروەها کۆنت قەرزێکی گەورەی هەبوو بەرامبەر مارکیز جان ئەنتوان کەریتای کۆندۆرسێشەوە (Jean Antonine Vicolas Condorecer). لە نووسینەکەی "کورتەی [illegible]لۆیەکی مێژوویی پێشکەوتنی رۆحی م[illegible]ڤایەتی" لەو کاتەدا نووسراوە کە لە دەست پۆلیسی رۆبسپیر Robes Pierre رایدەکرد، کۆندۆرسێ ئەو بیری پێشکەوتنەی هێنایە کایەوە کە تورگوت Turgot ئامادەی کردبوو ئەیبەستەوە بەو زنجیرە درێژە مێژوویيەی کە دەگاتە پیاوی تازەی عەقلانی: "بە چەند پلەیەك کە هەستی پێ ناکەین لە پیاوێك لەناو سروشت ئەگەینە درندە و لە درندەشەوەو بۆ رۆشنگەر و Eulero و نیوتن Newton"[56].

هەروەکو تۆرگۆت Turgot، کۆندۆرسێ بیری لەوە نەکردەوە کە نەتوانێ پرۆڤە پێشکەش بکات سەبارەت بە بەئەنجام گەیشتنی پێشکەوتن کە لە رابردوودا بووە، ئەیوت کە دوور نیە لە کاتێکی تایبەتیدا لە داهاتوودا ئەم پێشکەوتنە بێ سنوور نەبێ. هەروەکو Turgot، کۆندۆرسێ زانست و تەکنۆلۆژی دادەنا نەك تەنها وەکو چەند ئامرازێك کە مرۆڤایەتیان بەرەو پێشەوە بردووە، بەڵکو وەکو زۆر رەگەزی (element) گرنگی پاڵ پێوەنەری پێشکەوتنی داهاتوو. هەر چۆنێك بێت، لە کاتێکدا Turgot دڵنیا بوو لەوەی کە هاتنە کایەی بەردەوامی مرۆڤی زۆر زیرەك بزووتنەوەی پێشکەوتن گەشە پێدەدات، کۆندۆرسێ condorcet بیری ئەکردەوە کە بە پەروەردە کردن و فێرکردنی خەڵك لە لایەن دەوڵەتەوە، ئەتوانرێ ژمارەی زانا هۆشیارەکان زیاد بێ و بەو شێوەیە ریتمی پێشکەوتن گەلێك خێرا تر بکرێتەوە.

بۆ کەڵك وەرگرتن لە Nuora Aflantide ئەتڵەسی تازەی بیکۆن Bocon، کۆندۆرسێ پلانێکی ئامادە کردبوو تیایدا دەری خستبوو کە لەناو کۆمەڵێ زانستی تازەی داهاتوودا، زانا چاکەکان، لە سەر بناغەی هاوکاریەکی دوو لایەنە ئیشیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کردبێ و بەو شێوەیە بەرهەمی زانستیان چاك کردبێ: ئەم پیاوانەی زانست لە داهاتوودا سەرکردایەتی مرۆڤایەتی دەکەن. مرۆڤایەتی لە گەشەسەندنی ئاسایی خۆیدا بە شێوەیەکی خاوتر پێش دەکەوێ ئەگەر ئەو پیاوانە نەبن کە ئامادەن بۆ بەرێوەبردنی زانستی و خەڵکی ئاسایش رۆژێك لە رۆژان پەسەندی ئەم سەرکردایەتیە دەکەن بۆ ئەوەی بگەنە فۆرمێکی دیکەی کامڵ بوون. هەندێ نایەکسانی هەر بەردەوام دەبن، بەلام

لەبەرئەوەی مرۆڤایەتی ئەگاتە پلەیەکی بەرز، ئەم نایەکسانیە ئەوەندە ئازار و ئەشکەنجە بۆ ئادەمیزاد دروست ناکات.

مرۆڤایەتی حوکم دەکات لە دەیەمین چەرخی مێژووی مرۆڤ (کۆندۆرسێ نۆ چەرخی سەرەکی لە مێژووی پێشووی مرۆڤایەتی جیا کردبووەوە). بە بەرپەرچدانەوەی دوا پاشماوەی باوەڕی پڕوپووچ و باڵادەستی دەسەڵاتی قەشایەتی و بە داننان تەنها بە دەسەڵات و ئەرکی بەرزی زانست، خەڵکی چاکتر دەبن و دەبن بە هاوڵاتی سەربەست و عەقڵانی. پێشکەوتنی بیری و رۆحی شان بە شانی یەکتری دەڕۆن و ریتمی گەشی دۆزینەوە و داهێنانی زانستی پێشکەوتنی گشتی گەشە پێدەدەن.[57]

ئەم پەیوەندیە توند و تۆڵەی نێوان کۆنت و بیرە سەرەکیەکانی نووسەری کورتەی تابلۆیەکی مێژوویی پێشکەوتنی رۆحی مرۆڤایەتی بێگومان زۆر روونە؛ کۆنت خۆی، زۆر جار دانی بەوەدا ناوە کە زۆر قەرزاری کۆندۆرسێیە لەگەڵ ئەوەشدا دوو دۆگمی سەرەکی کۆندۆرسێی پەسەند نەدەکرد: باوەڕ بە تاک گەرایی (Individualiem) و یەکسانی رێژەیی.

سیستێمی بیری کۆنت چوارچێوەیەکی زۆر ژێرارکی و دار بە تاك گەرایی و نایەکسانی بوو؛ بەم شێوەیە، گرنگی تەواوی سان سیمۆنی روون ئەکردەوە، بەڵام نەك بە پلەیەکی نزمتر لە بیرەوەرە ترادیسیۆنەلیستەکان.

### 3-2 ترادیسیۆنی پێڕەو:

زۆر جار کۆنت سەرسامی گەورەی خۆی بەرامبەر ترادیسیۆنە لیستەکان دەردەبڕی وەکو "ئەو خوێندنگا نەمرەی کە دەکەوێتە.. ژێر سەرۆکایەتی مێستر de maistre کە تەواوکەرەکەی De bonald و یارمەتی شەتۆبریاندی (Chteaubriand) شاعیر بوو سەیری ئەکردن"[58].

ئەم ستایشەی کۆنت پاساوی خۆی هەبوو: کۆنت زۆر قەرزاری ئەم دوژمنانەی وادو بەڵێنی رۆشنگەران (تنویری illamiaism) بوو و بە قەدەر ئەوانیش قەرزاری "رۆشنگەری" خۆی بوو.

ترادیسۆنالیستە گرنگەکان هەموو کۆچیان کردبوو لە نێوان ئەمانە هەندێکی تیا بوو کە دژی شۆڕشەکەی نەبوون، بە لایەنی کەمەوە لە سەرەتادا. بۆ نموونە دی میستراڵ de Maister لە ساڵانی یەکەمی شۆڕشدا بە دۆست و لایەنگری یاکوبیەکان دادەنرا. بەڵام لە قۆناغی رادیکاڵی دوابیدا هەموو هەڵوێستیان گۆڕی، چونکە لە هەندەرانەوە شتیان دەنووسی، رەخنەیان لە هاونیشتمانەکانیان ئەگرت سەبارەت بە هەڵە لە هەڵسوکەوتیاندا. وەکو کاتۆلیکی پەرۆش و ریالیست، تاك گەرایەتی و سیکۆلاریزم و مافی سروشتیان بە دەربڕینی ئیشی شەیتان دادەنا لە قۆناغی دوایی شۆڕشدا دەرکەوت.

لە روانگەی ئەوانەوە، ئەگەر کۆمەڵگایەك بناغەکەی پێك نەهاتبێ لە هەندێ پەیوەندی ئەخلاقی تەقلیدی ئەوا ئەندامەکانی پێکەوە نەبەسراونەتەوە. بە بێ ژێرارکی و دەسەلاتێکی رەوای توند، کۆمەڵگا دەبێ بە شتێکی شێواو و بێ کەڵك: کۆمەڵگایەك یان کۆیەکی ئۆرگانیە (عضوی) یان هیچ نیە. هەوڵدان بۆ دامەزراندنی ژیانێکی کۆمەڵایەتی لەسەر بناغەی پەیمان لە نێوان خەڵکدا و، یاخود دروستکردنی کۆمەڵێك لە سەر بناغەی مافی سروشتی فەردی رەنگدانەوەی لووت بەرزی یاخود شێتی یاخود هەردووکیانە. خەڵك زیاتر ئەرکیان هەیە نەوەك ماف.

ئامانجی تایبەتی سووکایەتی پێکردنی ترادیسیۆنالیستەکان، رووسۆو (Rouseau) و کۆندۆرسێ (Condorcer) بوون. یەکەمیان دەیوت کە مرۆڤ باشە لە سروشتدا؛ لە نووسینەکەی بە ناوی ئیمیل (Emile)دەیوت: "هەموو شتێك کە لە لای دروستکەری شتەوەو دێت باشە، بەڵام خراپ دەبێت لە کاتێکدا دەچێتە دەستی مرۆڤەوە".

دی بۆنالد De Bonald، لە وەڵامدانەوەیدا دەیوت کە کۆمەڵ پێش هەموو شتێکە، بە واتای ئەوەی کە کۆمەڵ مرۆڤی چاك کردووە و راستەوخۆ کۆمەڵە کە ئادەمیزادی دروست کردووە. "ئێمە خراپین بۆ سروشت" و "ئەگەر باش بیت ئەوا بە هۆی کۆمەڵەوەیە. دڕندەیەك (وەحشیەك) مرۆڤ نیە، تەنانەت مرۆڤێکیش نیە لە سەر ئاستی مناڵ. تەنها مرۆڤێکی شێواوە"[59].

کۆندۆرسێش Condorcer خەوی بەوەوە دەبینی کە کۆمەڵ چاك بکات لە ڕێگای مرۆڤەوە؛ ئەم شێوە بینینە بە لای ترادیسیۆنە لیستەکانەوە شتێکی پووچەڵ بوو. دی بونالد de Bonald دەیوت: "کۆندرۆسێ دەیەوێ کە خەڵکی کۆمەڵ چاك بکەن، بەڵام من بە پێچەوانەوە دەڵێم کە تەنها کۆمەڵ مرۆڤ چاك دەکات چ لە ئاستی فیکریەوەو چ لە ئاستی مادیەوە"[60] بەلای ترادیسیۆنالیستەکانەوە هەڵەی سەرەکی ڕۆشنگەری ئەوەیە کە کۆمەڵ دەخەنە ژێر خزمەتی ئامانجەکانی مرۆڤەوە. دی بۆنالد de Bonald دەیوت: "مرۆڤ بوونی تەنها بۆ کۆمەڵە. کۆمەڵ پەروەردەی دەکات لە باوەشی خۆیداو بۆ خۆی"[61].

چ لە رووی لۆژیکیەوەو چ لە رووی ئەخلاقیەوە، قەوارەی کۆمەڵایەتی پێش قەوارەی فەردیە.

بەرامبەر روانگەیعەقلانی و سوودی کۆمەڵ وەکو کۆیەك لە خەڵك (فرد) کە خەریکی دواکەوتنی ئامانجە تایبەتیەکانی خۆیانن، ترادیسیۆنالیستەکان چەمکی گرووپی کۆمەڵایەتی دادەنێن. ئەمان دەڵێن کە شۆڕش ئەو گرووپە ناوەڕاستەی لە ناو برد؛ بە بێ ئەم گرووپە هیچ شێوە کۆمەڵێك ناتوانێ بوونی هەبێ، چونکە ئیشی تایبەتی ئەوەیە کە دڵنیایی ئەدا بە خەڵکی و دەیان پارێزێ و بەرەو ئامانجەکانی خۆیان دەیانبات.

(دی بونالد) دەیوت کە خێزان ناوکی سەرەکی کۆمەڵە. لە کۆمەڵە خێزانیەکان گرووپی گەورە دەبنەوەو ئەمانیش لە نێوان خۆیاندا چەند پەیوەندیەکی ژێرارکی دروست دەکەن کە دەسەڵاتی ڕۆحی پاپا و دەسەڵاتی کاتی (Temporal) پاشا ئەهێنێتە کایەوە. بەبێ دەسگای ئاینی کە ڕێڕەوی هەڵوێست و هەنگاوی فەردی بە ڕێی ڕاستی خۆیاندا دەبەن، هیچ کۆمەڵگایەك نامێنێ؛ بە بێ ئاین هیچ کۆمەڵگایەکی ئەخلاقی وجودی نیەو بە بێ ئەمە هیچ ژیانێکی کۆمەڵایەتی ناتوانێ بەردەوام بێت. دوور لەو پەیوەندیانەی کە بە شێوەیەکی ئەخلاقی فەردێکی گۆشەگیر و لە ژێر تەوژمی چاوچنۆکی پارە پەیدا کردندا.

لە روانگەی ترادیسیۆنالیستەکانەوە، ئەو ئادەمیزادەی کە دوورە لە ڕۆشنگەریەوە لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی، لە راستیدا هەست بە هیچ ناکات.

تەندروستی کۆمەڵ تەنها بە پێڕەوی جیاجیاوە بەستراوەتەوە کە پێکەوە کۆمەڵگا دروست دەکەن. بەلای ترادیسیۆنالیستەکانەوە کۆمەڵ وەکو کۆمەڵی (چەرخی ناوەڕاست) کۆمەڵێکی دەستەجەمعیە. لەگەڵ ئەوەشدا

پێویسته هەر ئاوا بوترێ کە هەر ترادیسیۆنالیستەکان نەبوون وشەی کۆیان (Pluralism) بەکار دەهێنا؛ ئەم چەمکە لە لایەن زۆر لە لیبرالەکانیشەوە بەکاردەهێنرا. هەروەکو خێزان، چین، تیرەو کۆمەڵگای ناوچەیی بەشی تایبەتی دەسەڵاتی خۆیانیان هەبوو؛ لەسەر ڕێژەیەکی بەرزتر، کەنیسەو دەوڵەتیش دەسەڵاتی خۆیانیان هەبوو. بە قەدەر ئەوەی کە ئەم دەستگاو ئەم گرووپانە دەتوانن لە داهاتوودا، ئامانجی خۆیان بەجێ بهێنن، بە قەدەر ئەوە هارمۆنی و ئارامی کۆمەڵایەتی بەردەوام دەبێت. پێڕەوی کۆمەڵایەتی کە بەرەنجامی گۆڕانی باشە، هاوسەنگیەکی لاوازی هەیە و خەڵکی دەتوانن تێکی بدەن دژی بەرژەوەندی خۆیان. ترادیسیۆنەلیستەکان ئەو قسەیەی شەکسپیریان دووبارە دەکردەوە "لە کاتێکدا کە ژێرارکی تێك دەچێ، هەموو پرۆژەیەك بێ هێز دەبێ"[62].

پێڕەو و ژێرارکی و کۆمەڵگای ئەخلاقی دەسەڵاتی رۆحی و گرنگی گرووپ بەسەر تاکەکەسدا، ئەمانەن بابەتی ترادیسیۆنەلیستەکان کە پێکەوە لەگەڵ نووسەری تر دەنگدانەوەی (صدی) خۆیان لە بیری کۆنت دا ئەدۆزنەوە، لە ڕاستیدا، کەمجار هەیە کە تەوژمی ئەوان لە ستاتیکی (وەستانی) کۆمەڵایەتی خۆی نەدۆزێتەوە. هەرچۆنێك بێت، کۆنت نەیدەتوانی هەڵوێستی کۆنەپەرستی ئەوان پەسەند بکات، لەبەرئەوەی دەبوایە لە داهاتوودا بە شوێن کۆمەڵێکی تەندروستیدا بگەڕایە، نەوەك لە کۆمەڵی سەدەکانی ناوەڕاستی رابردوو. هەرچەندە رای لە گەڵیان بوو سەبارەت بە سەرسامیان بۆ دەستکاری پاپای سەدەکانی ناوەڕاست و ناوبانگی کەنیسە، بەلام نەیدەویست واز لەو گەشبینیەی خۆی بهێنێ کە لە رۆشنگەریەوە وەری گرتبوو. بەبێ ئەوەی دەست بەرداری هیوای پێڕەوی کۆمەڵایەتی بێت، کۆنت بە بیری پێشکەوتنەوە بەسترابووەوە. رێزی دەگرت و سەرسام بوو لە روانگەی ترادیسیۆنەلیستەکان سەبارەت بە کۆمەڵگای ئۆرگانی (عضوی) رابووردوو، بەلام نەیدەزانی کە ئەم روانگەیە توانای ئەوەی نەبوو بە شێوەیەکی گونجاو دان بنێت، بە هاوبەشی هێزە تازە رەخنەییەکان کە لەو کاتەدا دەردەکەوتن.

بۆ ئەوەی شۆڕشی پیشەسازی تێبگات، کۆنت بە گونجاوی زانی لە بیری ئیکۆنۆمیستەکان (Economists) نزیك بێتەوە، وەکو ئادەم سمیث (Adam Smith) و (Jean Baptiste say)و لە بیرەوەرە رامیاریەکانی لیبرالیزمی فەرەنسی کە بیریان نزیك بوو لە ئیکۆنۆمیستەکان، ئەمانە هەموویان شیتەڵی شۆڕشی پیشەسازیان کردبوو و بە شان و باڵیدا دەهاتن.

### 3-3 ترادیسیۆنی لیبرالیزم:

زۆر جار کۆنت رێزی خۆی بەرامبەر بە ئادەم سمیث و زۆربەی ئەوانەی کە لە دوای ئەوەوە هاتبوون دەربڕی بوو. ئادەم سمیثی بە "فەیلەسووفی بەناوبانگ" لە قەڵەم دەداو "شیتەڵ کردنەوە چاکەکەی سەبارەت بە دابەش بوونی کارەوە"[63] خوێندبوووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، لەگەڵ ئەو بیرەی نەبوو کە ئیمانی بە توانای خۆرێکخستنی (Auto Regolantation) بازاڕەوە هەبێت؛ بەرامبەر ئەم بیرەی سمیث و پارتیزانەکانی، پسپۆڕی خۆی هەبوو.

تەماشای پرینسیپی Laissgfaire ی وەکو ئامرازێك بۆ "رێکخستنی ئەنارکی" دەکرد. لە

کاتێکدا ئیکۆنۆمیستە رامیاریەکان تەماشای "نەبوونی پێویستی بۆ دەست تێوەردانی رێکخەریان وەکو دۆگمێکی جیهانی"[64] دەکرد. کۆنت لە لای خۆیەوە ئەوانی بە دوژمنی دیاری کراوی جیهان بینینەکەی خۆی دەزانی.

قەناعەتی کۆنت بەوەی کە دابەش بوونی کار ئەنجامی چاك بەرهەم دێنێ، راستەوخۆ لە سمیثە وە بۆی ماوەتەوە وەکو سمیث بیری دەکردەوە کە فۆرمی پیشەسازی دابەش بوونی کار دەبێتە هۆی هاتنە کایەی فۆرمێکی هاوکاری کۆمەلایەتی زۆر بەکار، کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێ تا بە شێوەیەکی بێ سنوور بەرهەمەکەی زیاد بکات.

بەلای سمیثەوە، میللەتێك وەکو تاقیگەیەکی گەورە وایە کە لە ناویدا هەموو کەسێك بە شێوەی خۆی هاوبەشی دەکات لە گەشەپێدانی دەوڵەمەندی هەمووان دا؛ سەبارەت بەم تێزە کۆنت هیچ جیاوازیەکی بیری دەرنەدەبڕی.[65]

بێگومان شتێکی راست نیە ئەگەر بگوترێ کە کۆنت ئاگادار بوو سەبارەت بە ئەنجامە خراپەکانی دابەش بوونی کارو لایەنە چاکەکانی لە هەمان کاتدا؛ وە ئەمەشی تەنها لە خوێندنەوەی ئیکۆنۆمیستەکانەوە وەرگرتبێ، وەکو سیزمۆندی Sismoudi کە رەخنەیان بوو لە بیروڕای لیبرالی. وە هەروەها بەرامبەر ئادەم سمیثیش کە وەکو سەرچاوەیەکی رێکو پێك تەماشای دەکرد: ئەگەر خوێنەرەکانی دەوڵەمەندی میللەتان خۆیان نەبەستبێتەوە بە خوێندنەوەی دوو یان سێ پەرتووکی ئیشەکەی (وەك زۆربەیان وایان کردبوو) و تا پێنجەم پەرتووکیان خوێندبێتەوە، ئەوا دەیانتوانی زۆر رەخنە بگرن، هەروەکو سیزمۆند، سەبارەت بە بیرەکەی لە دابەش بوونی کاردا:

"لەگەڵ تەشەنە سەندنی دابەش بوونی کار ئیشی زۆربەی ئەوانەی کە دەژین بە ئیش کردن، واتا زۆربەی خەڵکی، تێپەڕ ناکات لە چەند ئۆپێراسیۆنێکی (operation) ئاسان، زۆر جار دوو یان سێ ئۆپێراسیۆن... ئادەمیزادێك کەزۆربەی ژیانی دەباتە سەر بەئەنجامدانی چەند ئۆپێراسیۆنێکی ئاسان و ئەنجامەکانیشیان هەر هەمان شتن، هیچ فرسەتی بەکارهێنانی زیرەکی خۆی بۆ هەڵناکەوێ وە یاخود ناتوانێ خەیاڵی خۆی بخاتە کار.. بێگومان، ئەوەی کە عادەتی ئەو بەکارهانینە ون دەکات، بە شێوەیەکی گشتی دەبێ بە کابرایەکی بێ مێشك و نەزان تا ئەو سنوورەی کە دەتوانێ ببێتە بوونەوەرێك"[66] ئەم ئیعتیبارانە، رەش بینانە سەبارەت بە ئەنجامی دابەش بوونی کار کە وەکو روونە بڵاوبوونەوە و گەشەیان پێ هێنرا لە لایەن ریفۆرمیستە سۆسیالیستەکانی دوایی و چەپرەوە کاتۆلیکیەکانەوە، لە نووسینە سەرەکیەکانی ئیکۆنۆمیستە رامیاری لیبرالیەکان دەرناکەوێ؛ لە بەرئەوە لە کاتێکدا کە کۆنت هەڵوێستی پۆزیتیڤی بەرامبەر دابەش بوونی تازەی پیشەسازی کار دەربڕی، یاخود کە هەڵوێستێکی رەخنەیی وەردەگرت سەبارەت بە ئەنجامەکەی لەسەر رێژەی مرۆڤایەتی، لەگەڵ بیرەکانی سمیث جیاوازی نەبوو.

لایەنێکی دیکە هەیە کە کۆنت بە قەرزاری ئیکۆنۆمیستە لیبراڵیەکان دەردەخات: بە دانانی بەکارێکتەری بنەڕەتی و دروستکەری ئیشی "پیشەسازەکان" یاخود بە واتا تازەکەی هی خاوەن کارگەکان. لەم بارەیەوە، کۆنت دوای جێ پێی قوتابیە فەرەنسیەکەی سمیث ئەکەوت: Jean Baptiste say کە نوسراوەکەی بە ناوی کورتەیەك سەبارەت ئابووری سیاسی بۆ یەکەم

جار له ساڵی **1803** دەرکەوت و بە شێوەیەکی سەرەکی بڵاوکردنەوەی ئەو بیرانە بوو کە لە ئینگلتەرەوە دەهاتن. لە گەڵ ئەوەشدا کاتێك سمیث سەرمایەدارەکانی وەکو کاریگەری سەرەکی بەرهەم دادەنا بە تەنیشت کارکەر و خاوەن زەویەکان، سەی **say** بە لایەنی کەمەوە لەم رووەوە تێپەڕی ئەم بیرەی دەکرد و سەرمایەداری لە خاوەن کارگە جیا دەکردەوە و هێڵی بە ژێر ئیشی تایبەتی خاوەن کارگە دەهێناو رۆڵەکەی روون ئەکردەوە. بە لای ئەوەوە سەرمایەدار ئەو کەسەیە کە بەرهەم و دابەش بوون دەبا بەڕێوەو ئیدارەیان دەکات: خاوەن کارگە لە رێگەی چالاکی پێشەواو بەڕێوەبردن بۆ (سەی **say**) دەبێ بە تەوەری راستەقینەی سیستێمی تازەی پیشەسازی.

ئادەم سمیث باسی لایەنە دروستکەرەکانی کاری کردبوو و (سەی **say**) ئەوەی راست دەکردەوەو دەیوت کە ئەوەی پێویستە وا بە ئاسانی تەنها کار نیە، بەڵکو "پیشەسازیە" واتا یەکێتی دروستکەری کارو سەرمایەیە. (سەی **say**) دەیوت خاوەن کارگە ئەو کەسەیە کە دەست پێشکەری دەکات بۆ دروست کردنی نرخ لە رێگای بەکارهێنانی گونجاوی فاکتەری بەرهەمەوە. تەنها لە کاتێکدا بەرهەمێکی پیشەسازیمان دەبێت کە مادەیەکی خام پرۆسەیەکی گۆڕانی بە سەردا هاتبێت کە لە رێگەی ئیشێکی رێکخراو و راست و خاوەن کارگەوە.[67]

(سەی **say**) تەنها وەسفێکی ساردی رۆڵی تازەو دروستکەری "پیشەسازیەکان" (وەکو ئاوا بانگی ئەکردن) نەدەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە ستایشی ئیشەکانیانی دەکردو بە پاڵەوانی جیهانی پیشەسازی لە قەڵەم دەدات، کە ئەو کاتانە تازە کەوتبوونە بازاڕی ئابووریەوە. تەوژمی بۆ سەر نووسەرانی سەردەمی خۆی زۆر قووڵ بوو، بە تایبەتی بۆ سەر بیرەوەرە رامیاریی لیبراڵیەکانی پاش کەوتنی یەکەم ئیمپراتۆریەت (1814—1830). بەم بۆنەیەوە بێنیامین کۆنستان (Banjamin constant) بۆ نموونە توانی بنووسێ: "موڵکایەتی پیشەسازی، ئامرازێکی چاك کردنەوەی کۆمەڵە لە چوارچێوە گشتیەکەیداو بەم شێوەیە دەتوانرێ دەست نیشانی رەگەزی پۆزیتیڤ بکرێ وەکو رێکخەرێکی رەگەزی مرۆڤایەتی"[68].

لەو کاتەی کە سان سیمۆن و سان سیمۆنیەکان بیری رۆڵی دروستکەری ئیشی خاوەن کارگەیان خستەڕوو و گەشەیان پێدا، دەتوانرێ بوترێ کە لەوانە کۆنت، لە ژێر چاودێری مامۆستای جارانی، لە سەرەتادا نوسراوەکەی (سەی **say**) بە خۆشیەوە خوێندبێتەوەو بە بێ هیچ سەرنجێکی رەخنەیی. ئەگەر وابێ، ئەوا روونە کە ستایش کردنی رۆڵی خاوەن کارگە لەوەی سان سیمۆن دا، لە بیرە لیبرالیەکەی (جان بابتیست سەی) **Jen-Baphiste say** وەرگیراوە. بە دڵنیایی کۆنت لیبراڵی نەبوو، بەڵام لە زۆر لایەنەوە، ئیشەکەی لە ژێر سێبەری ئادەم سمیث و مامۆستا فەرەنسیەکەی خۆیدا ئەدۆزێتەوە.

### 3—4 کاریگەری سان سیمۆن:

دەتوانین لە نووسینەکانی سان سیمۆن چەمکی زانستی پۆزیتیڤی مرۆڤ و پەیژەی ژێرارکی زانستەکان بدۆزینەوە، هەرچەندە لە ناو فۆرمێکی غەیری سیستێماتیك و زۆر جۆر تەنها بە شێوەیەکی سەرەتایی هەن.

زانینی زانستی سروشتی لە سان سیمۆن دا هێشتا سەرەتایی بوو؛ لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ لە نووسینەکانی لەوانەی کۆنت دەکەن و ئەمەش شتێکی سەرسوڕهێنەرەو ئەم بەرهەمانەش لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتدا نووسراون. ئەو کاتانە سان سیمۆن دەیوت: "هەموو زانستەکان لە سەرەتایاندا لەسەر گریمانەت ئەوەستێتەوە، بەلام پلەی بەرزی پێڕەوی شتەکان سەلماندوویەتی کە هەموویان دەبن بە پۆزیتیڤ". سان سیمۆن دەیوت زانستەکان لە سەر ئاستێك پێش دەکەون کە دەجوولێنەوە لە پلەیەکی شێوە ئاسان بۆ پلەیەکی زۆر ئالۆز. کاتی هاتووە زانستێکی مرۆڤ دروست ببێ کە هەمووی پۆزیتیڤ بێت و بە شێوەیەك بێت شۆڕش بخاتە دەستگا ئەورووپیەکانەوە. "ئەخلاق لە داهاتوودا دەبێ بە زانستێکی پۆزیتیڤ و سیاسەت و هەروەها فەلسەفەش؛ سیستێمی ئاینی چاك دەکرێت و دەستگای قەشەکان رێك ئەخرێت و دروست ئەکرێتەوە. بەلام لەبەرئەوەی ئەم دەستگایە کۆیەکی زانستیە، رێکخستنەوەی تەنها واتای رێکخستنەوەی کۆی زانستی دەگەیەنێ"[69]. ئەم بابەتانە زۆرن و دەتوانرێ زۆری تریش بوترێ.

لە نووسینەکانی سان سیمۆن نەك تەنها سەرەتاکانی فەلسەفەی گشتی پۆزیتیڤیزم ئەبینین، بەڵکو زۆر لە بیر تایبەتی کۆنتیش دەبینین.

گرنگیدان بە رۆڵی پیشەسازەکان لە بەڕێوەبردنی ئیدارەی کاتی (temporal) کۆمەك و بایەخ دان بە دامەزراندنی دەسەلاتێکی رۆحی کە تەدریب بە پێشەوایەکی پیاوی زانست و جیاوازی کردن (لە ناو چەرخە مێژووەکاندا) لە نێوان چەرخە ئۆرگانییەکان (عضوی) و رەخنەییەکان و هەروەها هوشیاری سەبارەت بە دانانی بناغەی یەکێتیەکی ئۆرگانی تازە پاش ئەوەی کە ئیشی رەخنەیی رۆشنگەرو شۆڕش تەواو دەبێت و بایەخدان بە پرینسیپی نەخشە کێشان و کاری ئەندازیاری کۆمەلایەتی وەکو گوزارشتێك بۆ رەتکردنەوەو تاوانبارکردنی ئەنارکی (فوضی)و، جەخت کردن لە پێویستی بوونی ژێرارکی و گرنگی رۆڵی دروستکەری دەسەلات. ئەمانەو زۆر شتی تریش چەند بابەتی کۆنتین (conte) کە لە نووسینەکانی سان سیمۆندا ئەدۆزرێنەوە لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان بینینی سان سیمۆن و کۆنت، هەر بۆ ئەوەی تەنها بابەتێك بۆ نموونە بهێنینەوە، دەتوانین بڵێین کە سان سیمۆن ئەریستۆکراسی لە هەموو خەوە یۆتۆپییەکانیدا ئەوەی لە بیر نەچوە کە گرنگیەکی زۆر بە ویستی تاکە کەس بدات کە خۆی خۆی تەواو دەکات.

ئەوانەی کە دوای بیرەکەی کەوتبوون و ئەم هەلوێستەیان گەشە پێدابوو، هێڵیان بە ژێر گرنگی سەربەستی (رزگاری Liberation) جنسی و زیندوو کردنەوەی جنسیان هێنابوو. کۆنت کە کوڕی فەرمانبەرێکی حکومی ساکار بوو بە پێچەوانەوە، وەکو پیاوێکی داهاتوو بێبەش لە هەموو خۆشیەکی جەستەیی و ئەخلاقی و پڕ لە خۆشەویستی (Abnegation) و دەست بەردار بوونی بەرژوەندی خۆی، بە شێوەیەکی تەواو خۆی تەرخان کردبوو بۆ ئەوی دی (Totality)[70].

## 3-5 تێبینیەك لە سەر کۆنت و کێتلێت (Quetelet)

لە کاتی گەشەپێدانی بە چەمکی زانستی سروشتی، کۆنت زاراوەی "فیزیای کۆمەلایەتی"

داهێناو بە شێوەیەکی دیاریکراو لە نووسینەکانی ساڵی **1822** بەکاری هێنا. بە بەرامبەرێنێکی زاراوەیی و نزیکەی بیری کۆنتی دەیوت: "ئێستا ئێمە فیزیایەکی ئاسمانیمان هەیە، فیزیایەکی ئەرزشیو فیزیایەکی میکانیك و کیمیاوی‌و فیزیایەکی روەکی و ئاژەڵی؛ بۆ ئەوەی سیستێمی ناسینی سروشتی تەواو بکەین، پێویستیمان بە فیزیایەکی کۆمەڵایەتی هەیە کە لە دوای هەموویانەوە دێت.

مەبەستم لە فیزیای کۆمەڵایەتی ئەو زانستەیە کە بابەتەکەی تاوتوێی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان دەکات"[(71)].

دوای چەند ساڵێك کۆنت وازی لە دەستەواژەی "فیزیای کۆمەڵایەتی" هێنا بۆ ئەوەی نێولۆژیزمێك بەکار بهێنێ بە ناوی "سۆسیۆلۆژی". وازی لە بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە هێنا ئەوەك لەبەرئەوەی بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵ ئەنالۆژیەك لەگەڵ جیهانی ئۆرگانیدا زیاتر بە پیتە وەك لەگەڵ جیهانی مادی، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەم دەستەواژەیە لە لایەن ئامارناسی بەلجیکی (ئەدۆلف کێتلێتەوە) بەکارهێنرابوو. ئەدۆلف کێتلێت نەیدەزانی کەلە لایەن کۆنتەوە بەکارهێنراوە.

لە ساڵی **1835** پەرتووکێکی دەرکرد بەناوی "سەبارەت بە مرۆڤ و پێشکەوتنی تواناکانی"، "کورتەیەك سەبارەت بە فیزیای کۆمەڵایەتی".

ئیتر لەبەرئەوەی لە سیستێمی کۆمەڵایەتی کێتلێت **Quetelet**، رێژەی ئاسایی دابەش بوونی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان گرنگی "مرۆڤی ئاسایی" دەخستە بەر روو و ئەمەش تێزی کۆنتی بەدرۆدەخستەوە سەبارەت بە ژێرارکی، بەم شێوەیە کۆنت خۆی بە کەم دادەنا ئەگەر سیستێمی خۆی جیانەکردایەتەوە لەوەی کێتلێت، لەبەرئەوە وشەی دووفاقەی سۆسیۆلۆژی بەکارهانی.

پێویستە ئەم رووداوە باس بکرێت، هەر بۆ ئەوەی جارێکی تریش دەربخرێ کە چۆن بیریاری بیریارەکان کاریگەری یەکتریان لە سەرەو، بەرژەوەندیان وا پێویست دەکات کە بیری خۆیان لەوانی تر جیا بکەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە تەنها مەسەلەیەکی زاراوەیی نیە. ئەوەی شایانی باسە لە کاتێکدا کێتلێت چەمکی "فیزیای کۆمەڵایەتی" بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی میتۆدی ئەزموونگەری لێکۆڵینەوە پێشکەش بکات، تا لە رێگای ئەم میتۆدەوە بتوانێ هەڵسوکەوتی مرۆڤ بە هۆی لە یەکچوونێکی ئامارییەوە دەربخات. کۆنت بە میتۆدێکی جیاواز ئەوەی دەرخست: لە رێگای میتۆدی فەلسەفەی هاوشێوەوە (**Aualogy**).

ئەم خاڵانە بەسن بۆ ئەوەی بزانرێ جیاوازی هەردووکیان چەند قووڵە، بە تایبەتی لە بواری ئاقارە فیکریەکانی ئەوسایاندا؛ لە ناو بیری سۆسیۆلۆژیدا کێتلێت و کۆنت دوو جەمسەری یەك پێچەوانەی یەکن، لەبەرئەوە شتێکی باشە کە هەریەکە و زاراوەیەکی جیاوازی بەکارهێناوە.

## 4- دەقی (context) کۆمەڵایەتی

لەو چەرخەی کە کۆنت تێیدا ژیاوە، حەوت رژێمی رامیاری و ژمارەیەکی دیاری نەکراو لە سەرهەڵدان و تەقینەوەو راپەڕین، یەك بە دوای یەکدا هاتن: بۆ پتر لە **50** ساڵ فەرەنسا پشێوی رووی تێکردبوو، کەمجار ئارامی بەخۆیەوە دیوە.

زۆربەی شۆڕشەکان لە ئەنجامی هۆکاری رامیاریەوە روویان نەئەدا، بەڵکو لە ئەنجامی تێکچوونی پێڕەوی ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە بوو؛ ئەوە لە کاتێکدا فەرەنسا بووبوو بە

گۆڕەپانی گۆڕانی خێرا و بەردەوام و هاتنە کایەی شۆڕشی پیشەسازی.

هەرچەندە لەم کاتەدا فەرەنسا سەرچاوەی بێ پێڕەوی و ئاشوب بوو بەڵام لە هەمان کاتدا سەنتەری بێهاوتای ئەوروپا بوو کە هیچ وڵاتێك شانبەشانی نەدەوەستا لە رووی پێشکەوتنی زانستیەوە. لە ماتماتیکدا و لە هەموو زانستە سروشتیەکان دا، لێکۆڵەرەوە فەرەنسیەکان لە پێشەوە بوون؛ نەك تەنها ئەمانە هاوبەشی سەرەکی خۆیان لەوەدا بوو کە لە داهاتوودا کار بکاتە سەر گەشەپێدانی زانستی لە ئەوروپا، بەڵکو داواشیان ئەکرد هەموو ئەو هەوڵە زانستیانە یەکتری بگرن و پەرش و بڵاو نەبن وەکو لە رابووردوو دا هەبوو.

(جۆرج سەبین George sabine" لە کاتێکدا باسی تەشەنەسەندنی باوەڕگەری (docrtine) "مافی خودایی پاشای" ئەکرد کە لە لایەن (بۆدینەوە Bodine) لە فەرەنسای سەدەی شانزەهەمدا نووسرابوو، ئەوەی روون ئەکردەوە چۆن "کۆماری" بۆدین دوای چوار ساڵ لە (قەسابخانەکەی) سان بەرتۆلۆمی نووسراوە لەکاتی ئەوپەڕی شڵەژاوی و زۆران بازی جەنگی ئاینی کە بناغەی بینای کۆمەڵگای فەرەنسی خستبووە لەرزین. (سەبین sabine) وای بیر ئەکردەوە کە (بۆدین Bodine) رۆڵ و دەسەڵاتی پاشای ستایش ئەکرد بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەك کە ئەوسا لەناو شەڕێکی ئەهلی گەوزا بوو بێکۆتایی بگاتە شێوەیەك لە پێڕەو و ئارامی و ئاسایش[72].

لەسەر ئەم ئاستە دەتوانین میولی کۆنت سەبارەت بە پێڕەو تێبگەین؛ لەگەڵ ئەوەشدا کۆنت لە چەرخێکدا دەژیا زانست تیایدا زۆر پێشکەوتنی بەخۆوە بینی بوو، دەیتوانی مەسەلەی پێڕەو و ترادیسیۆنی رۆشنگەری سەبارەت بە پێشکەوتنی زانستی پێکەوە گرێ بدات.

کاتێك کۆنت لە دایك بوو، فەرەنسا لە لایەن ئەنجومەنی پێنج ئەندامەکانەوە حوکم دەکرا، کە پێك هاتبوو لە تیرمیدۆرەکان و ناوەندەکان پاش رووخانی رژێمی تیرۆری (terror) و (تۆقاندنی) رۆبسپێر. لە ماوەی دوو ساڵدا، ناپلیۆن لە رێگەی کودەتاکەیەوە بوو بە قونسوڵ: پێنج ساڵ پاش ئەوەبوو بە ئیمپراتۆری فەرەنسیەکان. پاش بەزینی ناپلیۆن لە ساڵی 1814، برای لویسی شانزەهەم، کە (لە ناو برابوو) لە ژێر ناوی لویسی هەژدەهەمدا گەڕایەوە فەرەنسا. ساڵێك دوای ئەوە، ناپلیۆن رای کردو ئیلبەی بەجێهێشت، ئەو سەردەمە کورتەی دەسەڵات خۆی دەستی پێکرد بە گشی پێی دەوتری "سەد رۆژەکە"؛ لە مانگی شەشەمی 1815 جارێکی کە وازی لە حوکم هانی و دیسانەوە تاجی پاشایەتی لویسی هەژدەهەمی خرایە سەر. دێستۆراسیۆن، ئەو سەردەمەی ئەکەوێتە نێوان حوکمی ئەو و حوکمی براکەی (کارل) وە کە لە پاش ئەو هات هەتا ساڵی 1830 بەردەوام بوو. لەم ساڵەدا شۆڕشی لۆلیۆ لەسەر تەخت هێنایە خوارەوە و لویس فیلیپی (دوقی ئۆرلێیان)ی هێنایە سەر حوکم. شۆڕشەکەی فێبرایەری 1848 کۆماری دووهەمی هێنایە کایەوە. ئەم کۆمارە زۆر کەمی خایاند: لە دیسەمبەری 1851، لویس ناپلیۆن، کە لە ساڵی 1848 وە سەرۆك کۆماری فەرەنسا بوو، لە رێگای کودەتایەکەوە دەسەڵاتی دکتاتۆری وەرگرت. لە ساڵی 1852 ئیمپراتۆریەت دامەزرا و ناپلیۆنی سێ کرا بە ئیمپراتۆر. ئەم سەردەمەی گوشاری سیاسی و راپەڕینی میللی هاوکاتی شۆڕشی پیشەسازی بوو. بە رێکەوت تەنها لە فەرەنساو لە ساڵەکانی پاش کەوتنی ناپلیۆندا بەرپا بوو.

لە ساڵی 1816 تا 1819 پیشەسازی لۆکەی فەرەنسی سێ قات زیادی کرد: لە ساڵی 1817 لە شاری لیۆن 7000 حەوت هەزار کارگەی حەریری هەبوو، لە ساڵی 1832 بوون بە 42000 هەزار. لە نێوان 1818 و 1828 بەرهەمی ئاسن دوو قات زیادی کرد(73). لە ساڵی 1832 تەنها 525 مەکینەی هەڵم هەبوو لە هەموو فەرەنسادا (لە 1818 زیاتر لە 200 دانە نەبوون) بەڵام لە 1841 ژمارەیان گەیشتبووە 15000 هەزار مەکینەی لەم جۆرە[74].

لە بەشی یەکەمی سەردەمی نۆزدەهەم چینی تازەی کرێکاری فەرەنسی وردە وردە و بە زەحمەت سەری دەردەخست؛ ئەم چینە تارادەیەکی زۆر درێژ بووەوەی پلە جیاوازەکانی پیشەوەریەکان و ئیشکەرە دەستیەکان بوو.

زۆربەی کرێکاران هێشتا لە کارگەی بچووك ئیشیان ئەکرد، بەڵام لە ناوەڕاستی ساڵانی چل ئەو کرێکارانەی کە لە کارگە پیشەسازیەکانی زیاتر لە (دە) کرێکار ئیشیان ئەکرد، ژمارەیان گەیشتبووە یەك ملیۆن[75].

مووچەیان جیاواز بوو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و لە ئیشێکەوە بۆ ئیشێکی تر دەگۆڕا، وەکو جۆری ئیش لە ناو شار یاخود ئیشی کرێکارێکی پیشەسازی، یاخود کرێکارێکی کشتوکاڵ یا بە شێوەیەکی گشتی مووچە زۆر کەم بوو، بە تایبەتی بۆ کرێکاری ناو لادێکان بارودۆخەکە زۆر دژوار بوو. لە کاتێکدا پیشەوەرەکان کە لە ناو شار ئیشیان ئەکرد پێك هاتبوون لە ئەریستۆکراسیەکی ئیش، کرێکاری کارگەکان لە هەژاریەکی زۆر قووڵدا دەژیان. بارودۆخی ئیش و تەندروستی لەناو کارگە تازەکاندا ترسێنەر بوون: بە درێژایی ڕۆژانی ئیش کەلە کاتی خۆیدا، لە دوکانە خێزانیەکاندا قبووڵ دەکرا، لە کارگە پیشەسازیەکان لە بەرگری قەوارەی مرۆڤ چوو بووە دەرەوە. لە ساڵی 1820 بەولاوە مووچە بە شێوەیەکی ئێجگار زۆر کەم بوو بووەوە.

لە ساڵی 1830 ئاوریشم چنەکان لە شاری لیۆن مووچەیان لە یەك لەسەر سێی 3\1 ئەوەی ساڵی 1810 تێپەڕی نەدەکرد. ئیکۆنۆمیستەکان ئەوەیان دەبینی لە ساڵانی ریستۆراسیۆن (Restauration) ڕێژەی مووچەی ساڵانەی کرێکارێك لە چوار سەد بۆ پێنج سەد فرانك دەگۆڕاو مووچەی پێویستی خێزانێکی سێ نەفەری پێك هاتبوو لە 900 فرانك. کەواتە خێزانێك تەنها کاتێك لە دۆخی هەژاری رزگاری دەبوو ئەگەر ژن و منداڵیش ئیشیان بکردایە. ژمارەی پیاو و ژن لە بارودۆخی هەژاریەکی وەهادا بوو کە دەبوایە یارمەتیان بدرایە. ئەم ڕێژەیە زۆر زیادی کرد بە تایبەتی لەو شوێنانەی کە بەرهەمی پیشەسازی بە شێوەیەکی بەردەوام دەستی کردبوو بە زیادبوون.

لە ساڵی 1828 لە 224 هەزار کرێکاری هەرێمی ژوورو دەبوایە 163 هەزاریان لە لایەن ئۆرگانە خزمەتگوزاریەکانەوە یارمەتی بدرانایە[76]. هەروەها بارودۆخی پیشەوەرە کۆنەکانیش ترسناك بوو: ئۆرگانە خزمەت گوزاریەکان دەبوایە بە شێوەیەکی گشتی یارمەتی 700000 هەزاریان بدایە، لە ساڵی 1833 و چواردە ساڵ دوای ئەوە ئەم ژمارەیە دوو قات زیادی کرد[77].

لە نێوان 1830 و 1848 هێشتا کرێکارە تازەکانی پیشەسازی نەگەیشتبوونە ئەوەی کە ببن بە پێشەوای بزوتنەوە شۆڕشگێڕەکان، لەبەر ئەم هۆیە چینی کرێکار بە شێوەیەکی سەرەکی لە قەوارەی پیشەوەرە سەربەخۆکان و کرێکاری

ڕۆژانەو خەڵکی نا پسپۆڕدا مابووەوە. شێوەی دەربڕینی نارەزایی کرێکاری کارگەکان لە ڕاپەڕینی لە پڕ دابەش کردنی مەکینەکان و هەندێ کاری لەم بابەتانە خۆی دەبینییەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، کە کاتی خۆی دەهات، ئەوان دەبوون بە پێشەوای بزووتنەوە رامیاریەکان کە رێکخستنیان بەهێز تر بوو لە پایتەخت و سەنتەرە پیشەسازیە گرنگەکانی وەکو شاری لیۆن[78].

بۆربۆنەکان لە ئەنجامی قەیرانێکی رامیاری و نارەزایی میللی سەبارەت بە نزم بوونەوەی پلەی ئابووری کەوتن "میللەت یاخود "کرێکارە هەژارەکان" کە (بەریکاریان (متراسیان) Barricade) دروست کردبوو، تەنها لە پیشەوەرە سەربەخۆکان یاخود لە کرێکاری ڕۆژانە (وەکو جاران) پێك نەهاتبوون، بەڵکو لە کرێکاری کارگەش[79] کە لە ساڵی **1848** ڕۆڵی زیاتریان لە خەباتدا هەبوو.

فەرەنسا پاش شۆڕش کۆمەڵگایەکی بۆرجوازی بوو کە زۆربەی پێکهاتبوو لە "دەوڵەمەندی تازە"؛ بە شێوەیەکی گشتی ئەمانە چەند کەسێك بوون بەتەنها خۆیان دروست کردبوو و پێکهاتبوون لە چینە (هەژارەکان) و لە دەوڵەمەندبوونیان قەرزاری دەوروپشت و کولتووری خێزان نەبوون: نوقسانی خوو ڕەوشت بەرزی و ئوسوڵی (اصول) ژیانیان هەموو جارێك بە ئێنێرژیەکی بێهاوتاو باوەڕکردن بە خۆ پڕنەکردەوە.

بە شێوەیەکی گشتی، بە خەڵکێکی بێ ئەتەکێت و ئێسك گران دادەنران بەرادەیەك کە بەلزاك **Balsac** لە "کۆمیدی مرۆڤ" دا بە شێوەیەك وەسفی کردوون کە دژواری خۆی بەرامبەریان دەردەخات.

بە پێچەوانەی چینە سەردەستەکانەوە کە ژیانێکی بێتامیان ئەبردە سەر، ئەم خەڵکە تازە دەوڵەمەندبووانە زۆر ئیشیان ئەکرد بۆ ئەوەی شوێنی خۆیان بکەنەوە، بەم شێوەیە بوو بوونە خاوەنە بەغیرەتەکانی کارگەی سەردەمی تازە؛ بانکیان بەڕێوە ئەبرد و هێڵی شەمەندەفەر و کارگەی تازەیان دروست ئەکرد. زۆریان، بە تایبەتی هەندێ لە خاوەن بانکەکان هۆی کەیان هەبوو کە پاڵی پێوە دەنان بۆ ئیشکردن. لەبەرئەوەی بنەچەیان پرۆتستانت یاخود جوو (یەهودی) بوو، زۆر ئیشیان ئەکرد و بە شێوەیەکی تایبەتی ماندوو دەبوون بۆ ئەوەی بە کۆکردنەوەی دارو شت و مەك پۆزیسیۆنی کەمایەتی خۆیان پڕ بکەنەوە.

بە شێوەیەکی گشتی ئەمانە، هەندێك لەو لایەنە گرنگانەی سەردەمەکەی کۆنت بوون، و ئەو کاتانەش بوو کە بە هاتنی لە شارۆچکەوە بۆ پاریس خۆی لە خوێندگای پۆلیتێکنیك ناونووس کرد و بوو بە بیرمەندێك لە پاریسدا.

### 4-1 ئەوەی کۆنت "مەینەتی سەدە"

کۆنت کە لە سەردەمی ڕێستوراسیۆندا پێگەیشت، هەندێ ئەهامەتی مادی و ڕۆحی بینی. ئەو فرسەتەی کە بۆ ئیش لوابوو لە سەردەمی شۆڕش و ناپلیۆندا زۆر کەم بوو بوو، چونکە زۆر پۆستی رامیاری و ئیداری لە لایەن خەڵکی گەنجەوە داگیر کرابوون. لەو کاتانەدا زۆر بواری ئیش نەبوو، چونکە بەرز بوونەوەی ئەو گەنجانەی کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتدا دانرابوون نەیدەهێشت نە پۆستی تازە بەتاڵ بێت، نە ئەو کەسانە بەرزببنەوە کە لە دواییدا ئەو پۆستانەیان داگیر ئەکرد. زیاتر لەوەش، ئەو کۆچکەرانە **emigres** کە لە هەندەران

لیستەی ئەو زانا بەناوبانگانەی لەم خوێندنگایەدا وانەیان وتوەتەوە سەرسورهێنەرە: لە نێوان یەکەمین مامۆستایانی زانستی ماتماتیك و فیزیا ئەمانە بوون: Fourier ،Monge ،Lagrange، Bertholet ؛Poinsot کیمیای دەوتەوە. ئەوەی دووهەم کە لە بەشی دووەمی حوکمی ناپلیۆن وانەی دەوتەوە پێك هاتبوون لە Possion؛ Fresnel ،Arago ،Gay –Lussac ،Ampere، cauchy.

هەرچەندە خوێندنگاکە پڕ بوو لە زانای زانستی بەناوبانگ، بەڵام بە شێوەیەکی سەرەکی خۆی خوێندنگای زانستی پراکتیکی بوو؛ وانەکان پێك هاتبوون لە ژۆمێتری وەسفی و هونەری ئاراستەکەر (نەخشەیی) و بە جیاوازی لەگەڵ خوێندنگای نۆرماڵ کە لە هەمان کاتدا دامەزرابووە و خوێندکارەکانی دەردەچوون وەکو ئەندازیاری مەدەنی یان سەربازی نەوەك زانای تیۆری[82].

ئەگەر راست بێت کە زۆربەی خوێندکارەکان دەبوون بە خەبیری ئەندازیاری و ماتماتیکی پراکتیکی، ئەوەش راستەکە کەمایەتیەکی زۆر کەم قبوولی هیوای ئیشێکی نۆرماڵیان دەکرد، باوەڕێکی تازەو پێڕەوێکی تازەیان کۆدەکردەوە لەگەڵ رۆحێکی پۆزێتیڤیست و زانستی بۆ ئەوەی ببن بە چاکساز لە سەر بناغەی زانستی:ئەمەیان خوێندبوو لە خوێندنگا.

جگە لە ئۆگست کۆنت، چەند خوێندکارێکی تری لێ بوو، وەکو Prosper Eufautin قەشەی داهاتووی کەنیسەی سان سیمۆنی و Victor cousideraut نوێنەری داهاتووی باوەڕگەی (doctrine) فودیمێ (Fowrier) و play Frederice Le کۆمەڵناس و چاکسازی کاتۆلیکی و سەدەها لەوانەی کە لە دوای باوەڕگەکەی سان سیمۆن کەوتبوون و زۆر لە قوتابیانی کۆنت[83].

لە کاتێکدا کۆنت چووە خوێندنگای پۆلیتێکنیك، زوو گرووپێکی گەنجی ئەم خوێندنگایەی دۆزیەوەو لە گەڵیاندا توانی بیرو را بگۆڕێتەوە. گومێ Goulier کە تاوتوێی ژیانی هەندێ لە برادەرانی کۆنتی کردبوو، دەریدەخا کە ژمارەیەکی زۆر خوێندکار هەبوو (وەکو سان سیمۆنیەکان و ئەوانەی دوای تیۆرەکانی کەوتبوون) خەریکی ئیش بوون لەسەر ئاستی چاککردنی (اصلاح) کۆمەڵایەتی. بەم شێوەیە لە کاتێکدا کۆنت گەیشتە پاریس گرووپێکی گەنجی ناسی کە لە هەموو لایەکی فەرەنساوە هاتبوون (وەکو ئەو) زۆر بە تەقەلاو جۆشێکی زانستیەوە وەکو چاکسازێك ئیشیان دەکرد. وتەبێژێکی زیرەك بەناوی ئەلبێرت تیبۆدێ Albert thi baudet توانی تێبینی بکات کە چۆن ئەم گەنجانە وایان دەزانی لە توانایاندایە "ئاینێك دامەزرێنن بە هەمان شێوە کە لە خوێندنگا فێری دروست کردنی پردێك دەبوون"[84] هەرچەندە ئەم دارشتنە شێوەیەکی گاڵتەجاڕێ (Csarcastic) پیشان دەدات، بەڵام شتێکی زۆر گرنگ روون دەکاتەوە؛ واتا ئەم پیاوانە ئەندازیاری کۆمەڵایەتیان (تەنانەت ئەندازیاری ئەم ئاینە تازەیەیان) وا لە قەڵەم دەدا کە زۆر جیاواز بێت لە شێوەی ئیشکردنی لە ئاستی ئەندازیاری مەدەنی دا؛ بۆ دروستکردنی ستروکتۆری تازەی فیزیایی یان کۆمەڵایەتی، تەنها ئەوەندەی ئەویش کە پراکتیکی یاساکانی زانست بکرێن.

لە نێوان ئەو مامۆستا بەناوبانگانەی کە لەم خوێندنگایە وانەیان دەوتەوە، زۆربەیان بایەخێکی چاکیان دا بە زانستەکە و هەندێکیان خۆیان تەرخان کرد بۆ تەعمیم کردن (geueruliyetion) و هەوڵیان دا کە ئەو

بۆشاییه پڕ بکەنەوە لە نێوان زانستە سروشتیەکان و زانستە کۆمەڵایەتیەکان، لە سەدەی نۆزدەهەم دا خۆیان بە بەردەوام پێوەری ئەو ئارەزووە کورت کەرە دادەنا کە ئێنسیکلۆپیدیای دیدرۆ و (Diderot) و دلەمبێر (d'Alevbert) باسی کردبوو. لە زانستی فەرەنسی بە شێوەیەکی گشتی و بە تایبەتی لە نێوان زاناکان شێوە هەستێك بڵاو بووبوەوە کە ئەمەی دەردەبڕی: کاتی ئەوە هاتووە کە زۆر لە بەشەکانی زانست بخرێتە سەر بەشەکانی لێکۆڵینەوە (کە تا ئێستا جیا بوون) و سیستمێکی زانستی یەکگرتوو دابنرێت کە زانستە سروشتیەکان و زانستە کۆمەڵایەتیەکان پێکەوە ببەستێت. سێبەستیان شارلێتی sebastian charlety دەڵێت: "زاناکانیئەم نەوەیە ئیشێکی گەورەیان کردووە یاخود ئامادەیی ئیشێکی گەورە ئەکەن کە جیهان بینینێك پیشان دەدات نزیك بەوانەی تیۆریە کۆمەڵایەتی و رامیارەکانە"(85).

زاناکانی ئەو سەردەمە هەوڵیان دا بوونی پەیوەندیەك دەربخەن لە نێوان ئەو دیاردانەی کە تا ئەوسا بە جیا تەماشا دەکران و باسی یەکیەتی سەرەکی نێوان هەموو هێزە سروشتیەکانیان ئەکرد. زیاد لەوەش هەندێکیان، بە تایبەتی ئەوانەی کە خەریکی خوێندنی یاساکان بوون ئیحتیمالاتیان (Probaility) ئەکرد، بگەنە گریمان کردنی hypothesize لە یەك کردنی سەرەکی یاساکانی سروشت و ئەوانەی کە حوکمی ژیانی ئادەمیزاد دەکەن.

هیچ مایەی سەرسوڕمان نیە کە گەنجە پۆلیتێکنیکیەکان، مامۆستای خۆیانیان دادەنا بەو کەسانەی کە لە رێگەی ئیش و وانە وتنەوە، مۆدێلی جیهان بینینێکی کۆکەرو کورت کەریان پێشکەش ئەکرد.

وە هەروەها مایەی سەرسوڕمانیش نیە کە لێکۆڵینەوەیان لە مەڕ نووسەرە مۆدێرنەکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکانەوە کردبێ، وەکو Jean Baphista say، بە هیوای ئەوەی کە لەوانەوە فێری چوونی یاسا کۆمەڵایەتیەکان بن(86).

خوێندکارەکانی پۆلیتێکنیك کە ئازاریان هەبوو بە هۆی "نەهامەتی سەدە" وە، هەوڵیان دەدا بە هەر شێوەیەك بێت لە جیاتی ئیمانی ئاینی ون بوو شتێکی کە دابنێن: ئیمانێك کە بناغەکەی دەسەڵاتی زانست بێت؛ لە هەمان کاتدا ویستیان باوەش بە چەندین باوەڕگەی چاکسازیدا بکەن کە هەرچۆنێك بێت، پێك هاتبوو لە هەموو مەفاهیمەکانی زانیاری کۆمەڵایەتی. فردریك هایێك Frederic Hayek بەم شێوەیەی خوارەوە ئەمە روون دەکاتەوە.

"لەوێ جۆرێکی پوختی ئەندازیار دروست کرابوو؛ شێوەی بینین و بەرزی خوازی (ambition) و گێردانی (Limitation) تایبەتەکانی بوون.

ئەو رۆحە کورت کەرەی کە نەیدەتوانی واتایەك بدۆزێتەوە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە ئەنجامی پیلانێکی ویستراو بوون و ئەو خۆشەویستیەی بۆ رێکخستن کە لە دوو سەرچاوەی پراکتیکی سەربازی و [پراکتیکی ئەندازیاری هەڵ دەقوڵا و ئەو بە باش زانینە جوانیە کە بۆ ئەو شتەی بە شێوەیەکی ئاگایی conscious دروست کرابوو، بە بەراوردی کردن لە گەڵ ئەو شتەی کە بە "شێوەیەکی ساکاری تەشەنە دەسێنێ"؛ هەموو ئەمانە وەکو هێزێکی دەروونی تازە دەهاتنە پێشەوە و دەخرانە سەر جۆشی شۆڕشگێڕانەی گەنجە پۆلیتێکنیکیەکان و لەگەڵ رۆیشتنی کاتیشدا ئەم هێزە دەروونیە جێی ئەوانیشی دەگرتەوە"(87)].

[هەروەها، كۆنت لە روانگە تایبەتیەكانی چالاكیەكانی دەمێنێتەوە وەكو نوێنەرێكی تایبەتی ئەوەی خوێندنگای پۆلیتێكنیك]. ئەم خوێندنگایە ئاو و هەوایەكی بیری بۆ ساز كردو توانی لە ناویدا گەشە بدات بە تێڕوانینی تایبەتی خۆی، لە رێگای پەیوەندیەكانی لەگەڵ برادەرەكانی هەمان بیرو باوەڕیان هەبوو، لەگەڵ ئەوانەی كە پلەیان لەو بەرزتر بوو.

هەرچەندە هەمان خۆشەویستی گەنجەكانیان نەبوو، بەڵام پاڵیان پێوە دەنان بۆ ئەوەی پێش بكەون. لە نێوان ئەو كەسانەی (بە ژمارە كەم بوون) كۆنت توانی پەیوەندی خۆی لە گەڵیاندا پەرە پێبدات و لەو تەمەنەی مابووی لە ژیانیدا، ئەوانە بووبوونە خوێندكار و هەندێكیشیان لە مامۆستایانی بوون.

لە كاتێكدا بۆ یەكەم جار هەوڵیدا كە جەماوەرێكی كراوە بدۆزێتەوە بۆ بیرە تازەكانی، یەكەم ئیشی كە بە ناوی "سیستێمی رامیاری پۆزیتیڤ بوو، نارد بۆ كۆنە برادەرە خوێندكارەكانی پۆلیتێكنیك و مامۆستایانی وەكوGay-Lussacو Hachettxe و Ampere و Poisson"[88]. هەرچەندە خوێندنەكەی تەواو نەكرد، بەڵام بە درێژترین بەشی ژیانی، ئیمزای نامەكانی بەم شێوەیە دەكرد "ئۆگست كۆنت، كۆنە خوێندكاری خوێندنگای پۆلیتێكنیك"

## 4-3 كۆنت بە بێ هەڤاڵی خوێندنگا:

لەو ساڵە كورتانەی كە لە خوێندنگای پۆلیتێكنیك بردیە سەر، كۆنت ئەو شانسەی هەبوو توانی دوای چەند مۆدیلێك بكەوێ كە پێكهاتبوو لە هەڤاڵانی كە لە گەڵیا هەمان بەهاو هەمان خەویان هەبوو، لەو كەسانەی كە ئامادە بوون بۆ گوێ گرتن لە بیرو بۆچوونەكانی، بەڵام لەو ساڵانەی پاش خوێندن ژیانێكی دراماتیكی بردە سەر چونكە نەیدەتوانی هەمان پەیوەندی و هەمان پاڵپشتی بیری هەبێ.

زۆربەی زۆری نامەكانی ئەوە دەگەیەنن كە لە كاتی قۆناغی یەكەمی هاوكاریی كردنی لەگەڵ سان سیمۆن دا زۆر بەختەوەر بووە، بەوەی كە پەیوەندیەكی بیری بەهێزی پەیدا كردبوو لەگەڵ مامۆستا پێگەیشتووەكەیدا؛ لەگەڵ ئەمەشدا ئەو سەردەمەی كە كۆنت سان سیمۆنی دانا بە مامۆستای خۆی كورت بوو: مشتومڕی شاراوە لەسەر ئەوەی كامیان پێشینەی فكریان هەیە، پەیوەندیەكانیانی سارد كردەوەو ئەمەش بووە هۆی بڕینی پەیوەندی بەیەكجاری. [لەوەی ئەكرد مەحاڵ بێت پەیوەندیەكی راستەقینە دروست بێت لە نێوان ئەو كەسانەی كە لە دوو نەوەی جیاواز بن و هەردووكیشیان دوو پێكهاتەی كۆمەڵایەتی و، بیری زۆر جیاوازی هەبووبێت].

لە رێگای سان سیمۆنەوە، كۆنت چەند رۆژنامە نووس و نووسەری پێشكەوتووخواز و لیبرالی ناسی، بێگومان كەلكی لە گۆڕینەوەی بیرو باوەڕ لە گەڵیاندا وەرگرت، لەگەڵ ئەوەشدا كاتێك پەیوەندی لەگەڵ مامۆستاكەی خۆیدا بڕی، زۆربەی پەیوەندیەكان نەمان لەوە بەولاوە، كۆنت زۆر بەگرانی توانی ئەو برادەرانە بدۆزێتەوە كە لەگەڵیاندا بتوانێ بیروباوەڕی بەراورد بكات لەسەر ئاستێكی یەكسان.

هەندێكیان وەكو كۆمەڵناس بلێنڤل BLANVILLE، بۆ زیاتر لە چارەكە سەدەیەك لە گەڵیدا بوون، بەڵام ئەم برادەرەش لە كۆتاییدا بچڕا. هەر لە سەرەتای چالاكیە فیكریەكانیەوە، كۆنت هەنێ خوێندكاری راكێشا بۆ لای خۆی، بەڵام زۆربەیان تا ماوەیەكی كەم لە گەڵی بوون، وەكو: گۆستاڤ ئێیشتالی (Gustave d'Eichthal) لاو.

هەرچەندە لە ساڵانی بیست و بۆ ماوەیەکی کەم پێی سەرسام بوو، بەڵام دوای ئەوە بە جێی هێشت و شوێن سان سیمۆنیەکان کەوت، زیاتر لەوەش زۆربەیان لە هەمان ڕێژەی بیری ئەو نەبوون.

کۆنت برادەری نەبوو تەنانەت لە جیهانی ئەکادیمیشدا؛ وەکو دوایی باسی دەکەین هەرگیز نەگەیشتە پۆزیسیۆنێکی ئەکادیمی بەردەوام کە ڕێی پێبدات کەڵك لە بە دەستگاکردنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ هەڤاڵانی وەرگرێت. (ئەمە زۆر باو بوو لە نێوان پرۆفیسۆری زانکۆکاندا). کۆنت هەتا دوا ساتەکانی ژیانی بێ بەش بوو لە گۆڕینەوەی ڕەخنەو هەڵسەنگاندن کە بە ئامرازێکی بنەڕەتی و پراکتیکی نێوان لێکۆڵەرەوان دەژمێردرێن.

بە دڵنیاییەوە کۆنت بە تەواوی لە دەرەوەی جیهانی ئەکادیمی نەدەژیا وەکو داروین (Darwin) و نیتچە (Nietzsche) کە زۆربەی ژیانیان لە دەرەوەی ئەم جیهانە (واتە جیهانی ئەکادیمی) دەبردە سەر؛ لەگەڵ ئەوەشدا لە کەناری جیهانی ئەکادیمیا دەژیاو ئیشەکەی زۆر حسابی بۆ نەدەکرا. هەرچەندە بە شێوەیەکی بەردەوام پەیوەندی لەگەڵ پرۆفیسۆرەکانیدا هەبوو، بەڵام زۆر لەوان بە کەمتر تەماشا دەکرا: خوێندکارەکانی تاقی ئەکردەوە بۆ ئەوەی بزانێ چەند لەوانی کە فێربوون، یاخود وەکو دووبارەکەر ، وانەی مامۆستاکانی دووبارە دەکردەوە. بە بەردەوامی ئەخرایە پۆزیسیۆنێکی نزمەوە، لە کاتێکدا کە هەوڵی دەدا ببێ بە پرۆفیسۆری زانکۆ لەبەرئەوە ناچار بوو بەشی زۆری ژیانی بە کەساسی بەرێتە سەر و ئیشی مارجینال (Marginal) بکات و ببێ بە یاریدەدەری ئەوانەی کە زۆر زوو هەستی کرد لەسەر ئاستی زانستی لەونزمتر بوون.

چەندین ساڵ تا کۆتایی ژیانی، کۆنت پرۆسەیەکی بە کۆمەڵایەتی کردنی زووی تەواو کرد: هەڵوێستی خۆی پیشان دەداو گوزارشتی لە بەهاکانی خۆی ئەکرد. لە کۆتاییدا بۆی دەرکەوت بۆ هەمیشە ناتوانێ لەسەر ئاستی دەستگایی ڕۆڵی خۆی ببینێ، بڕیاریدا ڕۆڵێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە: ڕۆڵی پێغەمبەر. بەڵام پێغەمبەرەکان کەسانێکی تەنیان و دەبێ خەڵکیان هەبێ کە دوایان بکەون و پەیوەندیەکی زۆریان لەگەڵ ئەوانەدا نیە کە لە ئاستیا نین.

لەو ساڵانەی دوایدا، کۆنت، هەرچەندە قوتابیەکانی دەوریان دابوو و زۆر خۆشیان دەویست، بەڵام بە بێ برادەر مایەوە. جار جار برادەری لە هەمان ئاست پەیدا ئەکرد: لە هەموویان گرنگتر ئەو پەیوەندیە بوو کە لەگەڵ جان ستیوارت میل Jean stuart Mill بەستی کە لە گەڵیدا بۆ چەند ساڵێکی زۆر نامە گۆڕینەوەیەکی زۆر لە نێوانیاندا هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا، دەتوانرێ بوترێ کە ئەم پەیوەندیە ماوەکەی کورت تر دەبوو ئەگەر (میل Mill) لە نزیکی کۆنت بژیایە نەوەك لە ئینگلترا.

وردە وردە پاش ئەوەی کۆنت پەیوەندیەکانی لەگەڵ هاوکارەکانی پچڕا و لە لایەن پیاوانی بەناوبانگی زانستەوە ڕەخنەی لێگیرا. کۆنت زۆر جار خۆی لە شانۆی بیری سەردەمەکەی دەکشانەوە.

[بە مەحروم بوونی لە ڕەخنەی هەڤاڵەکانی، وردە وردە دەهاتە سەر ئەوەی ڕازی بێت لە ڕەزامەندی کۆیلەیی خوێندکارەکانی: سروشتی سەیری زۆر لە بیرو باوەڕەکانی ئەم دواییەی تاڕادەیەك، ئەنجامی ئەم خۆکێشانەوەیە بوو لە هەڤاڵەکانی: ئەمەش تا ڕادەیەك ویستی خۆی بوو].

**4-4 گەڕان بە دوای جەماوەردا:**

لە سەردەمی هاوکاری سان سیمۆندا، کۆنت دەستی کردبوو بە پەیداکردنی جەماوەرێك لە نێوان نووسەر و رۆژنامەنووسە لیبرالیەکان و نوێنەرە گرنگەکانی جیهانی کار و رامیاری. نووسراوی گرنگی بڵاودەکردەوە، لە پێشدا بە ناوی سان سیمۆن و دوایی بە ناوی خۆیەوە. سەرنجی خوێنەرە لیبرالە گرنگەکانی گۆڤارەکانی راکێشابوو؛ زیاتر لەوەش پیاوانی زانست کە ناسیبوویان لە خوێندنگاکە و کەسانی تریش کە لەوەودوا بینیبوویان زۆر بە وریاییەوە گوێیان لێ رادەگرت. کە لە ساڵی 1824 یەکەم نووسراوی سیستمەکەی (systeme) بڵاوکردەوە، کۆڤیێ Cuvier بە ناوی ئەکادیمی زانستەکانەوە نامەیەکی پیاهەڵدانی بۆ نووسی؛ زانا فەرەنسیەکانی وەکو Poinsot و بلێنڤیل Blainvill و بڕۆلی Broglie و Flourens چەپڵەیان بۆ ئیشەکەی لێدا، زانای ئەڵمانی ئەلێکساندر بۆن هومبۆلد Alezander Von Hambolt بە جۆش و خرۆشەوە وەڵامی دایەوە.

پاش شکاندنی پەیوەندی لەگەڵ سان سیمۆن، گوێ گرەکانیی وردە وردە کەم بوونەوە، چونکە لە لایەکەوە کۆنت توانایەکی رووخێنەری هەبوو کە دۆست و دوژمنی بێزار ئەکرد و لە لایەکی تریشەوە ململانێکەی لەگەڵ سان سیمۆنیەکان بە شێوەیەك بوو لە گرنگی ئەرکەکەی کەم دەکردەوە، جگە لەو هاوکاریە کورتەی لەگەڵ بڵاوکراوە تازەکەی سان سیمۆنیەکان "بەرهەم هێنەر"، کۆنت بە شێوەیەکی بەردەوام هیچ هاوکاری رۆژنامەیی نەدۆزیەوەو هیچ گوێ گرێکی ئەکادیمی نەبوو، چونکە هەر چ ئیشێکی بکردایە لە خوێندنگاکە یاخود لە رێگای وانەی تایبەتی یاخود لە رێگای ئیشە نزم و مۆنۆتۆنیەکەی خوێندنگای پۆلیتێکنیك، نەیدەتوانی بە بەراوردی بیر و باوەڕەکەی بکات: هەمیشە بیروباوەڕی لێکۆڵەرەوەکانی تریشیان کۆ نەکردەوە، ئەمە شتێك بوو کە کۆنت هەمیشە رقی لێی بوو، زیاد لە هەر شتێکی دی.

بە دوورکەوتنەوەی لە دەقی دەستگایی، بڕیاریدا کۆرسێك لە وانەی گشتی بکاتەوە بۆ ئەو گوێ گرانەی پێك هاتبوون لە پیاوانی بەناوبانگ. لە نێو ئەو گوێ گرانەش گوێ گرێکی گرنگی دۆزیەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، زوو نەخۆش کەوت، لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت چەند ساڵێك بوو کە دوور بوو لەم جیهانەو خۆی بە کەم دەزانی. یان دەکرێت بڵێین ئەو هەوڵەی پێویست بوو سەرفی بکات بۆ ئەو ئیشە، بەشداری کرد لە رووخاندنی، بێگومان دوای ماوەیەك لە وانە وتنەوە.

پاش ئەوەی کە چاك بووەوە و دەستی کردەوە بە وانە وتنەوە دیسانەوە، لە نێوان خوێندکارەکانی چەند پیاوێکی بەناوبانگ دەهاتن بۆ کۆرسەکەی، لە نێوانیاندا چوار ئەندامی ئەکادیمی زانست. "یەکەم وانەی" زوو لە لە گۆڤاری ئێنسیکلۆپێدی بڵاوکرایەوە و بەمەش دواییەکانی کۆرسەکەی وەکو نامیلکەی بچووك دەرکەوتن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سەرکەوتنانە زۆر دەوامیان نەکرد. یەکەم ڤۆلومی Volume کۆرسەکەی لە لولێوی 1830 بڵاوکرایەوە (ئەو کاتە بوو کە شۆڕش دەستی پێکردبوو) سەرنجی زۆر کەسی رانەکێشا. هەر زوو پاش ئەوە چاپەمەنیەکە ئیفلاسی کرد. بێگومان ئەم بێ شانسیە پەیوەندی بە بارودۆخەکەوە هەبوو، بەڵام پاش ماوەیەکی زۆر کەم بۆ کۆنت دەرکەوت کە بە شێوەیەکی تەواو جەماوەری ئەو بیر و

باوەڕەی ون کردبوو کە لە پێشدا سەرنجی ڕاکێشابوو. وردە وردە کە بەشەکانی تری کۆرسەکەی بڵاودەکرانەوە، زۆربەی ئەو پیاوە زانستیانەی کۆنت حسابی بۆ کردبوون دژی وەستانەوە. کە شەش ڤۆلۆمەکەی کۆرسەکەی بڵاوکرانەوە لە ناو سەرجەم چاپەمەنیەکانی فەرەنسادا هیچ شوێنێك بۆی کۆنەکردەوە لە ناو ڤولومێکی گەورەدا.

لە ناوەڕاستی ساڵانی حەفتا، ئێمیل لیتری **Emile Littre**، کە خوێندکارێکی تازە بوو لە ناو گۆڤاری **Le National** شەش وتاری گرنگی کۆنتی بڵاوکردەوە و بەم شێوەیە توانی سەرنجی خەڵکی بۆ فەلسەفەی پۆزیتیڤ ڕابکێشێ.

وردە وردە خوێندکاری تر لە فەرەنسا گرنگیان بە بیری کۆنت دا و لە ئینگلتراش کەسانی وەکو میل **Mill** و جورج لویس **George Lewes** هەستێکی باشیان پیشانی پەیامەکەی کۆنت دا. لەگەڵ ئەوەشدا، کە کۆنت ئاینی مرۆڤایەتی پەسەند کرد، [ئەم هەوادارانەش وازیان لیّ هانی؛ کۆنت ئەم هەڵوێستەی وەها دانا کە (بیرناس) گویّ گرێکی دامەزراو نین].

لەو کاتەوە ڕووی کردە جەماوەرێکی تر. هەر لە دێسەمبەری ساڵی **1830** داوای لە کۆمەڵەی پۆلیتێکنیکی کرد کە کۆرسێکی سەربەست لە ئەسترۆنۆمی سەرەتایی بکاتەوە، دەبوایە بۆ ماوەی هەژدە ساڵ خەریکی ئەم کۆرسە بوایە. گرنگی لەمەدا بۆئەوە بوو کە گویّ گری ئەکادیمی کەم دەبوونەوە.

جەماوەری ئەم کۆرسە پێك هاتبون لە پیاوی نیمچە ڕۆشنبیر؛ نە لە ئاستی ئەودا بوون .نە لەو بەرزتر بوون لە پۆزیسیۆنی زانکۆییدا.

ئیتر کۆنت ستایشی چاکی کرێکارە پاریسیەکانی ئەکرد کە بەشی زۆری جەماوەرەکەیان پێك دەهێنا. ("بەشەکانی تری جەماوەرەکەی پێکهاتبوو لە کۆیەکی زۆر جیاواز بە تایبەتی زۆربەیان پیر بوون")[89].

["بە شانسەوە... نەبوونی ژێر- کولتوورێکی خوێندنگایی، وایان لێدەکات... کە ڕاستەوخۆ ڕۆحی ڕاستەقینەی تازە کردنەوەی فەلسەفی وەرگرت هەرچەند بە شێوەیەکی پەرش و بڵاویش بێت. ئەمەش ناتوانریّ بە شێوەیەکی ئاسان تێبینی بکرێت بە تەواوی لە لایەن ئەو بیرەوەرانەی کە زۆر نازانن و خۆیان لە جیهانی ئەدەب دا دەدۆزنەوە... لە نێوان ئەو ڕۆشنبیرانەی لە ئێشیاندا زۆر لە سەر فەلسەفە ڕانەهێنراون ئەو کرێکارانەم دۆزیەوە (سەعاتچی، میکانیك، کرێکاری چاپەمەنی،... هتد) کە تا ئێستا ڕێزێکی پاکیان هەیە... بۆ ئەم فەلسەفە تازەیە"][90].

لەبەرئەوەی لە لایەن ڕۆشنبیرەکانی ئاستی خۆیەوە قبووڵ نەدەکرا، ئەم فەیلەسوفە کە ڕێزیان لێنەدەگرت جەماوەرێکی دیکەی پەسەند کرد کە زۆر ڕەخنەی لیّ نەدەگرت و پێکهاتبوون لە خەڵکێك کە لە ڕۆشنبیریدا لەو کەمتر بوون.

وەکو تەواوکەرێکی وانە زارەکیەکانی، کۆنت لە ساڵی **1844** نووسراوێکی بڵاوکردەوە بە ناوی "کورتەیەکی فەلسەفی سەبارەت بە ئەسترۆنۆمی میللی" کە دواتر ناسراوە بە "باسێك لە سەر ڕۆحی پۆزیتیڤ" لەم ئیشە گەورەیەدا شێوازی کۆنت گۆڕاوە و بە شێوەیەکی زیاتر وەك لە ئیشەکانی دواییدا بەدی دەکرێت جیاواز لەگەڵ کۆرسەکەی و ئیشەکانی پێشووی کە بە شێوازێکی وشك و ئارامی و میتۆدی نووسراون و بۆ ئەوەی سەرنجی ڕۆشنبیرەکان و کەسانی زانست ڕابکێشێ، شێوازی تازەی بارگاوی بەسۆزو ڕێك و پێك نیە. لەوانەیە یان بە ئەنقەست

یان بە بێ ویستی خۆی هەوڵی دابێ کە کار بکاتە سەر جەماوەرەکەی بە شێوەیەک کە لە رابووردوودا بە هەمان رێژە ئەوەی نەکرد بۆ سەرنج راکێشان. وردە وردە کە هیوای جەماوەرێکی هەمان ئاست وازی لێ دەهێنا، شێوازو بیرەکەی زیاتر لاواز دەبوون. هەوڵی ئەدا روو بکاتە جەماوەرێکی فراوانتر کە پێکهاتبێ لە خوێندەوار و نەخوێندەوار، کرێکار و بیریار، یاخود هەموو مرۆڤایەتی. بەڵام لە مێشکیدا ئەو چەند کەسانەی قسەی بۆ دەکردن زیاتر دەبوون، ئەو کەمتر دەیتوانی سەرپەرشتی بیرو شێوازەکەی بکات: لەگەڵ دوورکەوتنەوەی لە کۆنترۆڵێکی کۆمەڵایەتی برادەرەکانی، کۆنترۆڵی بەسەر بیرەکانی خۆیدا ون کردبوو. [لە کاتێکدا لە نووسینەکانی پێشەوەی لەوەی ئەکرد کە رەنگی پیڕەوی دیکارتی باخچەیەکی جوانی جۆری فەرەنسی بدەنەوە، ئیشکەی دوایی لە ئاژەڵێکی درندەی جەنگەڵی قارێ (Tropical) دەچوو] لە کۆتاییدا، پاش ساڵی 1849، کۆنت بە تەواوی پەنای بردە بەر ئەو رێبازە ئاینیەی کە دایمەزرانبوو و دڵنیایی پێدەبەخشی.

ئەم جیهانە گەرم و داخراو و لێڵەی ئاینە مرۆڤایەتیەکەی کۆنتی ئەشاردەوە لەو جیهانە دژەی بێ باوەڕەکان کە دەوری دابوو. لە وتاری یەک شەممانی کۆشککی پاشایی و Royal-Palais لەو وانانەی کە لە ماڵەوە دەیوتەوە بە خوێندکارەکانی و، لەو نامانەی کە دەینارد بۆ وڵاتی ترو بۆ پیاوانی دەسەڵات بۆ ئەوەی برێ بە خەڵکی بناسێنێ سەبارەت بە ئاینە تازەکەی، کۆنت هەمیشە زیاتر شتی سەیر سەیری دەوت. [لەبەرئەوە نابێ سەرمان سوڕمێنێ ئەگەر ئەوانەی دوای نەکەوتبوون بە شێتیان لە قەڵەم دابێت]. لەوانەیشە کە لەم ساڵانەی دواییدا بە راستی شێت بووبێت. هەرچۆنێك بێت بە خۆکشانەوەی تەواوی لە بیروڕای ئەو سەردەمەی کە تیا دەژیاو (ئەبێ بیرمان بکەوێتەوە کە لەبەر هۆی "تەندروستی عەقڵی" کۆنت لە مێژ بوو نووسینی خەڵکی تری نەدەخوێندەوە) [و بوونی بە یەکێك کە جەماوەرەکەی پێکهاتبێ لە چەند کەسێکی ئاست نزمی خوێندەوار کە بە اعجابەوە تەماشایان ئەکرد، ئەم شتانە دەتوانن تا ڕادەیەك هۆی شێت بوونی شی بکەنەوە].

ئیتر پاپای پۆزەیتیڤیزم دەستی کردبوو بە تیرهاویشتن دژی ئەو رۆشنبیرانەی کە نەیدەتوانی بیان گاتێ دژی "ئەوانەی کە پێیان دەوترێ پۆزیتیڤیست و خۆیان بە رۆشنبیر دادەنێن (و) لە هەموو کەسێك کەمتر رۆشنبیرن".[91] ئیتر کۆنت دەیوت کە کرێکارەکان "هەڵوێستێکی سروشتیان هەبوو تا ببن بە یاریدەدەری دەسەڵاتی رۆحی"[92]. باوەڕی بە هەستی سەرپلکی (Spontaneous) دەروونی ساکار هەبوو یاخود بەوەی کە ئەوان وایان دەزانی وابن. لە نێوان ئەو خوێندکارانەی لەم ساڵانەی دواییدا چۆکیان ئەبرد لەبەر پێی پاپا، ئەوانە بوون کە میکانیك و دارتاش و شاعیری بێ شانس و فەرمانبەری کتێبخانە و خوێندکارە کۆنەکانی خوێندنگای پۆلیتێکنیك و ئەوانە بوون کە لە دواییدا ئەبوونە پیاوی سیاسی.

ئەو بانگەوازەی دەیویست پارەو یارمەتی بۆ کۆنت کۆبکاتەوە لە دوا ساڵانی ژیانیدا، لە لایەن ئەم کەسانەی خوارەوە ئیمزا کرابوو:
Kh. Jundizill پرۆفیسۆری ماتماتیك؛ Belpaume پینەچی؛ Fili میکانیك؛ Pascal خوێندکاری فەلسەفە؛ ch. Robin دکتۆری پزیشك؛ F. Maguin دارتاش؛ Litter ئەندامی ئیستیتوت؛ Second دکتۆری پزیشك؛

Contreras خوێندکـاری کۆلیـژی پزیشـکی؛ Francelle سـەعاتچی؛ Leblais پرۆفیسـۆری ماتمـــاتیك؛ A.Ribet خوێندکــــار لـــــە کۆلیژی یاسا(93).

که قسەی بۆ ئـەم بـرادەرە جیـاواز جیاوازانـە ئـەکرد، کۆنـت زمـانێکی تـەمومژاوی و بارگـاوی بەکاردەهێنا کە لەگەڵ ئەو شێوازەی جـارانی کـە شێوازێکی وردو پوختە بوو جیاواز بوو، کاتێك بۆ قەناعەت پێهێنانی خوێندکارەکانی ئاسـتی خـۆی بـەکاردەهێنا، بـۆ قەناعـەت پێـهێنانیان لـە چوارچێوەیەکی عەقڵانیدا. بەڵام، ئێسـتا بـەهۆی دووری لـە سـەنتەری راکێشـانی رۆشـنبیری و داگـیرکردنی پۆسـتێکی نزمـەوە لـە نـاو ئـەو کۆمەڵگایەی کە تیایا دەژیا وای لە کۆنت کردبـوو تا ڕادەیـەکی زۆر ببـێ بـە یـەکێکی زۆر سـەیر لـە نووسین و وتارەکانیشیدا.

[کۆنت کاتێ گەنج بوو، لەوانەیە هەستی بەوە کردبـێ کـە پێویسـتیەکی تـازەی بـە باسـێکی رۆشـنبیری و ئـەخلاقی کـورت هـەبووبێ، لـەو شێوەیەی کە ئەو بیری لێ ئەکردەوە. نـەك تەنـها سـان سـیمۆن، بـەڵکو چـەند رۆشـنبیرێکی بچوکـتریش هـەوڵیان ئـەدا ئـەم پێویسـتیە پـڕ بکەنەوەوە لەمەشدا کۆنت بەهەڵەدا نەچوو بوو].

[لەگـەڵ ئەوەشدا، لـەوەش دەچێـت کۆنـت دواکەوتبێ لە بەرامبەر پێویستیەکانی سـەردەمی خۆیـدا لەوپـەڕی "نەهامـەتی سـەدە" دا کۆنـت شتی زانستی زۆر قورسی دەنووسی و گۆڕەپـانی بـە جێدەهێشـت بـۆ ژیاننـەوەی ئـەخلاقی سـان سـیمۆنیەکان و ئەوانـەی کـە لاف و گـەزافی رزگارکردنی کۆمەڵیان لێدەدا].

[لـە دوایـیدا پـاش فشـارەکانی سـاڵی 1848 رۆڵی تازەی پێغەمبەری ئاینی وەرگرت، فەرەنسا پەسـەندی ئـەو شـتانەی کردبـوو کـە دەبوایـە ببوونایـە بـە عـاداتی ئیمپراتتۆریـەتی لویـس نـاپلیۆن و ئەوانـەی کـە دوای ئـاینی تـازە کەوتبوون].

لە کاتێکدا کـە سـان سیمۆنیەکان رۆشـنبیری گەنجە فەرەنسیەکانیان رادەکێشا، کۆنت بوو بوو بەوەی کـە وتـاری بۆ کەسـە سـاکار و لاوازەکـان دەدا. رێبازەکـەی سـەرکەوتنێکی گـەورەی لـە ئەمریکای لاتینی بەدەست هێنا؛ لەوێ رۆشـنبیرە لیبراڵـەکان و پیـاوە سیاسـیە بڵنـد بینـە بۆرجوازیـەکان دەیـان توانـی بـۆ بەجێـهێنانی ئامانجەکانی خۆیـان بـەکاری بـهێنن. بـەڵام لـە فەرەنسـادا (خسـتنەڕوو و داواکـردن) (عـرض وطلب) هەرگیز نەیان دەتوانی بگەنە (تـەوازنێك). هەرچەندە کۆنت توانی کـارێکی زۆر قـووڵ بکاتـە سەر نەوەکانی تری زانسـتە کۆمەڵایەتیـەکان (بـۆ نموونـە Durkheim, Lucien Levy- Brahi, Taine, Reuan ,)و هەرچـەندە بەشـێك لـە پەیامەکەی لە لایەن چەند کەسێکەوە وەرگیرا، خـەڵکی راسـتڕەو وەکـو charles Maurras، خەڵکی چەپڕەو و زۆر رۆشنبیری کـۆری سێهەم، بەڵام بـە هیـچ شێوەیەك نـەبوو بـەوەی کـە وەك خوێندگایـەکی کۆنتـی (Comte) گـەورە بـانگ بکرێ لە سەر ئاستی رۆشنبیریدا.

ئـەوەی کـە توانـی بـژی و بـەردەوام بێـت میتۆدەکـەی بـوو نـەك تایبـەتی نـاوەڕۆکی رێبازەکـەی و کاریگـەری گەورەشـی هـەبوو بـە باشیش بڵاو بوەوە(94).

## 5-پوختەی باسەکەی:

بـە ڕاستی عـەقڵی کۆنـت زۆر داهێنـەر بـوو [سۆسیۆلۆژی ناتوانێ بگاتـە سـەرچاوەی ئـەم داهێنانە (Creatiwity)، بەڵام دەتوانێ یارمـەتی شیتەڵ کردنـەوەی شێوەو چۆنیـەتی ئیشـکردنی ئەم زیرەکیە بدات] .

[کۆنت کە لە هەلومەرجێکی ناهەمواردا لابەلا هاتبوو بۆ پاریس، زۆر شانسی هەبوو لەوەدا چونکە پاریس سەنتەری ژیانی رامیاری و رۆشنبیری بوو].

[بە پەروەردە بوونی لە خوێندنگایەکی زانستی زۆر گرنگ و بە کردنەوەی بۆ کاریگەری مامۆستا و هەڤاڵە زیرەکەکانی، کۆنت بە شێوەیەکی تەواو خێرا ئاماژە رۆشنبیریەکانیوەرگرت]. کۆرس و وانە و گفتوگۆی لابەلا، هەموو ئەمانە ئەزموونێکی گرنگ بوون بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی رۆشنبیری ئەم گەنجە کە لە دواییدا تەواو کرا بە هۆی هاوکاری کردنی لەگەڵ سان سیمۆن دا.

کۆنت لە سەردەمێکی رەخنەیی پڕ لە راپەڕین و ئەنارکی (فوضی) و ونبوونی ئیمان و باوەڕدا خۆی دروست کرد. ئا لەم سەردەمەدا بڕیاریدا سیستمێکی فەلسەفی دروست بکات کە مرۆڤایەتی بەرەو دەقێکی ئۆرگانی ببات و لەوەشی ئەکرد ئەم مرۆڤایەتیە بە تەواوی تا ئەو کاتە لێی بێبەش بووبێ: لە هەموو ئیشە گەورەکەیدا داوایەکی بەردەوامی پێڕەوی ئەکرد لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم زانا پێشکەوتن خوازە بە تەواوی قەناعەتی بەوە هەبووە پێڕەی تازە نابێ تەماشای گەڕانەوە بکات بۆ رژێمی کۆن (Ancien Regime) بەڵکو دەبێ تەماشای داهاتوو بکات و وەکو سان سیمۆن، کۆنت کوڕی رۆحی condorcet de Maistre بوو.

[کۆنت زۆربەی ژیانی لە لێواری دەسگای ئەکادیمی بردە سەر و لەم ئاستەدا بێ بەش بوو لە کۆنترۆڵی هەڤاڵە میتۆدیەکانی؛] ئەگەر لە لایەکەوە ئەم بارودۆخە بتوانێ تا رادەیەك شێتەڵی ئازایەتی و غیرەتی بکات و هیلاکی رۆشنبیری دەربخات، لە لایەکی ترەوە دەتوانێ هێل بهێنێ بە ژێر هۆی روخاندنی ئیشە گەورەکەی لەو ساڵانەی دواییدا. دووری لەو هەڤاڵانەو نەبوونی جەماوەرێکی بەردەوام لە سەرەتادا، بواریان نەداوە بەو کۆنتەی کە گوێی لێ نەگیراوە لەبەر قەرەباڵغی بابەتە ئەکادیمیەکەیەوە، بە تەنیا خەوی خۆی بەرێتە پێشەوە؛ لەگەڵ ئەوەشدا خۆی لە دواییدا نرخێکی گەورەیدا]

[ئیتر بە دوو شێوە دەبێت ئەم پیاوە ببینین: دروستکەری یەکەم کورتەی سۆسیۆلۆژی ئامادە کرد و نەوەکانی دوایی ئەتوانن پشت گوێشی بخەن تەنانەت بەرامبەر نرخێك کە دەبێ بیدەن: هەزار بوونی میراتی بە شێوەیەکی فراوان؛ ئەو پیاوە بچووکە بە شێوەیەکی ئاینی خوتبەی بۆ جەماوەرەکەی دەدا کە پێکهاتبوو لە دارتاش و رۆشنبیری فاشل؛ ئەو رۆحە بە پەرۆشە دەیویست یەك بینین بداتە رابردوو و داهاتوی مرۆڤایەتی؛ ئەو پیرە ترسێنەرە کە ئامۆژگاری زاری (قیصر) دەدا کە سەرزەنشت (cehsure) توند تر بکات بۆ ئەوەی دووچاری بیری تێکدەر نەبێتەوە[95]].

[وا بزانم چارەنووسی سۆسیۆلۆژی کە خەریکی شیتەڵکردنەوەی لێڵیی کۆمەڵگای مۆدێرنە، ئەو زانستەیە کە رەگی خۆی لە ئیشە گەورەکەی پیاوێکی ئاوا هاودژ (contraictory) داکوتیوە وەکو نیگارێك کە لە جانۆ بیفرۆنتی Giano Bifronte ئەکات.

ئەگەر ئەو ئاوا بوو بوو، بە چەند پارچەیەك لە ئەنجامی پێداویستیەکی دوو فاقەیی (پێڕەو پێشکەوتن)، ئێمەش ئێستا بەو دەردەوە دەتلێینەوە].

## پەراوێزەکان:

53-EICHTAL کاغەزێك لە ئێیشتالەوە

*E. littre. Auguste compte etla philsophie Positive. Cit P.P 150-151.*

*54-F.E.Manual, Iprofeti di Parigi cit. P.41.*

*55-I bed. P.p. 51-52.*

75-I bid, P. 213.

76-G. de Bertier de sauviguy. La Restauration. Sit. P. 255.

77-S. charlety. La Monarchie de Jiuillat, cit, P. 216.

78-E. J. Holsbawn, the Age of Revolution, new york, Mentor Books, 1967.

79-I bid. P. 166.

80-G. de Bartien de savvigny Les tauration, cit, P.P. 238-239.

81-I bid. P.P 239-240.

82-F. A. Hayek. The couater revoluhon of saeucy. New york the Free pre 1952.

83-I bid and in H. Goulier, La jeuname j Augaste comte cit vol. I. P.P 146 and in La vie Augste comte cit. P. 56.

84-H. Gouhier. La jewneve di Auguste comts cit. Vol. I. P. 146.

85-S. charlety La Restauration. Vol. IV. Cit. P.. 223.

86-H. Goulier, La Jeunem, Augste comte, cit, vol, I. P. 152.

87-F.A. Hayek, Labuso della ragione, cit. P.P. 136-137.

88-H. Goubier, La Jeuuesse Aaguste comty. Cit. Vol. I. P. 146.

89-H. Gu hier, La vie d'Augste comte, cit, P.219.

90-I bid. P.P 218-219.

91-I bid. P. 277.

92-M. Leroy. Histoire des idees socales cn Fraruce, paris Gallimard, 1954- vol III. P. 234.

93-E. Littre. August comte et La philos phie Positve, cit, P.P 600-601.

94-G. charlenton. Pasitivist thought in France during the second Empine, ox ford, clareudon. 1959.W.M simon, European positivism in the ninteenth ceutury, I thaca, coruell universty press 1963.

95-A. comte, systeme de Politigve Positive cit vol, III. P. 29.

ئەم باسە لە

Lewis A. coser. "I maestri del Pensiero socio logico" IL Mulino, Bologne, 1983.

وەرگیراوە

❑

56-I bid. P. 97.

57- ئەو بەشەی کە پەیوەندی هەیە بە تۆرگۆت و Turgot و کۆندۆرسێ (condorcer) وە لەم پەرتووکەی خوارەوە کەلکم لێ وەرگرتووە:

F.E. MANUEL, I Porfeti diparigi...., Ct., Vo II, P. 605.

58-A. COMTE. SYSTEME..., CIT, Vol... III, P. 605.

59-L. de Bonald, old, oeuvres, paris, J. P. Migue, 1864, vol. III P.P 360..36

60-L. de Bonald, the'orie du puovov 3 voll. S. E, 1976 Vol. III.supplemsnt. p.51

61-L. de Bonald, the'orie du Pouvoiv ... vol. I. Prefation, p5.

62-R. Nisbet, the sosological Tradition. New york. Basc Books. 1966...

R. Nisbet, Tradition and Revolt, New york, Random House, 1968.

D. Baggs, Les idees Politigues en France sous La Restauration, Paris PUF, 1952.

J. Godechot, La contre- revolution, Paris, Puf, 1961.

R. Soltau, Freucl Political (Thought in the ligth century, New york. Russel and Russel 1959.

63-A. comte, corso..., cit, vol. I.P.187.

64-I bid, P. 191.

65-C. Gide and Rist. Histoire des doctrines economiques Paris. Sirey, 1959. P. 63.

66-A. smith, An Inquiry in to the Natare and causes of the wealth of Nations.

67-I bid. P.P 123-124 and M. Girard, Le Liberalisme eu Fransi de 1814 a 1848. Paris. Les cousde sorbonne, s. d. P.P. 86-87

68-I bid. P. 157.

69-F.E. Manuel. The New world of Heury saint- simon.

Cit. P.P 133-136.

70- F.E. Mauael. I Profotidi Parigi, cit. P. 254.

71-A. comte. Cours..., vol. I, P. 12.

72-G. sabine, A History of Political Thought, new york Holt Rinehart and wiston, 1061.

73-G. de Bertier de sauviguy de juillet, vol. Paris, Hachette, 1921 D. 187.

74-Charlety Lamonorchie de juillet,vol. II, paris, Hachette 1921. P.187.

# سنوورەکانی مەعریفەی فەلسەفی

■ بێرتراند ڕەسڵ

● و. لە ئینگلیزیەوە: عەتا قەرەداخی

لە هەموو ئەوەی کە تاکو ئێستا لە بارەی فەلسەفەوە گوتومانە، ئێمە بە دەگمەن خۆمان لە قەرەی زۆر بابەت داوە کە پانتایییەکی فراوان لە نووسینە فەلسەفیەکان داگیر دەکەن. زۆربەی فەیلەسوفەکان یان بەشێکی زۆریان دان بەوەدا دەنێن کە بە هۆی بەڵگەهێنانەوەیەکی میتافیزیکانەی پێشترەوە دەتوانن شتی لە جۆری دۆگما بنەڕەتیەکانی ئاین و عەقڵانیەتی گەوهەرییانەی گەردوون و وەهمیەتی بابەت و ناڕاستی هەموو خراپەو گوناهێك و... بسەلمێنن. گومانی تێدا نیە کە ئاوات خواستن بۆ دۆزینەوەی هۆ بۆ بڕواهێنان بەم جۆرە تێزانە پەیام یان سروشتی سەرەکی زۆر خوێندکاری تەمەن درێژی فەلسەفە بووە.. بە بڕوای من ئەم ئاوات خواستنە شتێکی بۆش و بێ مانایە، چونکە وا دەردەکەوێت ئەو مەعریفەیەی کە پەیوەندی بە گەردوونەوە هەیە بەشێوەیەکی گشتی ئەو مەعریفەیە نەبێت کە میتافیزیك بە دەستی دێنێت. هەروەها سەلماندنە پێشنیارکراوەکان لەبەر تیشکی یاساکانی لۆژیکدا کە پێی وایە ئەم جۆرە شتانە دەبێ هەبن و ئەو جۆرانەی تریش دەبێ نەبن توانای دەرخستنی هەڵسەنگاندنێکی وردی رەخنەییانەی نیە.

لەم بەشەدا ئێمە بە کورتی ئەو جۆرە ڕێگایە وەردەگرین کە تیایدا ئەم جۆرە لێکدانەوەیە تاقی دەکرێتەوە ئەویش بە بۆچوونێکەوە کە داخۆ ئەوەی ئێمە دەیخوازین دەشێ پەسەند بێت.

لە سەردەمی نوێدا نوێنەری گەورەی ئەم جۆرە ڕوانینە کە ئێمە خوازیاری هەڵسەنگاندنین هیگڵە (1770–1831). فەلسەفەی هیگڵ مێجگار گرانەو ئەوانەی لە بارەیەوە دەدوێن جیاوازن لەوانەی کە ڕاڤەی ڕاستەقینەی ئەم فەلسەفەیە دەکەن. بە پێی ڕاڤەکردن، من ئەوەی لە

سەرجەم قسەکەرەکان ئەگەر زۆربەش نەبن وەری دەگرم ئەوەیە کە شایانی بایەخێك بێت یان جۆرە گرنگیەکی فەلسەفی ببەخشێت. تیزی سەرەکی هیگڵ ئەوەیە کە هەر شتێك "تەواو" نەبێت ئەوە بە ئاشکرا بریتیە لە بەش یان پارچەو بە ئاشکراش بەبێ بەخشینی بەهای تەواو پێی لەلایەن رەگەزەکانی تری دنیاوە توانای بوونی نابێت.

ئەو هەروەك توێکارێکی بەراوردکار چۆن لە پارچەیەك ئێسقاندا دەزانێت کە ئەوە دەبێ چ جۆرە گیانلەبەرێك بێت، بەم جۆرە بەپێی تێڕوانینی هیگڵ میتافیزیك لەهەر شتێکدا بەشێك لە ڕاستی دەبینێت، بەشێك لە هەموو ئەو راستیەی کە بەلایەنی کەمەوە دەبێ لە هێڵە سەرەکیەکانیدا هەبێت. هەر بەشێکی بە ئاشکرا جیاکراوەی راستی وەکو ئەوەی بووە هۆی پەیوەستکردووە بە بەشی دواترەوە، لە بەرامبەردا بەشی دواتریش پەیوەستە بە دوای خۆیەوەو.. تاد، هەتا بەم شێوەیە هەموو گەردوون پێکدێت یان رێکدەخرێت.

بە بۆچوونی هیگڵ ئەم ناتەواوێتیە سەرەکیە بەهەمان شێوە لە دنیای فیکرو دنیای شتە بەرجەستەکانیشدا دەردەکەوێت. لە دنیای فیکردا ئەگەر هەر بیرۆکەیەك وەربگریت کە ئەبستراکت یان ناتەواو بێت، ئەوا ئەگەر ناتەواوییەکەی پشت گوێ بخەین ئەوە لە تاقیکردنەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئێمە دەکەوینە نێو ململانێ و دژایەتیەوە. ئەم ململانێو ناکۆکیەش لە بەدواچووندا ئەو بیرۆکەیە دەخاتە بەرامبەری خۆیەوە یان دژی خۆیەوە، بۆ رزگاربوون لەوەش دەبێ ئێمە بیرۆکەیەکی نوێی کەمتر ناتەواو بدۆزینەوە کە ئەویش بریتیە لە فیکرەی بنەڕەتی ئێمەو دژی ئەو فیکرەیە.

ئەم فیکرە نوێیە سەرباری ئەوەی کە ناتەواوییەکەی کەمترە لە چاو ئەو فیکرەی کە لە سەرەتاوە دەستمان پێکرد کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەشێ وەها ببینرێت کە هێشتا فیکرەیەکی بە تەواوی تەواو نیە، بەڵام دەگوازرێتەوە بۆ دژەکەیو دەبێ لە کۆبوونەوەیەکی نوێدا لە گەڵیدا یەکبگرێت. بەم رێگایە هیگڵ هەنگاو دەنێت هەتا دەگات بە "فیکری رەها "کە بە تێڕوانینی ئەو فیکری رەها ناتەواوی تێدا نیەو دژی نیەو پێویستیشی بە پەرەسەندنی زیاتر نیە. فیکری رەها دیسان لەبارو گونجاوە بۆ وەسفکردنی راستی رەها. بەڵام سەرجەم فیکرە ناتەواوەکان (نزمەکان) تەنیا وەسفی راستی دەکەن وەکو ئەوەی کە لە نیمچە روانین یان بۆچوونێکەوە دەردەکەوێت، نەك وەکو وەسفی ئەو کەسەی کە لەیەك کاتدا هەموو لایەنێکی ئەو شتە پێکەوە وەسف دەکات یان دەیخاتە ڕوو.

بەم شێوەیە هیگڵ دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە راستی رەها یەك سیستەمی رێکخراوی تەنیا پێکدێنێ، نە پەیڕەوی شوێن و کات دەکات، نە لە هیچ ئاستێکدا خراپ و درێوە، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی سیستەمێکی عەقڵانیو رۆحانیشە.

هەر دەرکەوتنێك بۆ دژایەتی کردن لە دنیایەکدا کە ئێمە پەی پێ دەبەین دەشێ بە شێوەیەکی لۆجیکی بسەلمێنرێت. لەبەر ئەوە – هیگڵ بڕوای وایە – کە ئەوە بەشێوەیەکی هەمەلایەنە بەندە بە ڕوانینی بەش بەش بووی ئێمەوە بۆ گەردوون. ئەگەر ئێمە گەردوونمان بەگشتی ببینیایە وەکو ئەوەی تەسەوری دەکەین کە (خودا دەیبینێ)، ئەوا شوێن و کات و بابەت و

خراپەو دزێوی هەموو ململانێ و کێشەکانیان دیار نەدەماو لە جیاتی ئەو ململانێ و کێشانە ئێمە یەکێتیەکی تەواوی نەمری نەگۆڕاوی رۆحیانەمان دەبینی.

لەم چەمکەدا شتێکی لەجۆری بڵندبوون هەیە کە نکوڵی لێ ناکرێت و ئێمە ئاواتی ئەوەی بۆ دەخوازین کە ڕەزامەندی بەدەست بهێنێو سەرەڕای ئەوەش کاتێ گفتوگۆکردنەکان بۆ پشتگیری ئەو بە وریای تاقی دەکرێنەوە، ئەوا وا دەردەکەوێت کە بۆ لە خۆگرتنی گریمانە زۆر تێکەڵ و پێکەڵەکان و زۆر نیشاندراوەکان بێت. ئەو بنەما سەرەکیەی کە سیستەمەکەی لەسەر دادەمەزرێ ئەوەیە کە چ شتێك ناتەواو بێت، نابێ خۆی بسەپێنێت بەڵکو پێویستی بە پشتگیری شتی تر هەیە پێش ئەوەی بگاتە ئاستی "بوون" ئاشکرایە کە هەر شتێ پەیوەندی بە شتەکانی دەرەوەی خۆیەوە هەبێت دەبێ هەندێ سەرچاوەی سەبارەت بەو شتانەی دەرەوەی خۆی لە سروشتی خۆیدا هەڵگرتبێت، هەروەها ناتوانێت ببێت بەو شتەی کە دەبێ ببێت ئەگەر ئەو شتە دەرەکیانە بوونیان نەبێت. بۆ نموونە سروشتی مرۆڤ لە یادەوەریو بەشەکانی تری مەعریفەی خۆی و لە خۆشەویستیو رق و... تاد پێکدێت، بەڵام بەگوێرەی ئەو شتانەی کە دەیانزانێت یان خۆشی دەوێن یان رقی لێیانە، ئەوا نەیتوانیووە ببێت بەوەی کە خۆی هەیە. ئەو مرۆڤە بەشێوەیەکی بنەڕەتیو بە ئاشکرا بریتیە لە بەشێك: وەکو برێك لە بڕی گشتی ڕاستی وەرگیراوەو لەوانەیە لە نێوخۆیدا بریتی بێت لە ناکۆکیو ململانێ.

سەرجەمی ئەم تێڕوانینە دەکەوێتە سەر بیرۆکەی "سروشتی" شتێك ئەگەرچی وا




دەردەکەوێت کە مانای "هەموو ڕاستیەکی لە بارەی ئەو شتەوە" هەڵگرتبێت. بێگومان ئەو حاڵەتەی کە راستیەك شتێك دەبەستێت بە شتێکی ترەوە دروست نابێت ئەگەر شتەکەی تر خۆی بوونی نەبووبێت. بەڵام ڕاستی دەربارەی شتێك بریتی نیە لە بەشێك لە شتەکە خۆی، ئەگەرچی پێویستە بەشێك بێت لێی. بە پێی ئەو بەکارهێنانەی سەرەوە دەبێ ئەو راستیە بەشێك بێت لە "سروشتی" ئەو شتە. ئەگەر مەبەستمان لە سروشتی شتێك هەموو راستیەکان بێت دەربارەی ئەو شتە، ئەوا بە ئاشکرا ناتوانین "سروشتی" ئەو شتە بناسین هەتا سەرجەم پەیوەندیەکانی ئەو شتە بە تێکڕایی شتەکانی تری گەردونەوە نەزانین. خۆ ئەگەر وشەی "سروشت" لەم ڕوانگەیەوە بەکارهێنرا ئەوا دەبێ ئێمە پەی بەوە ببەین کە دەشێ شتەکە بزانرێت یان بناسرێت لەکاتێکدا ئەگەر "سروشتی" ئەو شتەش نەزانراو بێت یان لە ئاستێکی تردا بە

ـەواوی زانراو نـەبێت. تێکـەڵ کردنێك هەیـە لـە نێوان مەعریفـەی شـتەکان و مەعریفـەی ڕاسـتیدا کاتێ وشەی سروشت بەکاردەهێنین.

دەشێ ئێمە بـە وەرگرتـن، مەعریفـە لـەبارەی شتێکەوە وەربگرین تەنانـەت ئەگـەر زانیـاری زۆر کەمیشمان لە بارەی ئەو شتەوە هەبێت. هەروەك لـەڕووی تیۆریشـەوە پێویسـتمان بـەوە نیـە هیـچ زانیارییـەك لـە بـارەی ئـەو شـتەوە بزانـین. بــەم شـێوەیە هۆگری لەگـەڵ شـتێکدا بــە پێـی ئــەو بۆچوونەی سەرەوە مەعریفـە لـەبارەی سروشـتی ئەو شتەوە لە خۆی ناگرێت یان پێشکەش ناکات. لەبـەر ئـەوە یەکــەم: ناسـینی شـتێك لــە ڕووی لۆجیکیەوە مەعریفە لەبارەی پەیوەندیەکانی ئەو شتەوە لەخۆ ناگرێت. دووەم: مەعریفـە لـەبارەی هەندێك لە پەیوەندیەکانی ئەو شتەوە نە مەعریفە لـەبارەی هـەموو پەیوەندییـەکانی ئـەو شـتەو نـە مەعریفە لە بـارەی "سروشـتی" ئـەو شـتەوە بـە پێی ئەو تێڕوانینەی سەرەوە هەڵناگرێت.

بۆ نموونــە دەشــێ مـن زانیـاریم لـەبارەی دان ئێشـەکەمەوە هـەبێت، ئــەم زانیاریــەش دەشــێ هەمان شێوەی هەر زانیاریەکی تر کە بە وەرگرتن شیاوە تەواو بێت بەبێ زانینی هەموو ئەوەی کـە دکتـۆری ددان دەتوانـێ لـەبارەی هـۆی ئـەو ددان ئێشـەوە پێم بڵێـت، هــەروەها بـە بـێ زانینــی سروشــتی ئــەو ددان ئێشــەیە بــەو تێڕوانینــەی سەرەوە، بەم جۆرە ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەو شتە کـە پەیوەستبوونی هەیـە مانـای ئـەوە نیـە کـە بیســـەلمێنێت لـــە ڕووی لۆجیکیـــەوە ئـــەو پەیوەستبوونانە پێویستن هەر بۆ گوتـن لـە تاکـە ڕاستیەکدا کە ئەویش ئەو شتەیە کە هەیـە ئێمـە ناتوانین بەو ئەنجامەی بگەین کە ئەو شتە دەبـوا ئەو پەیوەستبوونە جۆراوجۆرانەی هەبوایە کە لـە ڕاستیدا هەیەتی. ئەمەش تـەنیا بۆ بـەدواداچوون دەردەکەوێت چونکە ئێمە پێشتر دەیزانین.

ئەمەش ڕوونــی دەکاتــەوە کـە ئێمـە نـاتوانین بیسـەلمێنین کـە گـەردوون وەکـو یەکەیـەك تاکـە سیستەمێکی هارمۆنی پێکدێنێت وەکو ئەوەی کە هیگـڵ بـڕوای وایــە گــەردوون ئــەو سیســـتەمە پێکدێنێت. ئەگەر نەتوانین ئەمە بسەلمێنین ئـەوا دیســان نــاتوانین ناڕاسـتێتی کــات و شـــوێن و خراپـیو درێــوی بابــەت بســەلمێنین، ئەمــەش لەلایـەن هیگڵـەوە لـە خاسـێتە عــەقڵانیو بــەش بەشیەکانی ئـەم شتانەوە بەرهــەم دێـت. بــەم شـێوەیە ئێمـە بـەجێدەهێڵرێین بۆ توێژینــەوەی بـەش بەشـی دنیـا هــەروەها توانامــان نیــە کــە خاسێتەکانی ئەو بەشانەی گەردوون بزانین کە لە ئەزموونی ئێمەوە دوورن. ئەم ئەنجامە مایەی بێ ئومێدیە بۆ ئەو کەسانەی کە هیواکانیـان لەلایـەن سیسـتەمەکانی فەیلەسووفانەوە بەرزکراونەتـەوە ئەوا لەگەڵ شـێوازی خوێندنـەوەی و زانسـتیانەی سـەردەمی ئێمــەدا ڕێــك و گونجــاون، هــەروەها لەلایەن سەرجەم تاقیکردنـەوەی ئـەو مەعریفـەی مرۆڤـەوە کـە لـە بەشـی پێشـتردا باسکرا بــەهێز دەکرێت.

بەشێکی زۆر گەورەی هەوڵە جێگا تموحەکانی میتافیزیکەکان کە لەلایەن هەوڵی سەلماندنی ئەم یان ئـەو خاسـێتە دیارانـەی دنیـای ڕاستەقینەوە پەرەیان پێدراوە لە خودی خۆیاندا ناکۆکی بوون و ڕاست نـەبوون. سـەرجەم مـەیلی فیکری نـوێ زیادو زیاتر لە ئاراستەی نیشاندانی ئەوەدایـە کـە ناکۆکیە دانراوەکان وەهم بوون و شتێکی هێجگار کــەم دەســەلمێنرێت وەکــو پێشــینەیی لـــە ناکۆکیــەکانی ئــەوەی کــە پێویســت ببێــت. ڕوونکردنەوەیـەکی چـاکی ئەمـە لەلایــەن کـات و شـوێنەوە پێشـکەش دەکرێت. کـات و شـــوێن وا

دەردەکەون کە مەودایان بێ سنوورە، بەشێوەیەکی فراوانیش شایانی دابەشبوونن. ئەگەر بە درێژی هێڵێکی راست بەهەر ئاراستەیەك رێگابکەین، ئەوا ستەمە بڕوا بەوە بکەین کە لە کۆتایدا دەگەین بە دوا خاڵ، واتە بە خاڵێك کە لە دوای ئەوەوە هیچی تر نەبێت... تەنانەت بۆشایش بوونی نەبێت. هاوشێوەی ئەم بۆچوونە


کانت

ئەگەر لە خەیاڵدا بەرەو دواوە یان بەرەو پێشەوە لەکاتدا رێگا بکەین ئەوا ستەمە بڕوا بکەین بەوەی کە دەگەین بە یەکەم یان دوایین کات کە لە دوایەوە هیچ کاتێکی بۆش نەبێت. بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە کات و شوێن دوو رەهەندی بێ سنوورن.

دیسان ئەگەر هەردوو خاڵێك لەسەر هێڵێك وەربگرین، بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە دەبێ خاڵی تر لە نێوانیاندا هەبێت هەرچەندە دووری نێوان ئەو دوو خاڵە کەمیش بێت. هەموو دووریەك کەرت دەکرێت و هەر کەرتێکیش دەشێ دیسان کەرت بکرێتەوە. بەم جۆرە ماوەکان بێ سنوور کەرت دەکرێن. هاوشێوە لەکاتدا هەرچەندە کاتەکەش بچووك بێت دەشێ لە نێوان دوو چرکەساتدا کاتێکی تر هەبێت و ئاشکرایە کە لە نێوان ئەو دوو چرکەساتەشدا ساتی تر هەیە.

بەم جۆرە کات و شوێن وا دەردەکەون کە بەشێوەیەکی بێ سنوور شایانی کەرتبوون بن. بەڵام وەکو دژوەستانی ئەم راستیە ئاشکرایانە - مەودای بێ سنوورو دابەشبوونی بێ سنوور- فەیلەسوفەکان بە ئاراستەی نیشاندانی ئەوەی کە کۆکردنەوەی بێ سنووری شتەکان بوونی نیە گفتوگۆیان دەکردو پەرەیان بە گفتوگۆش دەدا. هەروەها ژمارەی خاڵەکان لە شوێندا یان چرکەکان لەکاتدا دەبێ سنووردار بن. بەم شێوەیە ناکۆکی لە نێوان سروشتی ئاشکرای شوێن و کاتدا لە نەشیانی چاوەڕوانکراوی کۆکردنەوە بێ سنوورەکاندا دەرکەوتووە.

کانت یەکەم کەس بوو جەختی لەسەر ئەم ناکۆکیە کردو نەشیانی کات و شوێنی بە ئەنجام هێناو ئاشکرای کرد کە ئەو نەشیانە تەنیا شتێکی زاتیەو لە سەردەمی ئەویشەوە زۆر لە فەیلەسووفان بڕوایان وابووە کە شوێن و کات تەنیا دیمەنن (رووکەش) و خاسێتی دنیا نین وەکو ئەوەی لە راستیدا هەیە. ئێستا سەرباری قەرزارباری بۆ کارگەرانی بواری ماتماتیك و بەشێوەیەکی لەبەرچاویش بۆ جۆرج کانتۆ -کە دەری خستووە نەشیانی کۆکردنەوە بێ سنوورەکان هەڵەیەك بوو. ئەمانە لە راستیدا ناکۆکی خودیی نین بەڵکو تەنیا ناکۆکی تایبەتین زیاتر لەوەی کە لایەنگرێتی عەقڵی توندوتیژ بن. لەبەرئەوەی هۆیەکانی حسابکردنی کات و شوێن وەکو (وەهم) بوون بەشتی ناکردەیی و لەوێشەوە

یەکێکیش لە سەرچاوە گەورەکان بنیادە میتافیزیکەکان وشک دەکات.

سەرباری ئەوەی ماتماتیکیەکان قایل نەبوون کە شوێن بەو جۆرە نیشان بدرێت کە بە شێوەیەکی گشتی شیاوە. ماتماتیکیەکان ئاشکرایان کردووە کە زۆر شێوەی تری شوێن بەهەمان پێوانە شیاو دەبێت بەو جۆرە کە لۆجیک دەتوانێت نیشانی بدات. هەندێ لە بەڵگەنەویستەکانی ئەقلیدس کەوا دیارن بۆ هەستی گشتی پێویست بن، هەر ئەو بەڵگە نەویستانەش پێشتر لەلای فەیلەسووفەکان وا دانراون کە پێویست بن، ئەوا ئێستا بۆ دارشتنی رووی دەرکەوتووی خۆیان لەگەڵ هۆگری ئێمە پەیوەست بە شوێنی راستەقینەوە دەناسرێن، بەڵام ناشێت لە هیچ بنەمایەکی پێشینەی لۆجیکانەوە ناساندن بەدەست بهێنن. بە تەسەور کردنی دنیای جۆراوجۆر، ئەو دنیایانەی کە تیایاندا ئەم بەڵگەنەویستانە هەڵەن، ماتماتیکیەکان لۆجیکیان بەکارهێناوە بە مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی هەستی گشتی یان بە مەبەستی ئیحتمالی جیاکردنەوەی (زۆر –یان– کەمی) سەرجەم شوێنەکان لەو شوێنەی کە ئێمەی تێدا دەژین.

هەندێ لەم شوێنانە تارادەیەک جیاوازیان هەیە لە شوێن لە تێڕوانینی ئەقلیدسیانەوە کە تیایدا دوورییەکان بەو جۆرەی کە ئێمە دەتوانین بیان پێوین ناشێت بە سەرنجدان و لێوردبوونەوە دیاری بکرێن، گەرچی شوێنی راستەقینەی ئێمە بە جۆرێکی وردەکاریانە شوێن بێت لە روانگە ئیقلیدسەوە یان هەر جۆرێکی تر بێت لە شوێن. بەمجۆرە هەڵوێستەکە بە تەواوی هەڵدەگەڕێتەوە یان پێچەوانە دەکرێتەوە، پێشتر ئەوە ئاشکرا بووە کە ئەزموون و تاقیکردنەوە یەک جۆر شوێنی بۆ لۆجیک بەجێهێشتووە، هەر خودی لۆجیکیش ئاشکرای کردووە کە ئەم تەنیا شوێنە شتێکی نەشیاوە. ئێستا لۆجیک زۆر بەش لە شوێن دەردەخات و بەو جۆرەی کە دەشێ لە ئەزموون و تاقیکردنەوە دووریان دەخاتەوەو ئەزموون و تاقیکردنەوەش تەنیا بە شێوەیەکی هاویەش بڕیاری نێوان ئەو شوێنانە دەدات. بەمجۆرە کاتێ مەعریفەی ئێمە لە بارەی شتێکەوە لەچاو ئەو مەعریفەیەی کە پێشتر چاوەڕوانکراوە کەمتر بووبێت.. ئەوە دەشێ مەعریفەمان لەو بارەیەوە بەشێوەیەکی بەربڵاو زیاد بکرێت. لەبری بەندکردن لەنێو چوار دیوارێکی تەسکدا کە دەشیا هەموو نهێنیەکانی نێو ئەو چوار دیوارە ئاشکرا بکەین، ئێمە خۆمان لە دنیایەکی کراوەی تەواو شیاودا دەبینینەوە. لە دنیایەکدا کە زۆر شت بە نەزانراوی دەمێنێتەوە چونکە زۆر شت هەیە کە دەبێ بزانرێن.

ئەوەی روویداوە لە باری شوێن و کاتدا ئەوە بۆ مەودایەکەو هەروەها بە ئاراستەکانی تر روویداوە. هەوڵدان بۆ وەسفکردنی گەردوون بە ئامرازی پرنسیپە پێشینەکان شکستی هێناوە. لۆجیک لەبری ئەوەی وەکو پێشتر ببێت بە بەربەست لە بەردەم شیان (ئیحتمالات)دا بووە بە بنەمای گەورەی رەهاکردنی خەیاڵ و چەندین ئەڵتەرناتیف نیشان دەدات کە نزیک دەکرێنەوە لە هەستی گشتی دوور لە بیرلێکردنەوەو تێڕامان، هەروەها ئەرکی بڕیاردان بە جێ دەهێڵێت بۆ ئەزموون و تاقیکردنەوە لە کاتێکدا کە بڕیاردان شیاو بێت لەنێوان هەموو ئەو دنیایانەدا کە لۆجیک بۆ هەڵبژاردنی ئێمە پێشکەشیان دەکات.

بەم شێوەیە مەعریفە بەگوێرەی ئەو شتەی کە بوونی دەبێت، دەبێتە شتێکی سنووردار بۆ ئەوەی کە ئێمە لە ئەزموونەوە فێری دەبین نەك بۆ ئەوە کە بە ڕاستی ئێمە دەتوانین تاقی بکەینەوە، لەوەدایە کە ئێمە بینیومانە، زۆر مەعریفە کە بە وەسفکردن پەیوەندی بەو شتانەوە هەیە کە ئێمە ئەزموونی راستەوخۆمان لەگەڵیاندا نیە، بەڵام لە هەموو حاڵەتێکی مەعریفەدا بە ڕێگای وەسفکردن ئێمە پێویستمان بە هەندێ پەیوەستکردنی گەردوونی هەیە کە توانامان بداتێ لەم یان لەو زانیاریەوە بۆ بەرهەم هێنانی بابەتێك یان (شتێك) لە جۆرێکی تایبەتی کە لە ڕێگای زانیاری ئێمەوە ئاماژەی پێکراوە. بەم شێوەیە لەگەڵ بەهێندگرتنی بابەتە (شت فیزیکیەکاندا بۆ نموونە ئەو پرنسیپەی کە زانیاری حسی نیشانەی بابەتە فیزیکیەکانە خۆی بریتیە لە پەیوەستبوونێکی گەردوونیانە، هەروەها تەنیا لە خاوێنی ئەم پرنسیپەدایە کە ئەزموون و تاقیکردنەوە توانامان دەداتێ بۆ وەرگرتن و بەدەستهێنانی مەعریفەی پەیوەست بە بابەتە فیزیکیەکانەوە. هەمان جێبەجێکردنەکان بۆ یاسای هۆ یان بۆ بەرزکردنەوەی ئەو شتەیە کە ئەوەندە گشتی نیە بۆ ئەو جۆرە پرنسیپانەی وەکو یاسای هێزی راکێشانی زەوی.

پرنسیپەکانی لەجۆری یاسای هێزی راکێشانی زەوی دەسەلمێنرێن، یان زیاتر بەهۆی یەککگرتنی ئەزموون و هەندێ پرنسیپی زیاتر چاوەڕوانکراو. بەم شێوەیە مەعریفەی زانینی دەروونی ئێمە کە سەرچاوەی هەموو مەعریفەیەکی ترمانە لە بارەی راستیەکانەوە دوو جۆرن:

مەعریفەی تەواو ئەزموونگەرانە کە لە بارەی بوون و هەندێ خاسێتی شتە تایبەتیەکانەوە پێمان دەڵێت کە ئێمە لەو شتانە ئاگادار دەبین، هەروەها مەعریفەیەکی پێشینەیی تەواو کە پەیوەندیەکانی نێوان بەشەکانی گەردوونمان پێشکەش دەکات و توانامان دەداتێ بۆ شت وەرگرتن لەو ڕاستیە تایبەتیانەی کەلە مەعریفەی ئەزموونگەریانەدا پێشکەش دەکرێن. هەمیشە مەعریفەی داڕێژراوی ئێمە دەوەستێتە سەر هەندێ مەعریفەی تەواو پێشینەییو هەروەها بەشێوەیەکی ئاسایی دەوەستێتە سەر هەندێ مەعریفەی ئەزموونگەریانە.

ئەگەر ئەوەی لەسەرەوە گوترا راست بێت ئەوە بەشێوەیەکی بنەڕەتی مەعریفەی فەلسەفی جیاواز نیە لە مەعریفەی زانستی. هیچ سەرچاوەیەکیتایبەتی ژیریتی نیە کە لەبەردەمی فەلسەفەدا کراوە بێت، بەڵام بۆ زانست مەسەلەکە جیاوازەو ئەو دەرئەنجامانەشی کە فەلسەفە بە دەستی دێنێت بەشێوەیەکی رادیکاڵانە جیاواز نیە لەو دەرئەنجامانەی کە لە زانستەوە بە دەست دێت ئەو خاسێتە بنەڕەتیەی فەلسەفە کە فەلسەفە دەکات بە بابەتێکی لێکۆڵینەوە کە جیاواز بێت لە زانست بریتیە لە ڕەخنە. ڕەخنە بە شێوەیەکی ڕەخنەگرانە ئەو پرنسیپانە تاقی دەکاتەوە کە لەزانستداو لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکارهێنراون. ئەمەش توێژینەوەی هەر ناکۆکیەك دەکات کە دەشێ لەم پرنسیپانەدا هەبێت و تەنیاش کاتێك پەسەندیان دەکات کە وەکو ئەنجامی بەدوادا چوونێکی ڕەخنەییانە بێت و هیچ هۆیەکی ڕەتکردنەوەشیان دەرنەکەوتووە، ئەگەر وەکو ئەوەی کە زۆربەی فەیلەسووفەکان بروایان هەبووە، ئەو پرنسیپانەی کە گرنگیان بە زانستەکان داوەو لە درێژەپێدانی ناپەیوەست دەرباز بوون توانایان هەبوو کە مەعریفەی




پێویستمان سەبارەت بە گەردوون بەگشتی پێشکەش بکەن، ئەم مەعریفەیەش هەمان داوای هەبوو لەسەر بڕوای ئێمە هەمان شێوەی ئەو داوایەی کە مەعریفەی زانستی هەیەتی، بەڵام بەدواداچوونی ئێمە هیچ جۆرە مەعریفەیەکی لەم جۆرەی ئاشکرا نەکردووە، هەروەها وەکو دادەنرێت بڕوا تایبەتیەکانی میتافیزیکە جەسورەکان ئەنجامێکی سەرەکی نێگەتیفی هەبووە. بەڵام وەکو دانانی ئەوەی کە بە شێوەیەکی گشتی وەکو مەعریفە پەسەند بکرێت، ئەوە بڕوا تایبەتیەکانی ئێمە ئەنجامێکی سەرەکی پۆزەتیف دەبێت. ئێمە بە دەگمەن هۆمان دۆزیوەتەوە بۆ رەتکردنەوەی ئەم جۆرە مەعریفەیە وەکو ئەنجامی رەخنەسازیمان، هەروەها هیچ هۆیەکی وەهامان نەبینیوە بۆ دانانی مرۆڤ بە بێ توانا بۆ ئەو جۆرەی مەعریفە کە بە شێوەیەکی گشتی بڕوای بە بەدەست هێنانێتی.

بەهەر حاڵ کاتێ وەکو رەخنەی مەعریفە لە فەلسەفە بدوێین، ئەوا پێویستە سنوورێکی دیاری کراو دابنرێت. ئەگەر ئێمە پاڵپشتی هەڵوێستی گومانگەرایی تەواو بکەین و بە تەواوی خۆمان بخەینە دەرەوەی هەموو مەعریفەیەکەوەو لەو جێگایەی دەرەوەی مەعریفەدا بپرسین داخۆ پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ناو بازنەی مەعریفە ئەوا مانای وایە داوای شتێك دەکەین کە نەشیاوەو گومانگەرایشمان لەم کاتەدا هەرگیز رەت ناکرێتەوە. هەموو رەتکردنەوەکانی ئێمەش

پێویسته به بەشێك لەو مەعریفەوە دەست پێ بكات كە ئەوانەی رووبەڕووی یەكدەبنەوە بەشداری تێدا دەكەن. هیچ گفتوگۆیەك بە گومانكردنی تەواوەوە دەست پێناكات. لەبەرئەوە ئەو رەخنەی مەعریفە كە فەلسەفە بەكاری دێنێت ئەگەر هەر ئەنجامێك بەدەست بێنێت ئەوا ناشێت ئەو مەعریفەیە مەعریفەیەكی رووخێنەر بێت. هیچ گفتوگۆیەكی لۆجیكانە بەدژی ئەم گومانگەراییە رەهایە بەرەو پێشەوە ناچێت. بەڵام كارێكی هێندە گرانیش نیە كە ببینیت گومانگەراییەكی لەم جۆرە (نادروست) بێت. گومانی میتۆدیانەی دیكارت كە فەلسەفەی نوێ لەوەوە دەست پێدەكات لەم جۆرە گومانە نیە بەڵكو زیاتر جۆرە رەخنەیەكە كە ئێمە جەخت دەكەین بۆ ئەوەی ببێتە گەوهەری فەلسەفە. گومانی میتۆدیانەی دیكارت لە گومانكردن لە هەر شتێك كە وا دەركەوێت مایەی گومان پێكهاتووە. ئەویش بە لەسەر وەستانی هەر بەشێكی ئاشكرای مەعریفە بە پرسیاركردن لەخۆی داخۆ لە پێچەوانە كردنەوەدا دەتوانێت دڵنیا بێت كە بە ڕاستی ئەوەی زانیوە. ئەمەش ئەو جۆرە رەخنەیە كە فەلسەفە پێكدێنێ، هەندێ مەعریفە وەكو مەعریفەی بوونی زانیاری حسیمان بە تەواوی وا دەردەكەوێت كە هیچ گومانێكی تێدا نیە، هەرچەندە بە هێمنیو بە تەواوی ئێمە هەوڵبدەین بیخەینە نێو سنووری گومانەوە.

لەگەڵ بەهێزگرتنی ئەم جۆرە مەعریفەیەدا، رەخنەی فەلسەفی داوای ئەوە ناكات كە ئێمە لە بڕوابوون دوور بخاتەوە، بەڵام بۆ نموونە جۆرە بڕوای واش هەیە –وەكو ئەو بڕوایەی كە گوایە بابەتە فیزیكیەكان بە تەواوی زانیاری حسی ئێمە كۆدەكەنەوەو پێكی دەهێنن و ئەم زانیاریە حسیانەش پارێزگاریان لێدەكرێت هەتا ئەو كاتەی كە ئێمە دەكەوینە پێچەوانەكردنەوەیان، بەڵام دەشبینرێن كە وردە وردە دیار نامێنێن و لەناو دەچن كاتێ كە دەبنە بابەتی بەدواداچوونێكی داخراو. ئەم جۆرە بڕوا فەلسەفیانە داوای رەتكردنەوەمان لێدەكەن تا ئەو كاتەی هەندێ هێڵی نوێی بۆ پاڵپشت كردنیان ئەدۆزێتەوە. بەڵام بە گوێرەی رەتكردنەوەی ئەو بڕوایانەی كە وا دەرناكەون لە رووی هەر نارەزایی بوونێكدا كراوەبن، هەرچەندەش لە نزیكەوە ئێمە تاقییان بكەینەوە ئەوە هەر پەسەند دەرناچن و ناشبن بەو شتەی كە فەلسەفە بەرگریان لێ دەكات.

بە وتەیەكی تر مەبەستی رەخنە ئەوە نیە كە بە بێ هۆ بڕیاری رەتكردنەوە بدات، بەڵكو مەبەستی رەخنە ئەوەیە كە هەر بەشێك لە مەعریفەی ئاشكرا بە پێی جدیەتی خۆی دابنرێت و بنرخێنرێت. هەروەها رەخنە لە هەر شتێك لەوانەی كە هێشتا وا دەردەكەوێت كە مەعریفە بێت لەخۆی دەگرێت كاتێ كە ئەم دانان و نرخاندنە تەواو دەبێت. بەمجۆرە هەندێ مەترسی مانەوەی هەڵە پێویستە ئاسایی وەربگیرێت چونكە مرۆڤ شایانی هەڵەكردنە. دەشێ فەلسەفە بەشێوەیەكی پەسەند داوای ئەوە بكات كە مەترسی هەڵە كەم بكاتەوەو لە هەندێ حاڵەتیشدا ئەو مەترسیە زۆر بە بچووك پێشكەش بكات بە جۆرێكی ئەوتۆ كە لە رووی پراكتیكەوە بەهای نەبێت. لە دنیایەكیشدا كە دەبێ هەڵە روویدات ناشێت ئەو مەترسیە لەوە كەمتر بكرێتەوە. هەروەها بەرگریكردنی وریایانەش لە فەلسەفە ناشێت لەوە زیاتر پێشكەش كرابێت.

## سەرچاوە:

*Bertrand Russell- The prablems of philosophy*

*London- Oxferd University press- 1957- p.p.141-152.*

# ڕەچەڵەکەکانی ئاین لە منداڵدا

■ ئیلکایند

● و. لە ئینگلیزیەوە: یاسین قادر سەعید

هەموو دەزگـا کۆمەڵایەتیـەکان، زانستـی بن، هونـەری، یـان ئـاینی، دەتوانرێـت دابـنرێت بـەو سـازاندنە دەرەکیانـە (externalized adaptation)ی خزمـەتی هـەردوو تاکە کـەس و کۆمەڵگا دەکەن. لـە گۆشـەنیگای تاکە کەسـەوە دەزگاکانی چارەسەری ئامادەکراو پێشکەش بـەو ململانـێ حەتمیانـە دەکـەن لەگـەڵ واقعـی کۆمەڵایەتیو ماددیدا هەیـەتیو لە ڕەوتـی ژیاندا ئێخـەی مـرۆڤ دەگـرن. دەزگـا کۆمەڵایەتیـەکان بـەهۆی هەوڵـە سـازێنەرەکانی کۆمـەڵگاو تاکـە کەسەوە دەسـت پێدەکـەن و گەشـەدەکەن. بـەم شێوەیە، پێویسـتە هـەر لێکدانەوەیـەکی تـەواوی ڕەچەڵەکەکانی ئاین، مامەڵـە لەگـەڵ پرۆسـەکانی سـازاندنی هەریـەک لـە تـاك و کۆمـەڵدا (Processes of adaptation) بکات.

لـەم بەشـەدا، پێشـنیاری ئـەوە دەکـەم، ڕەچەڵەکەکانی ئاین تەنـها لـە گۆشـەنیگای تاکە کەسەوە، نەك کۆمەڵگا، شی بکەمەوە. هیـوادارم بتـوانم ئـەوە ڕوون بکەمـەوە کـە ئـاین سـەرەڕای هێڵە کۆمەڵایەتیەکەی، هێڵێکی فەردیشـی هەیـەو دەتوانرێـت سـەرچاوەکەی لـەنێو تواناکـانی پێویستی مەعریفیدا بدۆزرێتەوە، کـە لـە ڕەوتـی گەشەکردنی عەقڵیدا دەردەکەون. بە ڕادەی ئـەو پانتاییەی کە ئاین لـەناو هەوڵـەکانی کۆمـەڵگا لـە پێنـاو چارەسـەرکردنی ئـەو کێشـانەی بـەهۆی تواناکانی پێویستی فەردیەوە دروسـت بـوون، داگیری دەکات، ئێمە مافی ئەوەمان هەیـە باسـی ڕەچەڵەکەکانی ئاین لە منداڵدا بکەین.

مـن لـێرەدا وەسـفی چـوار لـە تواناکـانی پێویستی مەعریفی دەکـەم، لەگەڵ ڕەچـاوکردنی ئـەو تەمەنـەی کـە بـۆ یەکـەمین جـار تیـایدا دەردەکـەون، ئـەو کێشـانەی سـازان کـە ئـەو تواناینانە دروستی دەکـەن و، ئـەو چارەسـەرە بەرامبەرانەش کە لە لایەن ئاینەوە خراونەتـەڕوو.

بەشێکی ئەنجامگیری ئەم نووسراوەش، مەسەلەی بێهاوتای سازانە ئاینیەکان لە گۆشەنیگای تاکە کەسەوە چارەسەر دەکات.

## سەرهەڵدانی تواناکانی پێویستی مەعریفی لە منداڵدا

کاتێک وەسفی گەشەکردنی عەقڵی منداڵ دەکەین، وەسفەکەمان بە قورسی، بە ئاراستەی بەرهەمەکانی پیاژێ (Piaget) دەچەمێتەوە. ئەو تیۆرێکی گشتی دەربارەی توانای عەقڵی (intelligence) هێنایە کایەوە. تیایدا بیرکردنەوەی ئەرزەکان (adults) لە نێو فراوانبوونێکی لەسەرخۆی توانا عەقڵیەکانی منداڵدا، سەرچاوە دەگرێت. سەرەنجام، پیاژێ ئاماژەی بەوە داوە کە هەریەکێک لە توانا عەقڵیە نوێکان لەگەڵ خۆیدا، پێویستی ناسینی خۆی لە رێگەی کردارەوە (action) هەڵدەگرێت و، لە چوارچێوەی ئەو ناسینەدا لەگەڵ واقعە ماددیو کۆمەڵایەتیەکاندا ململانێ دەکات. هەریەکێک لەم جۆرە ململانێیە لە ناو ئەو گۆڕانکاریە بونیاد ئاسایانەدایە کە ئێمە ناوی گەشەکردنیان لێ دەنێین، لە بەرامبەردا رێگە بۆ ململانێی نوێو گەشەکردنی زیاتر لەناو دیالیکتیکێکی بێ کۆتایی خۆش دەکەن.

هەرچەندە لەوانەیە وا بێتە بەرچاو تیۆرەکەی پیاژێ بواری جێبەجێکردنە راستەوخۆکانی لەنێو پەرەسەندنی ئاینیدا بێت، بەڵام بێجگە لە چەند گوتارێکی کەمی پێشینەی (پیاژێ 1923،1930) تاکو ئێستا مامەڵەی لەگەڵ ئەو کێشەیەدا نەکردووە.

سەرەرای ئەوە، وا دێتە بەرچاو، زۆربەی ئەو رەگەزە هاوبەشانەی کە لە نێوان زۆربەی ئاینەکاندا هەن، چارەسەری گونجاوی هەندێک لەو ململانێیانە دەکەن کە تواناکانی پێویستی مەعریفی پیاژێ لە رەوتی ناسینیاندا دروستی دەکەن. من بەم شێوەیە کێشەکە دەبینم و بە پێویستیشی نازانم بزانین گەر پیاژێ بوایە چۆن چۆنی مامەڵەی لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا دەکرد.

بەرلەوەی زیاتر لەسەر باسەکەمان بڕۆین، ئەشێت لێرەدا چەند ڕوونکردنەوەیەک لەسەر چۆنیەتی بەرهەمهێنانی تواناکانی پێویستی مەعریفی لەلایەن کێشەکانی سازانەوە، (Problems of adaptation) کارێکی بەکەڵک بێت. هەر لەو ساتەوەی منداڵ فێری زمان دەبێت و تێگەیشتنی سەرەتایی دەربارەی هۆیەتی (Causality) بەدەست دەهێنێت، قۆناغە بەناوبانگەکەی بۆچی (Why) لە دایک دەبێت. هەر زوو زانراوە کە دایک و باوک ئەو جۆرە پرسیارانە نانرخێنن، بەتایبەتی کاتێک بەشێوەیەکی بەردەوام دووبارە دەبنەوە. دەشێت هەوڵەکانی منداڵ لە پێناو تێگەیشتنی هۆیەتیدا، ململانێ لەگەڵ دنیای ئەرزەکاندا بەرهەم بهێنێت. بە هەمان شێوە، کاتێک منداڵێکی چوار پێنج ساڵانە دەست دەکات بە ناسینی ئەو توانا دەرکەوتووە تیایدا، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پەیوەندیەکانی چەندێتی، جارێکی تر ئەم ناسینە دەبێتە هۆی دروست بوونی ململانێ لە نێوان ئەو و ئەوانی تردا.

بایەخ پێدانی بەردەوامی منداڵ بە مەسەلەی کێ زیاتری پێیە (Who has more?) مایەی بێزاریە لەلای دایک و باوکی یان کەسوکاری. بە کورتی، هەموو توانایەکی مەعریفی لەناخی خۆیاندا، ئەو ئاکارانە دەوروژێنن کە دەتوانن ململانێ لە نێوان منداڵ و دەوروبەرە ماددیو کۆمەڵایەتیەکەیدا بەرهەم بهێنن.

**قۆناغی منداڵی و گەڕان بەدوای پاراستندا:**

لەیەك دوو ساڵی یەکەمی ژیاندا، منداڵ گەشەیەکی ئاشکراو ڕاستەقینە بەخۆیەوە دەبینێت. دەبینین، ئەو منداڵەی کە تا دوێنێ ئۆرگانیزمێکی پشێو و کاردەرەوەیەکی سەرەتایی بوو، لەو ماوە کورتەدا بۆتە کیانێکی ڕێك و پێکی، قسەکەری، نیمچە کۆمەڵایەتی (Semisocialized) وەها، کە لە ڕووی عەقڵیەوە لە ئاژەڵە هەرە پێگەیشتووەکانی جۆرەکانی تر، پێشکەوتوو ترە. لەوانەیە لەناو دەستکەوتەکانی ئەم قۆناغەدا، هیچ شتێك ئەوەندەی ئەو دۆزینەوەیە گرنگی گشتی نەبێت، کە منداڵ بۆی دەردەکەوێت بابەتەکان (شتەکان) ئەگەرچی لەبەردەم هەستیارەکانیشدا ئامادە نەبن، بوونیان پارێزراو دەبێت، واتە دۆزینەوەی ئەوەی کە "بابەتەکان پارێزراون".

سەبارەت بە ئەرزە، کە لەلای ئەو جیهان و خود بە شێوەیەکی ئاشکرا سنووربەند (demarcated) کراوە، شتێکی گرانە ئەو هەڵوێستەی منداڵ وێنابکەین. ئەوپەڕی نزیك بوونەوەمان لێی بریتیە لە حاڵەتێك لە زیندەخەو (reverie) یان نیمچە وشیاری (Semiconsciosness) کاتێك سنوورەکانی بەئاگایی دەلەرێنەوەو خۆشمان چواردەور دراوین بەهەمان ئەو وێنانەی هەستیان پێ دەکەین. ئەمە حاڵەتە سەرەدیەکەی منداڵە، کە بە بۆچوونی ئەو سەراپای وشیاری گرانە لەوە زیاتربێت کە کۆمەڵە وێنەیەکی تەژمەو بە زنجیرەیەکی کت و پڕ، بەدوای یەکتریدا دێن. منداڵ تەنها بە شێوەیەکی لە سەرخۆ دەست دەکات بە جیاکردنەوەی کردەوەکان لە شتەکان (things) و پاشان جیاکردنەوەی نێوان شتەکان خۆیان، بۆ نموونە دەم و چاوی مرۆڤ. بگرە کاتێکیش کاردانەوە بەرامبەر دەم و چاو ڕوودەدات، بە شێوەیەکی گشتی لە دووهەمین و سێهەمین مانگی ژیاندا، هێشتا ئەو وشیاریەی نیە کە دەموچاوەکە بوونی هەیە، ئەگەر لەوێ نەمابێت. بۆ نموونە، ئەو منداڵەی کە بە ڕوویەکی خۆشەوە بۆ ئەو ئەرزەیە دەخەنێت کە لەلای بێشکەکەیەوە تێی دەڕوانێت، لە ناکاو وڕك دەگرێت کاتێك کە ئەرزەکە بە جێی دەهێڵێت و لە بەرچاوی ون دەبێت. لێرەدا منداڵەکە ناگری بەڵکو بە جۆرێك هەڵسوکەوت دەکات وا دەزانێت ئەرزەکە لە بووندا نامێنێت. (Piaget1952) منداڵ تەنها کاتێك بەرەو کۆتایی ساڵی دووهەمی دەچێت بەڵگەی ئەوەمان دەداتێ کە لەلای ئەو بابەتەکان ئێستا هەن و بەدەر لە ئەزموونی هەستکردنی ڕاستەوخۆی، بوونی هەمیشەیی تەواو سەربەخۆیان هەیە. لەم تەمەنەدا، منداڵ بەدوای شتەکاندا دەگەڕێت، بۆ نموونە، شکولاتەیەك، کە لەوەوپێش لێیان شاردۆتەوە.

ئەم وشیاریە هەمیشەییە یان پاراستنی بابەتەکان، لە کاتێکدا ڕوودەدات کە ڕێکخستنە پەرەسەندووەکانی هەڵس و کەوت دەبنە مایەی سەرهەڵدانی وێناکردنە ناوخودیەکان (internal)، یان وێنەی شتە بزرەکان کە لە ئەنجامی پاراستنیانەوە بەدەست دێن.

توانای پێك هێنانی بابەتە هەمیشەییەکان توانایەکی گرنگە، چونکە مەرجێکی سەرەکی هەموو ئەو چالاکیە عەقڵیانەیە کە لە دوایدا دێن. هەموو چەمکەکانمان بە شێوەیەك لە شێوەکان یان لە شتەکانەوە دەست پێ دەکەن یاخود بە دەوریاندا دەسووڕێنەوە، لەبەر ئەوە ناسینی

سروشتی هەمیشەیی ئەو بابەتانە، بە شێوەیەکی گشتی دادەنرێت بە خاڵی دەست پێکردنی گەشەکردنی عەقڵی. هەرچۆنێك بێت، هەمیشەیی بابەت تەنها یەکەمینی زۆر لەو جۆرە هەمیشەییانە یان پاراستنانەیە کە دەبێت منداڵ پێك بهێنێت. کاتێ توانا ئەقڵیەکان فراوانتر تووشی هەڵوێستی تازە دەبێت کە هاوتەریبن لەگەڵ ونبوونی شتەکاندا، هەرچەند لە ئاستێکی ئەبستراکتیانەی بەرزتردان. وەهمەکانیش (Illusions) لێرەدا جێگایەکی خۆیان هەیە. کەوچکێك لەناو پەرداخە ئاوێکدا وا دێتە بەرچاو کە چەماوەتەوە، لە ڕۆیشتنماندا مانگ وا دێتە بەرچاو بەدواماندا دێت و، خۆریش وا دێتە بەرچاومان کە بە دەوری زەویدا دەسووڕێتەوە. کێشەی لەم چەشنە خۆیان لە ئاستی کۆمەڵایەتیشدا دەردەخەن. بۆ نموونە دەبێت منداڵ فێر بێت جیاوازی بکات لە نێوان داوەتێکی ڕاستەقینە بۆمانەوە لە ماڵی هاوڕێیەکداو، داوەتێك کە لە ڕاستیدا دەرکردنێکی بە ئەدەبانەیە. لەم جۆرە حاڵەتانەدا پێویستە منداڵ جیاوازی بکات لە نێوان ڕووکەش (appearance) و واقعدا (reality)، لە نێوان چۆنیەتی هاتنە بەرچاوی شتەکان و چۆنیەتی ڕاستی هەبوونیان. بەم شێوەیە منداڵی شایەتی لەسەر، دەرکەوتنی توانایەکی عەقڵی نوێ، توانای مامەڵەکردن لەگەڵ بابەتە بزرەکان (absent objects) و پێویستی بەرامبەرەکەی (Corresponding need)، لەگەڵ گەڕان بەدوای پاراستندا، گەڕان بەدوای هەمیشەیدا لەناو جیهانێکی پڕ لە گۆڕاندا، دەدات.

یەکێك لەو کێشانەی پاراستن کە سەرەنجام دەبێت هەموو منداڵێك ڕووبەڕووی ببێتەوەو هەمووشیان خۆیانی لەگەڵدا بسازێنن، ئەو دۆزینەوەیە کە ئەوانیش و خۆشەویستەکانیشیان هەر هەموو دەبێت بمرن. بە پێچەوانەی پاراستنی بابەتەوە، کە سەرەتا ساتەوەختیەو تەنها لە دواییدا سیفەتی هەمیشەیی وەردەگرێت، منداڵ بەو باوەڕەوە دەست پێدەکات کە ژیان سەرمەدیەو نەمرەو ئەحەپەسێت، کاتێك بۆی دەردەکەوێت ژیان فانیە، دەبێت بێتە کۆتا. لە دوای بەدەستهێنانی ئەو توانا مەعریفیە سەرەکیە، منداڵ بە پەرۆشەوە هەوڵی بە دەستهێنانی ئەو ئامرازە دەدات کە بەهۆیەوە بتوانێت نەمری ژیان بپارێزێت، ئەو خولیایەی لە منداڵیەوە لە گەڵیدا دەستپێدەکات تاکو مردنی لێی جیانابێتەوە.

لە زۆربەی کاتدا، ململانێی نێوان گەڕان بە دوای پاراستن و حەتمیەتی مردندا، هەتاوەکو قۆناغی هەرزەکاری، ئاوێتە بوونی تەواوەتی بەخۆوە نابینێت. ئەو ئاینەی کە مرۆڤی لاو دەچێتە ژێر سایەیەوە، چارەسەرێکی ئامادەکراو دەخاتەڕوو. ئەمەش خۆی لە نێو چەمکی خودا یان ڕۆح دا خۆی حەشارداوە، کە تاکو ئێستا بۆتە وەڵامی کەونی ئاین سەبارەت بە کێشەی پاراستنی ژیان. خودا ئەو پاراستنە تەواوەیە کە سنوورەکانی بۆشایی (Space) و زەمەن (time) و هەبوونی جەستەیی تێدەپەڕێنێت. کەسی لاو لە ڕێگەی پەسەندکردنی خوداوە، لەو نەمریە (immortality)دا بەشداری دەکات و لێرەوە کێشەی پاراستنی ژیان چارەسەر دەکات. هەر

حاڵەتێکی تایبەتی پەسەندکردنی چارەسەری ئاینی، بە ژمارەیەکی زۆر لە فاکتەرە کەسیو سۆسیۆکلتووریەکان (Socioculture) دیاری کراوە. ئەوەی کە من لێرەدا حەز دەکەم جەختی بخەمە سەر ئەوەیە ئاین چارەسەرێکی دەستبەجێ پێشکەش بەو کێشە مرۆییە دەکات کە لەوە دەچێت کێشەیەکی کەونی بێت و لە ڕێگەی خولیای گەڕان بە دوای پاراستنی ژیان و ڕاستی مردنەوە خۆی دەردەخات.

### *قۆناغی منداڵی پێشینەو گەڕان بەدوای وێناکردندا:*

بە هەمان شێوەی قۆناغی منداڵی، قۆناغی پێش قوتابخانەش یەکێکە لە گەشەسەندنە عەقڵیە خێراکان و سنوورێکی بەرفراوان لە دەستکەوتە زەینیەکان، بەخۆوە دەبینێت. لە هەمووشیان گرنگتر، کارامەیی بەکارهێنانی زمانە. کە ئەمەش ڕوودەدات، منداڵ زۆر لە قۆناغی نواندنی شتەکان لە ڕێگەی وێنە ئەقڵیەکانەوە تێدەپەڕێت و زمان زنجیرە هێمایەکی ئاشنایە کە وێنەیەکی فیزیکی ئەو شتانە لەگەڵ خۆیدا هەڵناگرێت کە دەیانوێنێت. ئێستا منداڵ دەبێت هەوڵ بدات فێری وێنەکردنی هەموو ئەو بابەتە نەبێت کە بەگرانی لە یەکەمین ساڵی ژیانیدا پێکی هێناون. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم پەیوەندی کردنە تەنها بەهۆی نواندن لە ڕێگەی زمانەوە نایەتەدی، هێماکان دەتوانن بەجۆرێك کاربکەن هەندێك لێکچوون هەبێت لە نێوان خۆیان و ئەو بابەتانەی دەیانوێنن. لەم تەمەنەدا منداڵ بابەتە یاری ئاساکان دەخولقێنێت، پارچە تەختەکان دەگۆڕێت بۆ بەلەم و بەردە شێوە نائەندازەییەکان بۆ ئاژەڵ (پیاژێ1951). هەروەها لەم تەمەنەشدایە منداڵ جلوبەرگی ئەرزەکان لەبەردەکات و یاری ماڵ و قوتابخانە (house and school) دەکات، هەموو ئەو هەڵسوکەوتانە -کارامەیی بەکارهێنانی زمان و بەشداری کردن لە چالاکیە یاری ئاسا سیمبۆلیکیەکاندا- بەڵگەن لەسەر دەرکەوتنی توانایەکی مەعریفی نوێ، توانای بەکارهێنانی ئامڕازو سیمبۆلەکان، هەروەها بەڵگەن لەسەر سەرهەڵدانی پێویستیەتی نوێش، پێویستی گەڕان بەدوای وێناکردندا.

بەهەمان شێوەی گەڕان بەدوای پاراستندا، گەڕان بەدوای وێناکردن، کە لە قۆناغی پێشینەی منداڵیدا بەرجەستە دەبێت، بە درێژەی ژیان بەردەوام دەبێت. لەهەر یەکێك لە خاڵەکانی پەرەسەندندا، کەسی لاو پەرۆشی نواندنی ناوەڕۆکەکانی فکرو ئەوانەی دەوروبەری فیزیایی‌و کۆمەڵایەتیە. لەگەڵ گەشەکردنی هەر زانیاریەکی وردتر سەبارەت بە خودو جیهان، فۆرمی وردتری وێناکردن لە دایك دەبێت. نەك تەنها ژمارەی وشەکان بە شێوەیەکی نائاسایی فراوان دەبێت، بەڵکو پەرۆشیەکی سەرەتایش لە پێناو بەدەستهێنانی ئامرازی نوێی وێناکردن بەدی دەکەین، وەك ماتماتیك و هونەرە گرافیکیەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، هەتاوەکو منداڵ زیاتر وردبێتەوە لەو گەڕانەی بەدوای وێناکردندا، ئەنجامەکانیش زیاتر دوور لە قەناعەت دێنە بەرچاو.

بۆ نموونە، یەکێك لەو هۆیانەی کەوا لە منداڵ دەکات زۆربەی کات لە پۆلی پێنجەمدا واز لە وێنەکێشان بهێنێت بریتیە لەو دژواریەی کە لە نێوان ئەو شتانەدایە ئارەزووی وێنەکێشانی دەکەن و ئەو وێنانەی کێشاویانە. بەهەمان شێوە منداڵێك گەشەی جەستەیی و عەقڵی تەواو بێت بەوە دەزانێت زمان لە باشترین حاڵەتیدا ئامرازێکی ڕێگرە لەبەردەم گواستنەوەی بیرۆکەکان و بە شێوەیەکی نائومێدانە نالەبارە بۆ دەربڕینی هەستەکان.

سەبارەت بەو کەسە لاوەی خودای پەسەند کردووە، گەڕان بەدوای وێناکردندا، چەند کێشەیەکی تایبەتی دەخولقێنێت. ئەگەر ئەو ئاینە تەنها چەمکی خودای دەستەبەرکردو هیچی تر، ئەوا ئەو کەسە لە خستنەڕووی توانای تێپەڕێندا (transcendent) تووشی گومڕاهی دەبێت و سەری لێ دەشێوێت. سەرەڕای هەموو شتێك، ئەو شتەی کە ساتەوەختیو بێ شوێن و جەستەیی نیە، چۆن دەتوانرێ بەرجەستە بکرێ. لەگەڵ ئەمەشدا، ئاین لە چەمکی خودایەك زیاتر دەستەبەر دەکات، ئاین دەستەبەری وێناکردنەکانی تێپەڕێنیش دەکات. لە ئاینە سەرەتاییەکاندا (Primitive religions) وێناکردنەکان بریتی بوون لە تەوتەم (totem) و بتەکان (Idols)، لە کاتێکدا لە ئاینە ئاشکرا (revealed religions) هاوچەرخەکاندا، تێپەڕ لە ڕێگەی کتێبە پیرۆزەکانەوە، وێنەکانی خۆی بەرجەستە دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا، لێرەدا جارێکی تر، هەروەك حاڵەتەکەی چەمکی خودا، پەسەندکردنی تاکە کەسی چارەسەری ئاینی بە چەندین فاکتەر دیاری کراوەو لە حاڵەتێکی تایبەتیدا بە ئاستەم دەتوانرێت پەنجە بخرێتە سەر ئەو فاکتەرانە. ئەوەی لێرەدا پێویستە جەختی بخرێتە سەر، ئەوەیە هەر کاتێ خودا پەسەندکراو مەسەلەی وێناکردن سەر ئەنجامێکی حەتمی گەڕانە بە شێوەیەکی گشتی بەدوای وێناکردندا.

### *قۆناغی منداڵیو گەڕان بەدوای پەیوەندیدا:*

لە قۆناغی تەمەنی قوتابخانەدا (School-age-epoch)، منداڵ بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا دەکەوێتە ژێر کاریگەری فێرکردنە ڕەسمیەکانەوەو دەبێت ئاستێك لە زانیاری تێکستە ڕەسمیەکانی قوتابخانەو هەندێك کارامەیی تایبەتیش وەك خوێندنەوەو نووسین بەدەست بهێنێت.

بە دەستهێنانی ئەو جۆرە زانیاریانە سیستمێکی عەقلی وا دەخوازێت بەراورد ناکرێت لەگەڵ ئەو سستمە عەقڵیەی نەرزەکار کە زانیاری دەگوێزێتەوە یان دەیگەیەنێت. ئەو جۆرە سیستمە لە دەوروبەری تەمەنی شەش ساڵیدا دەردەکەوێت، "تەمەنی عەقل"[٣]ی تەقلیدی. ئەو توێژینەوانەی لەسەر منداڵ کراون ئەوەیان دەرخستووە کە ئەمە کتومت نیشانەیەکی گونجاوی دەستکەوتەکانی ئەم تەمەنەیە. تەنها لەم تەمەنەدایە منداڵ توانای پێکهێنانی ئەنجامگیریە لۆژیکیەکانی دەبێت (واتە بزانێت ئەگەر A گەورەتر بێت لە B و B گەورەتربێت لە C، ئەوا پێویستە A گەورەتر بێت لە C،

ئەگەرچی A و C بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆش بەراورد نەکرابن) و بتوانێت چینە پۆلێن (Nest Classes) بکات (واتە بزانێت، بۆ نموونە، کوڕان+کچان= منداڵان و، منداڵان–کوڕان=کچان و هتد..) (ئیلکایند 1961، 1964، پیاژێ 1952)

یەکێك لە سیماکانی ئەم توانا نوێیەی ئەنجامگیری لۆژیکی ئەوەیە، منداڵ لەم تەمەنەدا هەوڵ دەدات دیاردەکانی دنیا بەشێوەیەکی سیستماتیکی پێکەوە ببەستێتەوە. منداڵ لەم قۆناغەدا دەیەوێت بزانێت چۆن چۆنی شتەکان کاردەکەن، چیە سەرچاوەکانیان و، لەچی پێك هاتوون. ئێستا چەمکەکانی بۆشاییو زەمەن فراوان بوون و منداڵ دەتوانێت زەمەنێکی مێژوویی بەدەستبهێنێت و بزانێت ماوە دوورەکانی ئەو دیو سنووری وڵاتەکەی خۆی، وڵاتانی بێگانەن. ئەوکاتە بە هەستێکی تەواو ڕاستەقینەوە هەوڵ دەدات لەگەڵ ڕەچاوکردنی زەمەن و بۆشاییو هۆیەتیو ڕەچەڵەکدا، شتەکان پێکەوە ببەستێتەوە. لەبەرئەوە، ئەشێت شتێکی گونجاو بێت لەژێر ناوی توانای عەقڵی پراکتیکی (the capacity for practical reason)دا باس لەو توانایە بکەین، کە ڕووپۆشی قۆناغی تەمەنی قوتابخانە دەکات. بەهەمان شێوەش پێویستی بە هاوەڵەکەشی لەژێر ناوی گەڕان بەدوای پەیوەندیدا (the search for relations).

ئەو قۆناغەی باسمان کرد لە منداڵیەوە سەرهەڵدەدات و بە درێژایی تەمەن بەردەوام دەبێت. لەگەڵ پێگەیشتن کامڵ بوونی لاودا، پەیوەندیەکان بەو شێوەیە هەوڵیان بۆ دەدرێت کە لە لایەکەوە کەسەکە بە دەوروبەری کۆمەڵایەتی و فیزیکیەوە ببەستێتەوە لە لایەکی تریشەوە شتە دنیاییەکان (worldly things) و ڕووداوەکان پێکەوە ببەستێتەوە. سەرەڕای ئەوەی ئەم گەڕانە بەدوای پەیوەندیدا، زۆربەی کات مایەی ڕەزامەندیە، لە هەندێك حاڵەتیشدا دەبێتە مایەی نائومێدی. چەندین ڕووداو هەیە لە ژیاندا ناتوانرێت بە سادەترین شێوە پێکەوە ببەسترێتەوە بۆ نموونە پێچ و پەناکانی قەدەر (quirks of fate) و کارەساتەکان، لەو جۆرانەن بەرهەڵستی هەوڵەکانمان دەکەن. زۆربەی جار وەڵامێکی لۆژیکی شك نابەن سەبارەت بە پرسیاری (بۆچی ئەمە بەسەر مندا هات؟) لەبەر ئەوە، وێڕای ئەوەی گەڕان بەدوای پەیوەندیدا یارمەتی تێگەیشتن دەدات، لە هەمان کاتدا ئەوەش بۆ وشیاری زیاد دەکات کە مرۆڤ تاچ ڕادەیەك ناتوانێت بزانێت.

لەنێو کەشی ئاینیدا، دەبینین ئەو لاوەی چەمکی خوداو وێناکردنی کتێبە پیرۆزەکەی پەسەند کردووە، دووچاری کێشەی خستنە پەیوەندی خود لەگەڵ تێپەڕدا بۆتەوە. لێرەدا، سەرلەنوێ لە حاڵەتی ئامادەنەبوونی چارەسەرێکی ئامادەکراودا، ئەشێت ئەو کەسە سەری لێ بشێوێت و چارەسەری کێشەکە بە شێوەیەکی کاتی بەکاربهێنێت. هەر چۆنێك بێت، ئاین دەستەبەری ئەو ناوەندە دەکات کە بە هۆیەوە تاکە کەس بتوانێت پەیوەندی لەگەڵ خودادا بکات، چونکە نهێنی پیرۆزی خواپەرستی بۆ دەخاتەڕوو. بەو پێیە، لە ڕێگەی خواپەرستیەوە کەسی لاو دەتوانێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ تێپەڕدا بکات. بۆ دڵنیایی، پەسەندکردنی وەڵامەکانی

ئاین بەو کێشەیە، جارێکی تر، لە لایەن کەسی لاوەوە لە ڕێگەی چەندین فاکتەری جۆراو جۆرەوە دیاری دەکرێت. لە ڕاستیدا، هەندێك لە توێژینەوەکانمان (ئێلکایند & ئێلکایند 1962، لۆنگ، ئێلکایند & سپیلکا 1967) ئاماژە بەوە دەدەن کە زۆربەی لاوان خوداپەرستی ڕەسمی (formal worship) ڕەت دەکەنەوە، بەڵام خوداپەرستی تاکە کەسی (individual worship)یان لەلا پەسەندەو بەشداری تیادا دەکەن. لەلای ئەو هەرزەکارەی کە خوداو وێناکردنە پیرۆزەکانی نێو کتێبە پیرۆزەکەی پەسەندکردووە، مەسەلەی پەیوەندی کردن بەخوداوە، مەسەلەیەکی حەتمیەو شێوازی چارەسەرکردنەکەی بەلاوە گرنگ نیە.

## قۆناغی هەرزەکاریو گەڕان بەدوای تێگەیشتن:

گۆڕانکاریە فیزیکیو فیزیۆلۆژیەکان لە هەرزەکاردا، زۆر ئاشکران و بەردەوام تەژمی ئەو گۆڕانکاریە هاوشانە پڕ مەترسیانە دەکەن کە بە هۆی عەقڵەوە تووشی هەرزەکار هاتوون. وەك یەکێك لە ئەنجامەکانی ئەزموون و کامڵ بوون، سیستمێکی عەقڵی وەها لە دایك دەبێت کە دەستی کەسی لاو دەگرێت ئەو بیرکردنەوە زیرەکانەیە بە ئەنجام بگەیەنێت کە لۆژیکە بناغەییەکی منداڵ تێدەپەڕێنێت، یەکێك لەو بیرکردنەوە زیرەکانەیەی کە خۆی لەنێو توانای بەخۆداچوونەوە (introspection)دا دەردەخات، بریتیە لە ڕامان لەبەردەم هەست و بیرۆکەیەکدا وەك بڵێی بابەتی دەرەکین (external objects)، پاشان پشکنین و شیکردنەوەیان. یەکێك لە کارە پاڵەوانیەکانی تر بریتیە لە توانای پێکهێنانی نموونەی باڵا یان ئەو هەڵوێستانەی پێچەوانەی ڕاستین، تێگەیشتنی کۆمەڵگا یۆتۆپیاییەکان، هاوڕێ نموونەییەکان... هتد، سەرەنجام، ئەرزەکار بە پێچەوانەی منداڵەوە، دەتوانێت هەموو فاکتەرە شیاوەکان لە بەرچاو بگرێت و بە شێوەیەکی سیستماتیکی ڕادەی شیانیان تاقی بکاتەوە (ئینهێلدەر& پیاژێ 1968).

ناوەڕۆکی هەموو ئەم دەستکەوتە عەقڵیانە، بریتیە لە توانای پێکهێنان و بیرکردنەوە لەناو سنووری ئەو تیۆرە دەستەڵاتدارانەدا کەوا لە کەسەکە دەکەن نەك تەنها لە پەیوەندیەکان بەڵکو لە هۆکارە دیاریکەرەکانیشیان تێبگات. گەر لێکچوونێکی بایۆلۆژی بەکاربهێنین، دەڵێین لە کاتێکدا کە منداڵ بایەخ بە جۆرە جینیەکان (genotypes) دەدات، ئەرزەکار بایەخ بە جۆرە دەوروبەریەکان (phenotypes) دەدات، ئەو پرنسیپە دیاری کراوانەی کە چەندین دیاردەی بەڕووکەش جۆراوجۆر پێکەوە دەبەستێتەوە. لەبەرئەوە شتێکی سروشتیە ئەگەر ناوی پێك هێنانی تیۆر (theory construction) لە توانا عەقڵیەکەی ئەرزەکارو، گەڕان بەدوای تێگەیشتن. (Search for Comprehension) لە پێویستیە هاوەڵەکەی بنێین.

بە هەمان شێوەی تواناکانی تر، گەڕان بەدوای تێگەیشتن بە درێژایی ژیان دەمێنێتەوە، هەرچەندە لە هەریەکێك لە قۆناغە جیاجیاکاندا شێوەیەکی تایبەت بەخۆوە دەبینێت لە خولی ژیاندا. گەڕان بەدوای تێگەیشتن دا وەك تواناکانی تر، هەرگیز سەرکەوتنی تەواو بەخۆوە نابینێت،

هەموو هەوڵێکی نوێ پەردە لەسەر تەلیسمێکی نوێ لەبەردەم تێگەیشتندا ڕادەماڵێت. لە ئاستە ڕووی تاکە کەسیشدا هەمان شت ڕاستە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، هەرچەندە نەرزەکار لەم قۆناغەیدا چەمکێکی کەسایەتی وەهای لەلا دروست بووە کە دەبێتە مایەی تێگەیشتنێکی قووڵ لە خەڵکی، بەڵام خاڵە لاوازەکانی مرۆڤ (human foibles) و حاڵەتە نەشازەکان بەگژ ئەو گشتگیریە بەرهەڵستکارانەدا دەچنەوە. سەرەڕای ئەوە ئەم توانا تازە دۆزراوەیە یاریدەی بەخۆدا چوونەوە (self–scrutiny) دەدات، لێرەشدا هەرەسی بەردەوام بەدی دەکەین.

لە مەملەکەتی ئایندا، کێشەی تێگەیشتن بە شێوەیەکی سروشتی لە لای ئەو کەسانە سەرهەڵدەدات کە وێناکردنە پیرۆزەکەی خوداو نهێنی پیرۆزی خواپەرستیان پەسەند کردووە، کە دەرهاویشتەکەی سەرسوورمان و بێئومێدییە. سەرلەنوێ ئاین لە ڕێگەی کۆمەڵە ئەفسانەو خەرافەو مێژوویەکەوە چارەسەرێکی وەها ئامادە دەکات کە ببنە ئامرازێك بۆ تێگەیشتن لە خودا.

لە ئاینە هاوچەرخەکاندا، چارەسەرکردنی کێشەی تێگەیشتن لە ڕێگەی تیۆلۆژی (لاهوت) (theology) یەوە دەستەبەرکراوە. هەرچۆنێك بێت، لەوانەیە بەهۆی پێگەیشتن ئەو دەمەتەقێ تیۆلۆژیانەی (لاهوت) ئەمڕۆمانەوە بێت کە لاوان بە شێوەیەکی زۆر گرانتر لە جاران چارەسەری ئاینی بۆ کێشەی تێگەیشتن پەسەند بکەن. گەر مەسەلەکە سەبارەت بە تاکە کەس وەهابێت، کەواتە هەموو ئەو کەسانەی خوداو خواپەرستیان پەسەند کردووە، دەبێت ڕووبەڕووی کێشەی تێگەیشتن ببنەوە، بەچاوپرین لە چۆنیەتی چارەسەرکردنی.

*ئەنجامگیری*

لەوانەیە ئەو باسەی پێشوو گەلێك پرسیاری زیاتر بوروژێنێت، وەك لەوانەی کە تا ئێستا وەڵامی داونەتەوە، من هەوڵم داوە ئەخشەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو هاوچەشنیە نائاسایییەی نێوان چەندین توانای پێویستی مەعریفی سەرەکیو ڕەگەزە گرنگەکانی ئاینی دەزگائاسا (institutional religion) پێشکەش بکەم.

دەشێت بڵێین ئەم هاوچەشنیو گونجاندنە شتێکی ڕێکەوت نیەو ئاینیش لەلای خۆیەوە بۆ ئەوە دروست بووە چارەسەری ئەو کێشانەی سازان دەستەبەر بکات کە لە ڕێگەی ئەم توانا پێویستانەوە (needed capacities) دەرکەوتوون. هێندەی ڕاستی ئەو ئەنجامە، مافی ئەوەمان هەیە قسە لەسەر ڕەچەڵەکەکانی ئاین لە منداڵدا بکەین.

ئەو دروونناسانەی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی دیاردەی ئاینین (بۆ نموونە: ئۆڵپۆرت 1960، دەنلاپ 1946، جیمس 1902) هەر هەموویان لەسەر ئەو ڕاستیە کۆکن کە ڕەگەزی ئاینی بێ هاوتا لە ئارادا نیە.

هێندەی مرۆڤ بتوانێت دەرکی پێ بکات، ئەو پاڵنەرو ویژدان و سۆزو کارتێکەریە عەقڵیانە لە ئارادا نین کە بە شێوەیەکی بۆماوەیی ئاینی بن. ئەوەی زانایان لە سەری کۆکن ئەوەیە ڕەگەزە ئاینیەکان تەنها لەو کاتانەدا دەبنە ڕەگەزی ئاینی کە لەگەڵ دیاردەیەك لە دیاردەکانی ئایندا یەکیان گرتووە. لێرەدا هیچ شتێکی وەها

نەوتراوە لەگەڵ ئەو هەڵوێستەدا هاودژ بوەستێتەوە کە من خۆم تەواو لە گەڵیدا کۆکم.

سەرەڕای ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە ڕەگەزی دەروونی بێ هاوتا لە ئارادا نیە، شایەنی ئەو گریمانە بەدوور ناگیرێت (سازانە ئاینیە بێ هاوتاکان) لە ئارادابن. سازانەکان نە بەتەنها بۆماوەیین و نە تەنها لە دەوروبەرەوە دەست کەوتوون، بەڵکو بریتین لە دەرهاویشتەکانی تاکە کەس یان کارلێکی کۆمەڵایەتی. هەموو سازانێك بریتیە لە پێکهاتەیەی جێگە پەنجەکانی دەوروبەر، بۆ ماوەیی بەسەرەوەیە، و لە هەمان کاتیشدا ناتوانرێت بە تەنها بگەڕێنرێتەوە سەر هیچ یەکێك لەوان بە تەنها. هەمان شت سەبارەت بە سازانە ئاینیەکان ڕاستە. چەمکی خودا، یان بە شێوەیەکی گشتی تر، چەمکی تێپەڕ، ئەگەر سەرچاوەکەی لەناو دیاردەی مردندا نەبێت، ناتوانرێت بگەڕێنرێتەوە سەر گەڕان بەدوای پاراستندا. بە پێچەوانەوە، ئەگەڕان بەدوای پاراستن و نە دیاردەی مردن هیچیان لەخودی خۆیاندا ئاینی نین، سەرەڕای ئەوەش کە دەتوانن بە باشی بەشداری لە بەرهەمهێنانی ڕەگەزە ئاینیەکاندا بکەن. وەك بەرهەمهێنەرێك یان داهێنەرێکی ئاوازێکی مۆسیقی یان تابلۆیەك، تێپەڕ لەکۆی بەرهەمی هەموو بەشەکانی خۆی گەورەترە.

هەروەك زوو ئاماژەمان پێدا، پەسەندکردنی چەمکی خودا یان ڕۆح وەك پاراستنێکی تەواو، دەستبەجێ دەست دەکات بە لە ئەستۆگرتنی کێشە ئاینیە ڕەسەنەکان بۆ توانا دەرکەوتوەکانی تری پێویستی. لەبەرامبەردا، ئەم کێشانە دەتوانرێت لە ڕێگەی ئەو پێکهاتە ئامادەکراوانەوە چارەسەر بکرێت کە لە لایەن ئاینی دەزگاناساوە پێشکەش دەکرێت، بۆ نموونە کتێبە پیرۆزەکان، سرووتەکانی خواپەرستی، سیۆلۆژی. لەبەرئەوە لە ئاستە نیگای تاکە کەسەوە، چەمکی تێپەڕ کتومت خۆی لە نێو جەوهەری ئاینی تاکە کەسیدا حەشارداوە. هەرچەندە لە هەمان کاتدا، ئەگەر خودا بونیادێکی تاکە کەسی بێت یان ئەو بونیادە بێت لە ڕێگەی ئاینی دەزگاناساوە بەدەست هاتبێت، هەمیشە ئەو خاوەن بڕیارە، پێویستیە تاکە کەسیە تایبەتیەکان و ڕاستیە نائاساییەکان بەدەر لەوەی کە خۆی پەیدای کردبن تێدەپەڕێنێت.

**سەرچاوە:**

*The Origins of Religion In the Child p,97-104*

*ئەو ئاینەی کە باوەڕ وایە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە لایەن خوداوە فێری مرۆڤ بکرێت. *revealed religions*

❑

# کۆمەڵگەو دەسەڵات

# لەتیۆرەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی‌دا

■ جۆرج تەرابیشی

● و: شوان ئەحمەد

ئەوەی فیکری سیاسی لە سەردەمانی کۆن و ناوەڕاست دا پێیەوە سەرقاڵ بوو، سۆراخکردنی باشترین سستمێك بوو بۆ حوکمڕانی کردن بە بۆچوونی هەریەك لە ئەفلاتون و ئەرستۆ، یاخود گەڕان بوو لە دووی (یۆتۆپیا) بە دەربڕینی فارابی.

بەڵام فیکری سیاسی سەردەمی نوێ دابڕانێکی لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا دروستکرد بە ئاڕاستەیەکی گەلێك واقیعی تردا. ئاڕاستەیەك کە کاری گەڕان نەبوو لە دادپەروەرترین سستمەکان و ئەوەیان کە زیاد لە هەر سستمێکی دی دەقاودەقی فەزیلەتن، بەڵکو ئەرکی گەڕان بوو لە چۆنیەتی مومارەسەکردنی حوکم و مومارەسەکردنی سیاسەت وەکی خۆی کە هەیە. بەم پێیە دەکرێت نیکۆلۆماکیاڤیل (1469–1527) بە باوکی دامەزرێنەری نوێگەری سیاسەت دابنێین. خاوەنی کتێبی "میر" بەر لەهەر شتێکی دی بایەخ بە تەکنیکی حوکم دەداو، بەلای ئەوەوە گرنگ ئەوە نیە بپرسین: میر بۆچی حوکم دەکات؟ بەڵکو پرسیارەکە ئەوەیە کە چۆن حوکم دەکات؟ واتە بە بۆچوونی ماکیاڤیل ئەو کارەی سیاسەتی لەسەر دروست دەبێت و دامەزراندنی دەوڵەتی لێ دەکەوێتەوە بە شێوەیەکی گشتی کارێکی نائەخلاقیە. لەبەرئەوەی میر بۆ حوکمکردن یاخود بۆ دامەزراندنی دەوڵەت ڕێگاچارەیەکی دیکەی لە بەردەمدا نیە، جگە لە

بەکارهێنانی هێز یان فەتحکردن نەبێت. بەکارهێنانی هێز لەو هەرێمانەی بە میراتی بۆی جێماوەو فەتحکردنیش لەو ناوچانەی لە دەرەوەی سنووری دەسەڵاتیدان. لە هەردوو حاڵەتەکەش دا وەک یەک میر بۆ ئەوەی درێژە بە دەسەڵاتی حوکمڕانی خۆی بدات دەبێت هێزو



ئەرستۆ و ئەفلاتون

فرت و فێڵ بەکاربهێنێت.

بەڵام بۆچی هێزو فرت و فێڵ؟ لەبەر ئەوەی ئەوانەی حوکم دەکرێن مرۆڤن و مرۆڤیش خەسڵەتێکی شەڕانگێزانەی هەیەو، وەك بوونەوەرێکی سروشتی لە هەموو شتێکی ئەخلاقی یان کۆمەڵایەتی داماڵراوە. لە کاتێکدا وا پێویست دەکات "میر" وێنەی خۆی بشارێتەوەو تەنها بە دەمامکی شکۆداریو فەزیلەتەوە دەربکەوێت، ئەوا مەحاڵە بەتایبەت گەر حوکمڕانێکی تازە بێت ڕەفتارەکانی خۆی پابەندی هەموو ئەو بنەما چاکەخوازیانە بکات کە دەستەو دایەرەکەی لێی چاوەڕوان دەکەن. ئەو بۆ ئەوەی لەسەر کورسی دەسەڵات بمێنێتەوە وەك ماکیاڤیل لە نەسکی هەژدەهەمی "میر"دا باسی دەکات، هیچ ڕێگاچارەیەکی دیکەی لە بەردەمدا نیە جگە لەوەی کە (دژ بە مرۆڤایەتیو دژی بنەماکانی سۆزو بەزەییو، بگرە دژ بە ئاینیش) ڕەفتارو هەڵسوکەوت بکات. میر گەر لە تواناىدا بوو پێویستە لەسەر ڕێگای خێرو چاکە لانەدات، بەڵام هاوکات ئەوەشی لەسەرە لەکاتی پێویست دا (بزانێت چۆن ڕێگای خراپە دەگرێتەبەر).

بەم جۆرە سیاسەت لەگەڵ ماکیاڤیل دا لە هەموو پاساو و بەهانەیەکی تیۆلۆژی یاخود میتافیزیکی بەتاڵ دەکرێتەوە. لە کاتێکدا لەوە دەردەچێت کە وەکو ئامرازێك بەدەستی خواوەندەوە بمێنێتەوە، لە هەمان کاتدا لەوەش دەکەوێت لافی دەست پاکێتی لێ بدات. لەبەر ئەوەی دەسەڵات دیاردەیەکی تەواو ئینسانیە، ئەوا تەنها لە ڕێی هێزو خوێنەوە بەدەست دێت و پارێزگاریشی لێ دەکرێت. بەڵام ئاخۆ ڕوتکردنەوەی سیاسەت لەو بەهایانە جۆرە پاکژکردنەوەیەکی نیە؟ سیاسەت دوای ئەوەی هەموو بەرگە ئاینیو ئەخلاقیو میتافیزیکاییەکانی لەخۆی داماڵی، دەیتوانی دەست بە خوێندنەوەیەکی بێ پێچ و پەنای خۆی بکات. لەگەڵ هاتنی ماکیاڤیلیش دا بواری ئەوە دەڕەخسێت تا سیاسەت پەلکێش کرێتە ژێر باری شیکاریی بابەتیو زانستیو دواجار ڕەخنە لێگرتنیشەوە. سەرەڕای ڕەخنەی توندی نێوەندە ئاینیە کاتۆلیکیو پرۆتستانیەکان پێکەوە لە کتێبی "میر"، بەڵام دواجارو لە سەدەکانی دواتردا بووە کتێبی ژوورسەری سەرجەم سیاسەتمەدارە گەورەکان: شارلی پێنجەم و هنری چوارەم و ناپلیۆن و تالیران.

ڕەنگە تۆماس هۆبز (1588–1679) گەورەترین درێژەپێدەری ئەو دیدگا ڕەشبینەی ماکیاڤیل بێت لە سەدەی شازدەدا. ئەم فەیلەسوفە سیاسیە ئینگلیزیە وەك ماکیاڤیل لە پرانسیپی (شەڕەنگێزیو خراپەکاری) سیاسەت و خودی مرۆڤەوە دەستی پێکرد. بەلای هۆبزەوە مرۆڤ بوونەوەرێکی خۆپەرستەو غەریزەیەکی درندانەی هەیە. بەو پێیەش کە مرۆڤ (گورگە بۆ برای خۆی) ئەوا ڕێگاچارەیەکی تر نیە جگە لە دەست تێوەردانی بەردەوامی دەسەڵاتی سیاسی لەکاتی پێویست دا، لە ڕێی بەکارهێنانی توندوتیژیو هێزەوە بۆ ڕێگاگرتن لەوەی کۆمەڵگە ببێتە گۆڕەپانی (شەڕی هەمووان دژ بە

هەمووان). بۆ ئەمەش دەوڵەت و تەنها دەوڵەتی خاوەن هێز دەتوانێت کۆمەڵگایەکی سروشتی دڕندە بە کۆمەڵگەیەکی مەدەنی ژیاری بگۆڕێت.

ڕاستە هۆبز باس لە پەیمانێکی کۆمەڵایەتی دەکات، پەیمانێك کە فەردەکان پێکەوە بە خواست و ویستی خۆیان دەیبەستن بە مەبەستی دەست نیشانکردنی کەسی فەرمانڕەوا، بەڵام ئەم پەیمانە لە ناوەڕۆکدا پەیماننامەی ملکەچیە: چونکە فەردەکان بە پێی ئەوە دەستبەرداری مافە تایبەتیەکانی خۆیان دەبن لە بەرامبەر ئەو ئاسایش و دڵنیاییەی کەسی فەرمانڕەوا بۆ خۆیان و موڵك و ماڵاتیانی دابین دەکات. کەواتە ئامانجی وەها پەیمانێك کەمکردنەوەو سنووردارکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت نیە، بەڵکو پاساو هێنانەوەیە بۆ سروشتی ڕەهاو بێ سنووری ئەو دەسەڵاتەی ناوی دەوڵەتە، تا مومارەسەی خراپەیەکی کەمتری پێ بکات بۆ خۆ بەدوورگرتن لە شەڕو بەڵایەکی زۆرترو گەورەتر. نوێنەری بۆرژوازیەتی ئینگلیزی جۆن لوك (1633–1704) ئەم ئیشکالیەتەی هەڵگێڕایەوە. لای لوك ئەو پەیمانەی دەبێتە مایەی دامەزراندن و هێنانە ئاری دەوڵەت کارێکە خەڵکی بە ڕەزامەندیو خواستی خۆیان ئەنجامی دەدەن، ئامانجیش لێی دانانی ئەو سزایانەیە کە دەوڵەت دەیسەپێنێ بەسەر هەریەکێکدا کە دەست درێژی بکاتە سەر ژیان و موڵك و ماڵاتی خەڵکانی تر. بەم پێیەش ئەوانەی لە پەیمانامەکەدا بەشدارن مافی ئەوەیان هەیە لێی بکشێنەوە، هەر کاتێك هەستیان بەوە کرد کەسی فەرمانڕەوا لە جێبەجێکردنی ئەرك و



تۆماس هۆبز

فەرمانەکانیدا لە ئاستی پێویست دا نەبووە. بە پێچەوانەی دەوڵەتە دیسپۆتیزمیو ڕەهاکەی هۆبزەوە، دەبینین دەوڵەتی لۆکی دەوڵەتێکی لیبرالیەو دەسەڵاتیشی سنووردار و دیاری کراوە. پێویستە دەوڵەت بە کەمترین شێوە دەست لە کاروبارەکان وەربدات، تا بۆ خۆشی نەبێتە (ئەژدیهایەك) و کۆمەڵگەی مەدەنی هەڵلووشێت.

لێرەوە لۆك مافی یاخی بوونی فەردەکان لە دەوڵەت بە مافێکی ڕەوا دەزانێت، گەر هاتوو دەوڵەت لە سنووری خۆی چووە دەرێ. هاوکات لەگەڵ ئەمانەشدا لۆك یەکەم کەس بوو کە ئاوڕی لە مەسەلەی لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان دایەوە، بە مەبەستی ڕێگرتن لە زیادەڕۆیی دەسەڵاتی دەوڵەت.

ئەو داوای جیاکردنەوەی دەسەڵاتی یاسادانانی لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە دەسەڵاتی (فیدرالی) دەکردەوە، واتە ئەو




دەسەڵاتەی ئەرکی بەڕێوەبردنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی لە ئەستۆدایەو دەتوانێت بڕیاری شەڕو ئاشتیش بدات. هاوکات داوای ئەوەشی کرد دەسەڵاتی دەوڵەت لە دەسەڵاتی کڵێسا جیابکرێتەوە، بە مانای جیاکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی بە شێوەیەکی گشتی لە دەسەڵاتی ئاینی -بەمەش لۆک بە یەکەم تیۆرسینی عەلمانیەت دەدرێتە قەڵەم-.

لە فەرەنساش شارل مۆنتیسکیۆ (1689-1755) گەڕایەوە سەر هەمان بیرۆکەی لێک جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بە مەبەستی دەستەبەرکردنی دیموکراسیەتی دەوڵەت و ئازادی هاوڵاتیان. تایبەت بەم مەسەلەیەش دوو بۆچوونی خستەڕوو: تیۆریای (لێک جیاکردنەوەی ستوونی) و تیۆریای (لێک جیاکردنەوەی ئاسۆیی) دەسەڵاتەکان. لەسەر ئاستی ستوونی پێویستە دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی تایبەتمەندێتی خۆیانیان هەبێت و، سەربەخۆیی ڕێژەیی خۆیان بپارێزن وەك نوێنەری فەردەکانی کۆمەڵ لە بەرامبەر دەسەڵاتی سیاسیدا. ئاسۆییش پێویستە لە دەسەڵات جیابکرێتەوە بۆ: دەسەڵاتی یاسادانان، جێبەجێکردن، قەزائی، بە مەبەستی ڕێگرتنی پێشوەخت لە ئەگەری هاتنە ئارای دەسەڵاتی دیسپۆتیزمی. چونکە سروشتی دەسەڵات وەهایە زیادەڕۆیی لە بەکارهێنان و بە گەڕخستنی دەسەڵاتدا بکات، بۆیە دەبێت لە ڕێی لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانەوە، لەسەر هەردوو ئاستی (ستوونیو ئاسۆیی) بە دەسەڵات ڕێ بە دەسەڵات بگیرێت و سنووردار بکرێت.

جان جاك ڕۆسۆش (1712-1778) لای خۆیەوەو لە پێگەیەکی ئایدیالیانەوە بیرۆکەی پەیمانی کۆمەڵایەتی داڕشت. لای ڕۆسۆ پەیمانی کۆمەڵایەتی پەیمانی ئازادیەو، شێوازێکی کۆبوونەوەی سیاسیە کە فەردە ئازادەکان لە چوارچێوەی ئیرادەیەکی گشتیدا ڕێك دەخات. ملکەچکردن بۆ ئەم پەیمانە لە لایەن فەردەکانەوە بە مانای ملکەچکردن دێت بۆ خودی خۆیان و، وەك پێشتریش ئازادی خۆیان دەبێت و سەربەستیان پارێزراو دەبێت.

گوێڕایەڵی کردنی یاسا بەوپێیەی پەیمانەکە ڕێکی دەخات، بۆ خۆی بریتیە لە ئازادی، بەڵام ئەم ئازادیە ئازادیەکی ئەقڵانیە (ئازادی

هاوڵاتیەکە لەو جێگایەدا دەوەستێت کە ئازادی ئەوانی تری لێوە دەستپێدەکات). ئەمانویل کانت (1724–1804) مەزنە فەیلەسوفی ئەڵمانیا لە سەدەی هەژدەدا، گەڕایەوە سەرهەمان تێزەکەی هۆبز کە دەڵێت: مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا خۆپەرستی‌و شەڕانگێزی بەسەریدا زاڵە. بەڵام کانت لەبری ئەوەی دژایەتی ئەم دۆخە بە دەوڵەتێك بکات کە خاوەن دەسەڵاتێکی ڕەهابێت، بە دەوڵەتی یاسا کەوتە دژایەتیکردنی. یاسا بە فیعلی پێی وایە مرۆڤ شەڕانگێزە وەك ئەوەی هۆبز وێنای کردووە، بەڵام هەر یاساشە مرۆڤ ناچار دەکات ڕێگای سەربەست و ئازاد هەڵبژێرێت. ئەمەش مانای وایە یاسا دەتوانێت تەنانەت حوکمڕانی گەلێك لە ئەهریمەنیش بکات.

لەبەرامبەر دۆخی شەڕو پشێویدا کە دۆخی سروشتییە، حاڵەتی یاسایی دەتوانێت نەك تەنها ئاشتی‌و ئارامی لە نێوان فەردەکاندا بێنێتەدی، بەڵکو لەباریدایە لە نێوان نەتەوەکانیشدا ئەو کارە ئەنجام بدات. کانت بۆخۆی بیریارێکی گەردوونی بوو، لەگەڵ ئەویشدا چەمکی (دەوڵەتی یاسا) دەلالەتی پڕاوپڕی خۆی وەرگرت، وەك دەوڵەتێك بۆ ئاشتی‌و ئەقڵ و ئازادی.

سان سیمۆن (1760–1825) ئیلهام بەخشی سەردەمی پیشەسازی نوێ‌و باوکی ڕۆحی تەواوی ئاقارە سوسیالیستیەکان، کەوتە ڕەخنەگرتن لەوەی دەوڵەت بە تەنها دەزگایەکی سیاسی بێت و، لەبری ئەوە فۆرمێکی ئابووری-کۆمەڵایەتی پێشنیارکرد. بە بڕوای سان سیمۆن لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازیدا ئیتر سیاسەت ئاراستەی مێژووناکات، بەڵکو ئەوەی بەم کارە هەڵدەستێت ئابوورییە. بۆیە دەبێت سیاسەتمەداران جێگاکانی خۆیان بۆ ئابووری ناسان و تەکنۆکراتەکان چۆڵبکەن، تا خەون و ئاواتی مرۆڤایەتی بهێننەدی لەوەی ئیدارەی شتەکان جێگای مرۆڤ لە حوکمڕانیدا بگرنەوە.

بە پێچەوانەی ئەو توێژە کۆنەی سیاسەتمەدارانەو کە جگە لە خۆسازدان و خۆتەیارکردن بۆ جەنگ ڕۆڵێکی دیکەیان نەبوو، ئەوا چینی حوکمڕانی نوێ، کە پێویستە تەنها لە بەرهەم هێنەران بن، جگە لە چەسپاندنی ئاشتیەکی کۆمەڵایەتی‌و نێودەوڵەتی نەخشەو پلانێکی دیکەیان نابێت.

کارل مارکس (1818–1883) میراتگری (زانستی) سۆسیالیزمی یۆتۆبی، چینی بەرهەمهێنەران وەها دەستنیشان دەکات کە تەنها بریتین لە پڕۆلیتاریاو، ئەرکی پڕۆلیتاریاش لە مێژوودا ڕاماڵینی کۆمەڵگەی چینایەتی‌و سەرەو نگومکردنی دەوڵەتە (دەوڵەت بۆخۆی ئامرازێکی سیاسیە بۆ هەیمەنەکردنی چینی بۆرژوا بەسەر کۆمەڵدا)، مارکس ئەم ئەرکە دەخاتە ئەستۆی چینی پڕۆلیتاریاو بەکاری ئەوی دادەنێت. مارکس بە ئیعلانکردنی نزیك بوونەوەی لەناوچوونی دەوڵەت، ڕاستەوخۆ خۆی خستە بەرەی دژ بە هیگڵ، چونکە هیگڵ بنەمایەکی فەلسەفی تا ئاستی پەرستن و ستایش بۆ دەوڵەت دارشتبوو، بەو پێیە دەوڵەت باڵاترین نمونەی بەرجەستەبوونی ئەقڵە لە مێژوودا (بەتایبەت لە فۆرمە پروسیەکەی)دا.

فلادیمێر لینــین (1870–1924) خوێندکــاره ڕوسیە گەورەکەی مارکس، سەبارەت بە تیۆریای دەوڵەت دواجــار بــەلای هیگڵدا شکاندیەوە نــەك مارکس. واتە تێڕوانینی بۆ دەوڵەت هیگڵیانە بــوو زیاد لــەوەی مارکســی بێــت. ئەگــەرچی لینــین لــەڕووی تیۆرییـــەوە حەتمیــەتی لــەناوچوونی دەوڵەتی ڕاگەیاند لەگەڵ سەرکەوتنی یەکجارەکی شۆڕشی بەلشەفیدا، بەڵام ئەو سستمی حوکمەی خۆی تیۆریزەی بۆ کــردو بنــەما زانستیەکانی بــۆ داڕشــت (واتــە دیکتاتۆریــەتی پرۆلیتاریــا)، بــەوە گەیشت داکۆکی لە دەوڵەت بکات لە فۆرمە هــەرە ئیستبدادیە دزێو و ستەمکارەکەیدا. لــە مێژوودا ڕووی نــەداوە کــە دەوڵــەت کۆمەڵگــەی مــەدەنی سڕیبێتەوە، وەك ئەوەی لە سایەی ستالینیەت دا ڕوویدا.

نائومێدی ئــەزموونی بەلشــەفی کــە لــە ڕووی مێژووییـــەوە هاوشــانی ئــەزموونی هەریــەك لـــە فاشیزم نازیزم بوو، وەکــی پەرچەکردارێك دوایــن گــەورە قوتابخانــەی لــە قوتابخانــەکانی فیکــری سیاســی بەرهەمــهێنا: ئــەویش قوتابخانـــەی فرانکفۆرت بوو.

ئەم قوتابخانەیە لــە ساڵی 1931دا دامــەزراو، بۆ مــاوەی نیــو ســەدە بەرهەمــە فیکریــەکانی لـــەنێوان ئـــەڵمانیای زێـــدی خۆیـــان و وڵاتـــە یەکگرتووەکان لــە تاراوگــە بــەردەوامێتی هــەبوو. قوتابخانەی فرانکفۆرت لــە ڕێــی بیریــارانی وەکــی هۆرکهایمــەرو ئـــەدۆرنۆو مـــارکۆز و فـــرۆم و هاپرمازەوە تیۆریەکیان داڕشت کە لە فەسەفەی سیاســیدا بــە (تیۆریــای ڕەخنــەیی) ناوبــانگی دەرکرد. ئەمەش تیۆریایەکە پێکەوە هەریــەك لــە دیسپۆتیزمی ئایدیۆلۆژی سستمە تۆتالیتاریەکان‌و (دیسپۆتیزمی تەکنۆکراتی) کۆمەڵگــە خۆرئاواییــە پێشکەوتووەکان ڕەتدەکاتەوە.

ڕووخانی دیواری بەرلین و بلۆکــی سۆسیالیزم بوونە مایەی ئەوەی جارێکی تر ئیعتبار بۆ فیکری دیموکراسی بگێڕدرێتــەوە، بەتایبــەتی لــە فۆرمــە نیو –لیبرالیەکەیدا. بەڵام تــاڵی‌و ناهــەمواری ئــەو ئەزموونــەی ڕوســیای دوای یەکیــەتی ســۆڤیەتی جاران، نیشانەی پرسیارێکی تازە دروست دەکات ســەبارەت بــەوەی کــە دەوترێــت ســەرکەوتنی دیموکراسیەت کۆتایی مێژووە.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامـــەی (الحیـــاە) ژمـــارە (13074)–1998/12/20.

❑

# ڕەخنەو توێژینەوە



- ڕۆشنبیرو تاراوگە — ئەلیاس خوری
- لەستایشی ڕوون و ڕەوانیدا — ئیڤۆر براون





# ڕۆشنبیرو تاراوگە

■ ئەلیاس خوری
● و. لە ئینگلیزیەوە: ئەنوەر حەمە ساڵح

بە گوێرەی بۆچوونی ئەلیاس خوری، ڕۆشنبیری عەرەب تاراوگەیەکە. چۆن هزرو تاراوگەی یەکتری دەوڵەمەند دەکەن؟ چۆن لێکدانەوە بۆ ئەو باشووورە دابەشبووە* دەکات کە خۆی بەشێکە لێی؟ لەم کایەیەدا تەنها یەك تاکە کەسێتی (figure) دەردەکەوێت، ئەویش ئیدوارد سەعیدە، کە بە کارەکانی 30 ساڵی ڕابردووی بەشداریکردووە لە نەخشاندنی ڕەخنەیەکی دوانی (double) کلتووری خۆرئاواو جیهانی عەرەب.

کاتێك سەرقاڵی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوە بووم بۆ ئەو ڕۆمانەی کە دەینوسم (لە ماوەی سێ ساڵی ڕابردوودا) دەبوو زۆر جار سەردانی خێزانە فەلەستینیەکانی کامپەکان بکەم، بە تایبەتی ئەوەی بورج ئەلبەراجنە.

ئەوەی هەستی بزواندم لە بارەی ژیانی ئەو خەڵکانەوە کە بە ڕەچەڵەك سەر بە گوندەکانی جەلیلن و لە ساڵی 1948وە بەزۆر لە ماڵەکانیان وەدەر نراون -بە تەنها هەر بیرەوەریە دووروو درێژەکانیان و پەیوەندیان نەبوو بە زەمەنەوە، بەڵکو لە سەرووی هەموویەوە گردبوونەوەکانی ئێوارانیان بوو لە دەوری تەلەفزیۆن.

زۆر فیلمم بینی، بەڵام من وەك بینەرێکی بێگانە هەرگیز وێنەکە لەگەڵ خۆزگەکانمدا یەکانگیر نەدەبوو: نە وێنەی گروپەکان هیچ شتێك جگە لە وێنە نزیك گیراوەکانی ڕوخسارو بابەتەکان.

لە ڕاستیدا بەرهەمهێنە کامێراییەکە کە پاش ساڵانێکی زۆر ژیان لە تاراوگە شادومان بوو بوو بە وەرگرتنی مۆڵەت بۆ سەردانی وڵاتەکەی تا خاڵی بەرجەستە بوون لە بابەتەکان ورد

بوبوەوە، وەکو ئەوەی ڕێگە بە کامێراکە بدات دیمەنەکە هەڵلوشێت و زاڵبێت بە سەریدا، تاوەکو ببووە بەشێکی تەواوکەری چاو. ئەو قسانەی ئەم خەڵکە لەگەڵ یەکتر دەیانکرد کاتی دانیشتن بەرامبەر یەکتر لەبەردەم تەلەفزیۆندا پانۆراماکەی تەواوکرد.

هێشتا سەرسوڕمانەکەم گەورەتر بوو تەنانەت کاتێك بۆشم دەرکەوت ژمارەیەکی زۆری بینەرەکان سەر بەهەمان نەوەی من بوون. لەبەر ئەوەی ئەوان لە دەرەوەی وڵاتەکەیان لە دایك ببوون: ئەوکات لە خۆم پرسی: چۆن یادەوەریی تاراوگە دروست بوو؟ گوێم لە چیرۆکەکانیان بوو لە بارەی وردو درشتی ژیانی لادێیەك کە نەیانبینیبوو، ئەو ماڵانەی هەرگیز تیایاندا نەژیابوون، ئەو شەقامانەی هەرگیز پیایاندا گەشتیان نەکردبوو.

ئەو پەیوەندیەی لەنێوان وێنەو وشەکاندا لە دایك دەبوو یارمەتی دام بۆ بینینی تاراوگە بە ڕوانینێکی نوێوە: ئەوە تەنها بەهۆی وشەکانەوەیە کە وێنە دەتوانێت خۆی تەواو بکات، هەروەك ئەوەی وشەکانی هەموو ڕۆژەکان کەلێنەکانی واقیعێکی ناتەواو پڕ بکەنەوەو بەم جۆرە لە ڕێگەی یادەوەریەوە سروش بدەن بەژیان.

ئەو ڕۆژە، تێگەیشتم لەو شتەی کە زۆر زەحمەت بوو لە ساگا (Saga) (و: چیرۆکی ئەفسانە ئامێز)ی فەلەستینیو ڕۆمانەکانی کەنەفانیو حەبیبیو یاخود جەبرا، تێبیگەم. سەرەڕای جیاوازی شێوازی ئەدەبیات، هەموویان لەیەك خاڵی سەرەکیدا یەکدەگرنەوە ئەوە خاڵێکی ترسناکە کە هەموو ئەلیگۆرو سیمبۆلیزم تیایدا جێگەی ئەوە دەگرنەوە کە ڕاستەقینەیە، کە تیایدا کەسەکان شەکەتن و سیمبولەکان جێگایان گرتوونەتەوە بۆ وەسفکردنی ژیانیان.

بەهۆی خوێندنەوەوە، ئەم "کەسانە" قۆناغێکی دووەمی ژیانیان دەگوزەرێنن، قۆناغێك کە لە ڕۆمانەکەدا نەگوزەرێنراوە.

ئایا چیرۆکی هەموو ئەوانەی لە تاراوگەدان هەوڵدانێك نیە بۆ دۆزینەوەی ئەو فێڵەی کە یارمەتی تاراوکراو دەدات بۆ شکاندنی تەریکیەکەیو بێتواناییەکەی بۆ قسەکردن، بە یارمەتی زمانێکی هاوتەریب؟

لە نواندنەکانی ڕۆشنبیردا**، ئێدوارد سەعید جیاکاریەك دادەمەزرێنێت لە نێوان تاراوگەی بەکۆمەڵ و تاکەکەسیدا، لە نێوان خەڵکێك کە ناچار کراون خۆیان دابڕن لە ژینگەکەیان و ڕۆشنبیرێکی تاراوگە بوو، کە داهێنەری خۆی لەگەڵ ژینگەی نوێدا دەگونجێنێت، بەڵام سەرەڕای چالاکی ڕۆشنبیریی هەژێنەریی، ئێدوارد سەعید لە بیری دەچێت -یان با بڵێین لەبیری چوو- قسە لە بارەی ڕۆشنبیرێکەوە بکات کە تاراوگەی خۆی دەدۆزێتەوەو هەڵیدەبژێرێت. هەر ئەم ئیختیارەشە کە ڕێگەی دەدات ڕەخنەیەکی دوانی بەرامبەر ئەو دوو کۆمەڵگایە هەبێت کە بەشێکە لێیان.

ئەمڕۆ، ئەم حاڵەتە -کە زۆر دەگمەنە- خاڵی وەرچەرخانێکی یەکالاکەرەوە دەنوێنێت.

جۆرێك لە دووڕەگی (hybird) ئەفرێنەر دەنوێنێت کە ئەزموونی تاراوگەو کۆچکردن ئاوێتە دەکات.

لەسەر ئاستی ڕۆشنبیری، ئەزموونێك پێشکەش دەکات کە لە ڕەوتی گشتی لادەدات.

ئەو ڕێبازە مەیلێکی هەیە بۆ پۆلێن کردنی ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆ بۆ دوو پۆلی جیاواز: یەکەمیان ڕۆشنبیری میدیایە. ڕۆشنبیرێکی تایبەتمەندە کە بە گەشەسەندویی خۆی وەکو ڕۆشنبیرێکی "کردەیی" دەگوازێتەوە، لەبەرئەوە دەبێتە وێنەیەك بۆ ڕۆشنبیریەك، ئایدۆلۆژیای زاڵیش دەبێتە گوتاری.

جۆری دووەمیش ئەو ڕۆشنبیرە بێدەنگەیە، لە تاراوگە دەژی گەر تەنانەت لە وڵاتی خۆشی بمێنێتەوە.

وا دیارە ئەم دوو پۆلێنەی ڕۆشنبیر حاڵی حازر دەستیان گرتبێت بەسەر وێنەی ڕۆشنبیردا.

ڕۆشنبیری خۆرئاوا، وەکو ئەرکێکی کۆمەڵایەتی، لەسەر لێواری لەناوچووندایە بە قازانجی ڕۆشنبیری پسپۆڕە.

ڕۆشنبیری جیهانی سێ، زیاترو زیاتر بەرەو بێدەنگیەکی ڕەها مل دەنێت لە ساتە سەرکوتکەرو بارودۆخە دڕندانەکاندا، کۆنترۆڵکراو لەلایەن کوشتوبڕە بە کۆمەڵیەکان و زیندانەکان کە زیاتر لە گۆڕ دەچن.

لە کتێبەکەیدا، ئێدوارد سەعید قسە ناکات لەسەر ئیختیاری کەسی، بۆ بوون لە تاراوگەدا.

ئەم ڕەخنەگرو ئەکادیمیە تاراوگەی فەلەستینی پاش شەڕی شەش ڕۆژەی هەڵبژارد، نەك تەنها لەبەرئەوەی خۆی بە ڕەچەڵەك فەلەستینیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئامانجێکی دادپەروەری لە خۆگرتووە.

ئەوە لە نزیك بوونەوە لەم ئامانجەش بوو، کە سەرلەنوێ ئاشکرا کردنەوەی ڕۆڵی ڕۆشنبیر ڕوویدا.

ئەمڕۆ جیهان هەندێك جار یەکگرتوو و هەندێك جار پارچە پارچەیە. یەکگرتووە بەهۆی ئابووری جیهانگیریو هەژمونی مۆدێلی ئەمریکی کۆنترۆڵکراو لەلایەن میدیاوە، پارچە پارچەشە لە باشوور بەهۆی قەسابخانەکان و شیتاڵبونی کۆمەڵایەتی (Social disintegration)، کە تیایدا گەڕانەوە بۆ سەرچاوە وەردەگێڕدرێت بۆ فەندەمێنتاڵیزم.

لە یەکگرتندا پێداگرتنێك هەیە لەسەر پرسی شوناس کە لەکاتی قەیرانە ئابووریەکاندا تاودەسێنێت. هەستی ڕەگەز پەرستی بەرزدەبێتەوە دژی کۆچبەران و ڕەشەکان و کەمینە بێهێزەکانیش.

لە شیتاڵبوونیشدا، وەهمی ڕەچەڵەك ناسی هەیە، وەك شوناسێك کە شەرعیەت دەداتە قەسابخانەو هۆزگەریو ڕەگەزپەرستی داخراو بەناو خۆیدا.

ئەمڕۆ شوناس وەك چەمکێك خۆی گۆڕیوە بۆ چەمکێکی ئاڵۆز. لە لایەکەوە هەوڵدانێکە بۆ گشتگیرکردن و سەپاندنی یەك تاکە مۆدێل وەکو نوێنەری شارستانیەت. لەلایەکی ترەوە هەوڵدانێکی بەرگریکەرانەی ناتەواو و بێ هودەیە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەفسانە، بۆ ئاین، بۆ دانپیانانگەری confessionalism وەك گوزارشتێك بۆ غیابی قەیرانە مێژووییەکان کە لە باشوردا دەژی.

ئێدوارد سەعید ئامانجی فەلەستینیو شوناسی فەلەستینی هەڵبژارد، ئامانجیشی پرۆسەیەکە بۆ کۆنکرێت کردنی هزری فەلەستینی وەکو شەڕێك لە پێناوی ڕزگاری مرۆڤداو نەك

تەنها وەك شەڕێكی نەتەوەیی نێوان دووگەل كە بۆ زەوی و مافەكانیان و مێژوو دەجەنگن.

ئەم توێژینەوەیە ڕێگەی خۆشكرد بۆ نووسینی دوان لە بەرهەمەكانی: (ڕۆژهەلاتناسی‌و كلتور و ئیمپریالیزم) دەنگە سەرەكیەكانیشی دیاری كرد لە كتێبەكەیدا (پاش دوا ئاسمان، فەلەستینی دەژی) و هەروەها پرسیارە كلتووریە كورتەكانیشی لە ناوەڕاستی بە دواداچوونەكەیدا بەرزكردەوە لە وتەیەكدا كەنوێنەرایەتی پەراوێز خراوەكان و بێزراوەكان و لاوازەكان دەكات.

لەم ڕەخنە دوانیەدا، ئێدوارد سەعید نەبووە نێچیری فێڵەكانی لایەنگیری لە جیهانی سێهەم، وەك چۆن زۆر ڕۆشنبیری خۆرئاوا وایان بەسەرهات.

ئەو هەرگیز جیهانی سێی بە ئەفسانەیەك یان بە خەونێكی شۆڕشگێڕانە دانەناوە، بەڵكو وەك تێكەڵەیەك لە حەقیقەتە كۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و ڕۆشنبیریە پڕ لە هاودژیەكانە.

لە هەمان كاتدا ئالوودە نەبوو بە ڤایرۆسی پارێزگاری كردن لە بنەماكان، بە پێچەوانەی زۆر لە ڕۆشنبیران كە دەناڵێنن بە دەست هۆكاری كەڵەكە بوونەكانی خەڵەتاندن و نشوستی و دیكتاتۆرەكان، یان وەكو كاردانەوەیەك بۆ تاوسەندنی فەندەمێنتالیزمی ئیسرائیل.

لەم پرۆسەیەدا بوو كە تاراوگە دوانیەكەی لەدایك بوو. ڕەنگە كەسێك بپرسێت: "شوێنی لە تاراوگەدا چیە؟" ئایا ئەوە تەنها وێنەیەك نیە كە ناتەواوە، وێنەیەك كە لە وێنەیەكی ڤیدیۆی واقعێك دەچێت كە كامێرا بە تەنها تاڕادەیەك دەیگرێت؟ یان وردتر بڵێین، ئایا كۆششێك ئاشكرا دەكات بۆ تەرحكردنی دۆزێك بەو ڕێگەیەی كە وێنەكە خۆی دروست دەكات، لەبەرئەوەش ئایا بانگهێشتێكە بۆ شكاندنی بێدەنگی‌و سمینی یادەوەری ڕابردوو بە زمانی ئێستا؟

دەتوانین كۆچكردنەكەی سەعید بخەینە ڕیزی پرۆسەی ئەو كۆچە كلتووریە یەك لەدوا یەكەی كە گیرایە بەر لە لایەن ڕۆشنبیرانی عەرەبەوە لە كۆتایی سەدەی نۆزدەهەمیندا؛ لە كۆچكردنی نووسەرە لوبنانیەكانەوە بۆ ئەمریكاو كۆچكردنی ئەلئەفغانی بۆ پاریس، تا دەگاتە كۆچی بە كۆمەڵی ژمارەیەك لە ڕۆشنبیرانی عەرەبی تاراوگە، بوو.

ڕۆڵی سەرەكی ئەم كۆچكردنە بریتی بوو لە ڕەخنەكردنی دەسەلات و كلتور لە جیهانی عەرەبدا، بۆ بڵاوكردنەوەی هزرێكی نوێی شۆڕشگێڕانەو مۆدێرن بوو.

ئەوەی كۆچی سەعیدیش پێشكەشی دەكات ئەم ڕەخنە دوانیەیە..

لە لایەكەوە ڕەخنەی هەیە لە خۆرئاواو ستراكتۆرەكانی چەپاندن و بەخۆر ئاواییكردن. لە خوێندنەوەیەكی قووڵی میكانیزمەكانی هەژمونی خۆرئاوا بەسەر ولاتانی جیهانی سێ‌دا، ئەمە دەكات.

لە لایەكی ترەوە، ڕەخنە دەگرێت لە كلتوورو دەسەلاتی جیهانی عەرەب، فیلمەكان وێنەی ئەم تاراوگە فەلەستینیە گەورەیە ناگرن. بەلام پێ لەسەر ڕاستیەكی بنەڕەتی دادەگرن، ئەویش ئەوەیە ئەو خەڵكانەی لە خەیاڵی خۆیاندا دەژین لە دەرەوەی هەموو وێنەكانن.

چونکە ئەو کەسەی تاراوگە کراوە خۆی دەدزێتەوە لە شوێنی خۆی لە تاراوگەدا بەهۆی دروستکردنی زمانێکی نهێنیەوە، کە خەیاڵەکەی دەنووسێت، یادەوەری دەپارێزێت و مافی ژیانیشی پێەو دەکات.

کلتوور چیە گەر هەوڵدانێك نەبێت بۆ وەرگێڕانی ئەو زمانە نهێنیە بۆ زمانێکی دواو ئاوێتەکردنی بەردەوامی لە پرۆسەیەکی ڕەخنەیی دوانی‌دا، ڕەخنەیەك لە چەپاندن کە هەوڵدەدات خەیاڵ ڕابماڵێت، و ڕەخنە لەوەهم کە یادەوەریەکان وەردەگێڕێت بۆ مێژوو و شوناس، بۆ ڕەچەڵەکێکی جێگیرو ئاڵوگۆڕکەر.

کاتێك ئەم پرسیارانە لە خۆمان دەکەین، نابێت لە بیرمان بچێت کە تاراوگەی هەرە گەورە، تاراوگەی ئەوانەیە کە هێشتا لە وڵاتی خۆیانن. ئەوە ئەو جێگەیەیە کە کلتوور تیایدا لە پشت ئاستەنگەکانی ترس و بێدەنگیەوە گەمارۆ دراوەو تیایدا وشەکان دەگۆڕرێن بۆ ئازار، بۆ ئەوانەی هەوڵدەدەن بۆ شکاندنی تەریکی زمان، هەوڵدەدەن ئەندێشە سەربەست بکەن و -بۆ جاری یەکەم.. مافی قسەکردن بەدەست بهێنن.

لە کۆتایی کتێبەکەیدا، ئێدوارد سەعید بەزینی خواکان ڕادەگەیەنێت.

بەلام خواکانی دەسەلات و هەژموون تێك ناشکێنرێن، تا ڕۆشنبیر سەرکەوتوو نەبێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دەسەلاتە -هەموو جۆرەکانی دەسەلات- بە ئاوێتەکردنی وشەکانی لەگەڵ ڕیتمی بێدەنگی هەموو ئەوانەی ناتوانن قسە بکەن.

**تێبینی:**

*لێرەدا وشەی (باشوور) ئەو دابەشکردنە جوگرافیە ئابووریە سیاسیە کۆمەلایەتیە نوێیەی جیهانە بۆ باکووری دەوڵەمەندو پێشکەوتوو لە کلتورو ئابوریو زانستدا لەگەڵ باشووری دواکەوتوو و پاشکۆ لە جیاتی خۆرئاواو خۆرهەلات.

*The Represntations of the Intellectual* **

ناوی کتێبێکی ئێدوارد سەعیدە.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری *rive* ژمارە *71*ی ساڵی *1997*.

❑

# لەستایشی ڕوون و ڕەوانیدا

■ ئیڤۆر براون

● و. لە ئینگلیزیەوە: شێرزاد حەسەن

لەم سەردەمەدا قسەی ئەدەب لەسەر ئەوە نیە تۆ وەکو نووسەر مەبەست و نیازت چیە، هەر نووسەرێك کە زۆری بۆ هات، دەتوانێت بێباکانە شان هەڵتەکەێنێو بڵێ: ئەوەی دەینووسم هەر ئەوەیە، خوێنەریش بۆ خۆی سەربەستە چۆن نیازو مەبەستەکانم شیدەکاتەوە. دەکرێ نووسەر وەك ئەو ژنە سك پڕەی لێ بێ کە بە سەرنج و تێبینیەکانی خۆی ئاوسە. دەکرێ خوێنەر ئەو مامانە بێ کە لەو زان و لە دایك بوونە حاڵی بێو یارمەتی نووسەرەکەی بدات. گەر وەك نووسەر بتەوێ ئاشکراو ڕوون بدوێی، پێویست ناکات بەدوای بلیمەتی یان موعجیزەیەکدا بگەڕێی.

ڕستەیەکی لەو بابەتە لەلایەن (تی. ئێس. ئیلیەت)ەوە وتراوە، ئەو کاتە کە شانۆگەری (ئاهەنگی کۆکتێل)ەکەی لە (هارکۆت، برەیس) لە فیستیڤاڵی (ئێدنبرە)ی هونەری (1949)دا پێشکەش کرا. شانۆگەریەکە، پاشتر لە لەندەن و نیویۆرك بەوپەڕی سەرکەوتنەوە خرایە سەر شانۆ. دیارە نمایشەکەی نیویۆرك وەك بزانم تا ڕادەیەك دەقێکی ئاسانتری لێ هاتبووە بەرهەم و کلك و گوێی کرابوو. بەڵام ئەوەیان شاعیرێکی وەك (تی. ئێس. ئیلیەت)ی لاڵ نەکرد لەوەی وەڵامی ئەو خەڵکە بداتەوە کە بەوە تاوانباریان کرد کە وەك نووسەر تەم و مژاویە، ئەم لە وەڵامی ئەوەدا وتی کە نووسەر لەژێر هیچ مەرجێکدا نانووسێو ناچار نیە کە زیاد لە پێویست خۆی شی بکاتەوە. ئەرکی نووسەر هەر ئەوەیە کە بیرو بۆچوونەکانی، هەست و نەستی، خەیاڵ و ختوورەکانی بخاتە بەر چاوان: ئومێدیش دەکرێ کە بۆ هەر لێدوان و توێژینەوەو شیکردنەوەیەك، خەڵکی دەبێ بایی ئەوەندە هوشیاربن کە یارمەتی خۆیان بدەن لە تێگەیشتنی هەر دەقێك.

من وای دەبینم کە ئەم جۆرە قسەکردنە دوو حاڵەت دەردەخات:



ئەلیوت

تەمبەڵی، یان قسەیەکە لە ڕووکاری سۆزدارییەوە نزیکە. قسەیەکە لەسەر ئەوەی ئاخۆ نووسەر لەسەر عەرشی خۆی دابەزێ یان نا. ئەمەیان پەیوەندیدارە بەوەی کە نووسەر بزانێ چۆن بیر دەکاتەوە، چی لە مێشکدا هەیەو چۆن چۆنیش دەری دەبڕێ. دوا جاریش، مستەر ئێلیەت هەوڵی ئەوەی دەدا کە کۆمەڵێ گرفت و کێشەی تایبەت بە خوڵقی مرۆڤ و پەیوەندیەکانی بخاتە نێو دووتوێی دراماکانی، ئەم هەوڵی دەدا ڕۆڵی حەکیمێکی دەروونناس بدا بە مامۆستایەکی ئەخلاق. ئەم وەك شاعیرو نووسەر بەتەنها نەدەهاتە پای ئەو بیرو بۆچوونانەی کە لە قووڵایی رۆحدا قوڵپی گریان وەئاگا بێنێ، بەڵکو هەوڵی دەدا باس لە چارەنووس و خەڵاس بکات، هەموو ئەو مەسەلە گەورەو پڕ بایەخانەی کە هەقی ئێمەیە بە ڕوونی ڕاوبۆچوونی ئەو لەمەڕ ئەو مەسەلە مەزنانەدا چۆنە. ڕاستە کە ئەو لە نووسینی شانۆگەریەکی شیعریدا هەر زمانی گفتوگۆی بەکارهێناوە، بەڵام داڕشتنی دەمەتەقێیەك لەنێوان چەند کارەکتەرێك بە زمانی شیعر، گەر بێت و ڕوون و ڕەوان نەبێ، هەر دەکا هەڵاتن لە جۆرە بەرپرسیاریەك و ئەرکێك کە نووسەر مەرجە لە ئەستۆی خۆی بگرێ.

"سویفت" زیرەکانە لە پێناسەیەکیدا بۆ (شێوان) دەڵێ "چەند وشەیەکی گونجاو لە شوێنی گونجاودا" بۆ ئەم پێناسەیە من ئەوەی بۆ دەخەمەسەر "بیروڕای گونجاو لەنێو ستەمێکی گونجاودا". بۆ ئەوەیان هیچ مەحاڵێك لە ئارادا نیە. گەورەترین نووسەرانی پەخشان، لەلای من، لەم سەردەمەدا، نووسەرانێکی وەك "بێرناردشۆ" و "سۆمەرست مۆم"ن. ئایا هیچ کامێکیان ڕستەیەکیان نووسیوە کە وابێ خەڵك تێی نەگاو تەم و مژاوی بێ؟

گەرتۆ "ئەنتی-شۆ" بیت، دەتوانیت بێرناردشۆ بەوە تاوانبار بکەیت کە جگە لە شتی پڕوچووچ هیچی نەوتووە، بەڵام بۆ یەك چرکەسات دانامێنی تاوەکو بگەیت بەو حەقیقەتەی کە ئەو چ جۆرە پڕوپووچییەکی مەبەست بووە. گەر بە دیقەتەوەو زۆر بە ڕوونی بڕوانینە ئەو شتەی کە پێی دەوترێ ئەزموون و حیکمەتەکانی ژیان، لەوە تێدەگەین کە پوختەی کارەکانی "سۆمەرست مۆم"، لەوانەش -دەبڵ ڕۆژ-، کارێکە کە تا ئەمڕۆکە تێپەڕ نەکراوە. دووبارە دەیلێینەوە کە تۆ وەك خوێنەر، هیچ مەرج نیە، لەگەڵ بڕیارو بۆچوونەکانی ئەودا یەکدی بگرنەوە، یان لەگەڵ ئەو بەهایانەی کە ئەم بڕوای پێیان بووە، بەڵام زۆر بە وردی لەوە تێدەگەی کە ئەم وەك نووسەر قسەی لەسەر کام حوکم و بیرو بۆچوونێك کردووە، بەواتا جیهان بینیەکی ڕوون و ئاشکرای هەبووە.

با ئێستا نموونەیەك لە نووسینی نووسەرێکی لێڵ و وێڵ بێنینەوە کە بەڕای من هیچ پاساوێك بۆ ئەم جۆرە نووسینە نیە. ڕۆماننوسێکی وەك "مستەر هێنری گرین" لەمڕۆکەدا، بە پێوانەی

خوێندەوارانی سەر دەستەو ڕۆشنبیرانی پلەیەك حیسابێکی قورسی بۆ دەکرێ، ڕەنگە لەبەرئەوە بێ کە زۆر بەفیزەوە ڕێزمان و سینتاکس و خاڵبەندی ڕەت دەکاتەوەو سووك سەیری ئەم مەسەلانە دەکات. ئەوەتا لێرەدا، نموونەیەك لە ڕستەیەکی درێژی ئەودا دەخەینە بەرچاوتان کە لە لاپەڕەی یەکەمی چیرۆکێکی خۆیدا هەیە، ئەو چیرۆکەی زۆر ستایشی کراوە، بێفیزانە، ناوی لێناوە "هیچ":

*[ئەوسا تەڕو تووشی بوو، ئاخۆ ژنە ئەوەی بیر کەوتبۆوە کە پیاوەکەی دەیوت و دەیوتەوە، کەواتە پێچەوانەی ئەمەی وت، کابرا ڕووەو لای پرشنگی بەتینی پەنجەرەکە ڕووی وەرگێڕا، تەواو تاریك دادەهات کە فرمێسکی غەمهێنی سەر شووشەی پەنجەرەو شەقامەکانی ژێرابەکان هەرکە لە نزیك ئاگری ژنەکە دانیشتبوو چونکە "جێن" حەزی لە زەردەپەڕی تاریکی ئێوارە بوو، گڵۆپەکان داناگێرسێنێ تاوەکو وای لێ دێ بەرپێی خۆی نەبینێ کە دەجووڵێ، کەچی لە دەرەوە گڵۆپێکی سەر شەقام زەرد دەچۆوە، لەناو هەزارەها دڵۆپە بارانی سەر شووشەی پەنجەرەکە دەدرەوشایەوە، ئاگرەکە گوڵ بوو، (پێنیلۆپ)یش ماتە ژوورەوە.]*

شت هەیە لەوە نارێکتر؟ لەبەردەم بابەتێکی وا منالانەدا، پڕ لە شێوان، لە پاڵ خەراپ بەکارهێنانی خاڵبەندی، قوتابیەك پێی وەڕس دەبێ‌و سەری لێ تێك دەچێ. نووسەری ئەم پەرەگرافە هەر لە خۆیەوەو بێ پەروا فاریزەی فڕێداوە، هەرچی یاساو ڕێسای داڕشتن هەیە، حیسابی بۆ نەکردووە؛ ئەو جۆرە یاسایانەی بۆ ئەوە دروست بوون کە یارمەتی خوێنەر بدەن بۆ تێگەیشتن لەو بابەتانەی کە دەیخوێنێتەوە، بۆ ئەوە نەکراوە کە نووسەر پێیان سەغڵەت بێ. من وەك خوێنەرێك بابەتێکی وا بێسەروبەر ڕەت دەکەمەوە چونکە ناچێتە مێشکمەوە.

پاشان با ئاوڕێك لە نووسینێکی (مستەر تی. ئێس. ئیلیەت) بدەینەوە کە لەژێر ناوی (چەند سەرنجێك ڕووەو پێناسەکردنی کەلتوور) نووسیویەتی. جارێ سەیرێکی ئەو ناونیشانە بکە کە دیارە جۆرێك لە لێڵی‌و ترسنۆکی دەنوێنێ. ئەو نایەوێ وا خۆی دەربخات کە پێناسەی (کەلتوور) بکات، بەڵکو لە کتێبێکی (124) لاپەڕەییدا خنەخن بەدەوری ئەو پێناسەیەدا گیری خواردووە. لەم کتێبەدا ڕستەی ئاواهی بەدی دەکەی:

*[لەو ڕوانگەیەی کە من دەڕوانمە کەلتوورو ئاین، هەوڵ دەدەم کە ئاماژەی پێ بکەم، زۆر لەوە قورسترە کە دڵنیابم لەوەی خۆم دەیگرم و دەیگەمێ، مەگەر بە چەند سەرە قەڵەمێك، دەنا زەحمەتە لە هەموو مانا شاراوەکانی تێبگەم.]*

ئێستاکە لەوە تێگەیشتین کە نووسەرێك لەو بیروبۆچوونەیدا بەتەنها دەتوانێ هەوڵ بدا ئاماژەی بۆ بکات، پاشان خۆی دانی پێدا دەنێ کە ناتوانێ لەو ڕوانگەیەی خۆی تێبگات، بۆیە من وای بۆ دەچم کە هەقە ئەو نووسەرە هێمن و بێ دەنگ بێ تا لەوسەر لێشێوانە قوتاری دەبێ‌و بەرچاوی ڕوون دەبێتەوە. ئایا هیچ کەسێك خەیاڵی بۆ ئەوە دەچێ مامۆستای فیکرو زمانی ئینگلیزی ئاواهی دەمی تەتەڵە بکاو بەم شێوەیەش لەتر بدا؟ بەڵام لەوە دەچێ دان پیانان بە ناتوانایدا مانایەکی قووڵتر ببەخشێ، لێڵی لە بیرکردنەوەداو تەمومژ لە نووسیندا لەبری ئەوەی نوچدان بێ، بووە بە ڕەوانبێژی.

کەس نیە بتوانێ وای بنوێنێ کە زۆربەی ئەو شیعرە نووسراوانەی کە لە دوا چارەکی ئەم سەدەیەدا بڵاوبوونەوە: تەم و مژاوی نەبوون. هەر لە سۆنگەی ئەمەوەیە کە لە (بەریتانیا)دا ژمارەیەکی زۆریان بە کەڵکی بازاڕ نەهاتن. زۆر لە چاپگەرانی (لەندەن) نارازی بوون و وتیان "شیعر چاپکردن ماڵ وێرانیە"، دیارە بەتەنها یەك دوو شاعیری وەك (ئیلیەت) هەڵاوێرد "ئیستثنا"

کرابوون. (ئەنجوومەنی هونەر) لە لایەن کۆمەڵێ شاعیر کە تەواوێك بەم حاڵە هەڵچوو بوون، داوای یارمەتی لێکرابوو کە هەتا زووە فریابکەوێ، بەڵام ئەو ئەنجوومەنەش سەرگەرمی ئەوە بوو کە چۆن چۆنی خواوەندەکانی شیعرو ستران و هونەر، کە خەریکە زەردو سیس دەبن و دەمرن: زیندوو بکاتەوە. ئاخۆ دەکرێ ئەو دیوانانە لەسەر حیسابی گیرفانی خەڵکی چاپ بکرێن و بڵاو ببنەوە؛ لە کاتێکدا کە خەڵکێك ئامادە نیە بیانکڕێو بیانخوێنێتەوە؟

بەرگری کردن لە شاعیرانی (تەمومژ) پەرست کە ڕێزمان و ماناو سینتاکس ڕەتدەکەنەوە، بۆتە مەسەلەیەکی زۆر تێکەڵ و پێکەڵ، بەتایبەتی ئەو وەختەی دونیایەك وێنەی دەستکردو ساختەو ناجۆرە فڕێ دەدەنە نێو دووتوێی شیعرەکانیان. هەندێك لەوانەی دەبنە پارێزەری ئەم جۆرە شاعیرانە، هەر لە بنەڕەتەوە تۆمەتەکە ڕەت دەکەنەوەو نکوڵی لەوە دەکەن کە شتی وا هەبێ، ئەوانەی کە لە گۆرانی بێژانی "سپاسمۆدست" تێ ناگەن و ناتوانن ئەو قسە تێکەڵ و پێکەڵانە شیبکەنەوە، تاوانی ئەوەیان دەخرێتە پاڵ کە یا ئەوەتا تەمبەڵن یاخود گێلن؛ یان هەردووکیانن بەیەکەوە. گلەیی لەو خوێنەرە کەللەبەردینە دەکرێ کە مێشکی ئەوەی نیە وێنە جیاوازەکانی ئەو شیعرانە بەسەریەکەوەو بە ڕێکخراوی ببینێ، مەتەڵەکانی هونەر هەڵبێنێ، لەناو ئەو توونی بابای شیعرەدا ڕێ دەربکاو لە مانای وشەو ڕستەکان تێ بگات. بیانوویەکی دیکە ئەوەیە کە ئەم سەردەمە وەها تێکچووەو شڵەژاوە و کێشە ڕامیاریو ئابووریو ئەخلاقیو سایکۆلۆژیەکانی، وەها ئاڵۆزو تێکەڵ بوون کە زۆر زەحمەتە بۆ هەر کەسێك کە لەگەڵ سەردەمەکەی خۆیدا ڕاستگۆ بێ، بتوانێ وارێك و ڕەوان تەعبیر لەو سەردەمەو تەڵەزگەو قەیران و کێشە هەڵاوساوەکانی بکات.

بیانووی یەکەم نکوڵی کردن و ڕەتکردنەوەیەکی زۆر پەتی گوناهێکە، کە دیارە بیانوویەکی وا لەهۆڵی دادگادا سەری تاوانبار ڕزگار ناکات.

دووەمین بیانوو جەخت کردن و بەرگری کردنە لە بێ بەهرەیی و ئیفلیجی هونەری. جارێکی تر مەسەلەکە دێتەوە سەر قسەکردن لە دابەزینی نووسەر لەسەر عەرشی خۆی. هەرچەند کێشەکانمان ئاڵۆزتر بێ، وا پێویست دەکاو واش چاوەڕێ دەکرێ کە عەقڵەکان بایی ئەوەندەی بەتوانا بن، وەك نەشتەر تیژ بن و بچنە ناو جەستەی گرفتەکان و سندانەکان ببینین، دەبێ وابێ کە ماناو گەوهەری شتەکانمان بدەنێو لە قسەی پڕو پووچ ڕزگارمان بکەن، ناوکمان بدەنێو پەلك فڕێ بدەن.

یەکێك لە خووەکانی ئەو کەسانەی کە ناتوانن هەست و نەستی خۆیان دەربڕن ئەوەیە کە خۆ لەژێر وشەو ڕستەیەکی زۆر درێژدا دەشارنەوە، کە دواجار دەکەونە دوای مۆدەو بازارگەرمی ئەو ڕۆژگارە. لەم بوارەدا فەلسەفەی بوونگەرایی – وجودیەت– وای بەسەرهات و دەکرێ بڵێین نموونەیەکی ئاشکرای ئەم حاڵەتە بوو. هەرکاتێك یەکێك دێتە بەردەمم و پێم دەڵێ بوونگەرایی –



سۆمەرست مۆم

وجودیەت- ئاواو ئاوایە، دیارە ئەو کەسە چاوەڕێیە کە من سەری ئەوازشی بۆ دانەوێنم و بەو پەرشی سەرسامیو ترسەوە گوێی لێ بگرم، کەچی من یەکسەر مل دەخەمە بەر ملیو داوای لێ دەکەم کە پێناسەیەکی -بوونگەرایی-م بۆ بکات. وەلێ من لەهەموو ژیانما سادەترین وەڵامم دەست نەکەوتووە کە ڕازیم بکات.

ئەو ئەکتەرو دەرهێنەرانەی سەرگەرمی کارکردنن لەو شانۆگەرییانەی بۆنی بوونگەرایی - وجودیەت-یان لێ دێ خەڵکێکی زۆر سەیرن، گەر پێیان بڵێی واز لەو گارەگارە بێنن و مەبەستتان لەم هەرایە چیە؟ ڕێك وەڕەوان نیازتان چیە؛ ئەوە دەرببڕن، ئەوا بە تەواوی ئەبڵەق دەبن و سەریان لێ دەشێوێ. بە پێی ئەو ئەزموونەی من هەمە ڕەخنەگران و نووسەرانێکی زۆرمان هەن کە لەم دۆخە ناپوختەدا دەژین، بەناوی ئەوەی دەچنە قووڵاییەوە، خۆ لە تەمومژێکدا دەشارنەوە، ئاواهیش پتر خۆیان و دەقەکانیان لەلامان، ئاڵۆزتر دەکەن، بەتایبەتی کە دەیانەوێ لە ڕۆح و گەوهەرو ماهیەتی شتەکان نزیك ببنەوە، بۆیە کە داویان لێ دەکەن ئەوە ببێژن کە دەقاو دەق مەبەستیانە، لاڵ دەبن و هیچیان پێ ناگوترێ.

هەندێ جار بەرهەمهێنانی دەقی تەمومژاوی، دەبێ بە ڕێگەیەکی کورت بۆ جۆرێك لە پەیداکردنی ناوو شۆرەت لەلای خەڵکی، چونکە ئەوسا ئەو نووسەرەو دەقەکە دەبنە جێی مشتومڕ، خۆشتان دەزانن کە مرۆڤ گیانلەبەرێکە زۆر عاشقی گفتوگۆو دەمەتەقێیە. کارێکی فرە بەخێرو قازانجە کەسێك بتوانێ لە ڕێی نووسینی شیعرێك، شانۆگەریەك یان کتێبێك خۆی بکا بە سەرباسی سەرمێزو خوانەکان، شەوچەرەی هەموان. بۆ ئەو کەسانەش کە مامەحەمەیی دەکەن و دەیانەوێ وا پیشان بدەن کە ڕۆشنبیرن و لە دونیا حاڵین؛ زۆر خۆش دەبێ چەنەبازی بکەن و بەتۆ بڵێن کە ئەوان دەقاودەق دەزانن نیازو ئامانجی نووسەرەکە چی بووە، تۆش چونکە نازانی مەسەلە چیە، ناشتەوێ واخۆت پیشان بدەی کەدەیزانی، بۆیە ناچار دەبیت وەك کەسێکی ساویلکەو گێل گوێ بگریت و سەر بلەقێنی. لە ڕاستیدا مێژووی ئەو کەس و نووسەرانەی دەیانەوێ خۆیان زلتر پیشان بدەن لەوەی کە هەن، ئەوانەی کە لەنێو تەمومژدا خۆیان دەشارنەوەو وای دەنوێنن کە گەوهەریان ڕشتووە، ئەوانەی خۆ دەبەنە پێشەوەو ماستاو سارد دەکەنەوە، ئەوانەی بەدرۆ لاسایی لەخۆیان گەورەترو مەزنتر دەکەنەوە، ئەوانەی خۆ لە مەزنە نووسەران دەبەنە پێشەوە تا ناو پەیدا بکەن، ئەوانەی فیزێکی بەتاڵ بەو کەسانە دەفرۆشن کە گوایە لەخۆیان بچوکترن، ئەوانەی خۆیان لێ دەگۆڕێو کەچی هیچ نین.. بۆ ئەوانەو بۆ شتی لەو بابەتە چەندین کتێب بەشی ناکات تا ئەو مێژووە وەکو خۆی بنووسینەوە.

ئەو ڕۆژگارەی شاعیرێکی وەك "ڕۆبەرت براوننگ" ڕایگەیاند کە بە تەنها خۆی، وەك نووسەر، دەتوانێ لە مانا شاراوەکانی هۆنراوەی "سۆردێلۆ" تێبگات کە دیارە هی خۆی بوو، بەڵام هەر خۆی بە خوێنەرانی وت کە مەغزاو مانای قەسیدەکەی خۆی لە بیر چۆتەوە، لەو وەختەدا بەم قسەیەی بوارێکی باش و کاتێکی خۆشی بۆ دەورووبەرەکەی ڕەخساند، لەو سەردەمەدا هەر هەموان کەوتنە بەزمی هەڵهێنانی مەتەڵی ئەو قەسیدەیەو شکاندنی تەلیسمەکانی، ئەوپەڕی بلیمەتی و تواناو زرنگی خۆیان بەکاردەهێنا لەو مانایە تێبگەن کە شاعیر خۆی بیری چۆتەوە.

کەس نیە نکوولی لەوە بکات کە شاعیر هەمان حاڵەتی نووسەری پەخشان ناژی، ئەو پتر لەسەر ئەو شتانە کار دەکات کە بەهەر پێنج هەستەکە دەرکیان پێدەکات، کەواتە ئەو لەسەر هەستەکان دەلەوەڕێ، نەك لەسەر بیرۆکەو چەمکەکان، پتر ڕێگرێك لەبەردەمی شاعیردا نیە کە نەتوانێ وێنەیەکی ڕوون سەبارەت بە هەست و نەست و

سۆزی خۆیمان پێ ببەخشێ، هەست و سۆزێك لە ڕێی وشەوە بە ئێمە بگات.. دیارە کارامەترین شاعیرانی سەرزەمین توانیویانە ئەوە بکەن. ئایا ئێمە ئاگامان لەوەیە کە شاعیرێکی ڕۆمانسی وەك "کیتس" چۆن چۆنی سەیری (بولبولەکەی) کردووە یان لەبەرامبەر (گۆزەیەکی یۆنانی)دا چ هەستێکی هەبووە؟ بێگومان هەست بەو حاڵەتەی شاعیر دەکەین. دە باشە خۆ (کیتس) پێویستی بەوە نەبووە جەنگێك لە دژی (سینتاکس–پێکهاتە یان بەکارهێنانی وشە یان دەستەواژە لە ڕستەدا) بەرپا بکات، ئەو نەهاتووە بونیاتی ڕستە تێك بدات، ئەو نەهاتووە گۆڕ بۆ زمانەوان هەڵبکەنێ و لە ڕێی (سروودەکان)یەوە بۆ مەرگی ماناو ڕێزمان بلاوێنێتەوە.

ئەو کاتەی گوێم لە هۆنراوە ڕەش و پڕ خەمۆکیەکانی (ئەی. ئی. هاوسمان) دەبێ، قەت پێویستم بەوە نابێ سەری خۆم بخورێنم، یان بێم خاولی تەڕبکەم و بیخەمە سەر تەوێڵی گەرمم و مێشکم بگوشم تا بتوانم ماناو مەغزا لە شیعرێکی (تێنیسن) دەربێنم. هەندێ جار عەقڵی داهێنەر وا کاردەکات، وا خێرا کە دەستەکانی فریای هەڵڕشتنی بیروبۆچوونەکانی ناکەوێ، وای لێ دێ کە وێنەو خوازەو لێکچوون و وەسفە ئەدەبیو هونەریو ئیمیجەکان وا بەناو یەکدیدا دەچن کە هەر دەڵێی بەناویەکدیدا چوونی فارگۆنەکانی شەمەندەفەرێکە لە ڕووداوێکدا.

هەندێك لە بەرهەمە هەرە جوان و گەورەکانی "شکسپیر" وا دێنە بەرچاو. بەڵام دواجار دەڵێین کە هیچ شاعیرێکی گەورەو داهێنەر، گەر داهێنەر بێ، تەم ومژوای نیە.

خەڵکی بەگشتی، جگە لەو کەسانەی کە بەدرۆ خۆ بەزاناو دانا دەزانن، هەر هەموان حەز دەکەن گوێ لەو هونەرمەندانە بگرن و ئەو نووسەرانە بخوێننەوە کە تەواو ئاگای لە توانای عەقڵی و هونەری خۆیانەو زاڵن بەسەر ئامرازەکانی دەربڕین،



بێرناردشۆ

خەڵکی هەمیشە لەو هونەرمەندو نووسەرانە نزیك دەبنەوە کە دەیانکەن بە خاوەنی ئەو ماناو مەغزایانەی لە دووتوێی بەرهەمەکانیاندا هەن. ئەو هونەرمەندانەی هوشیاری نیازو مەبەستەکانی خۆی نەبێو نەزانێ، هەلگری چ فەلسەفەو بنەمایەکی فیکری و هونەریە، دەکرێ پێی بوترێ کەسێکە خۆ دەنوێنێ، یان خۆهەڵکێشە. خۆ گەر لەنیازو ڕازو مەبەستەکانی خۆی ئاگادار بێو بەڵام نەتوانێ دەریان ببڕێ، ئەوە جگە لە هونەرمەندێکی بێ توانانو بێ بەهرە هیچی دیکە نیە. هیوادارم کە منیش ڕێك و ڕەوان قسەکانی خۆم کردبێ.

**سەرچاوە:**


*Highlights of Modern Literature*

*Edited by: Francis Brown*

*Published in New American Library/ pages (36-39)*


❑

# لە ئەدەبی گەلانەوە





- بەردی هەتاو (شیعر) — ئۆکتاڤیۆ پاز
- چەپکە گوڵێکی چکۆلە — گابریل گارسیا مارکیز

# بەردی هەتاو

▪ ئۆکتاڤیۆ پاز
• و. لە فارسییەوە: یونس ڕەزایی

بەردی هەتاو لە چەند ڕستەیەکدا کورت ناکرێتەوە. چونکە وەك تەواوی شیعرە شاکارەکانی ئەم سەدەیە، ساختومانێکی وای هەیە کە خۆی ڕەخنەگری خۆیەتی. یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی هونەریی بەرهەمێکی ئاوا، ئەوەیە کە ڕەخنەگری پیشەیی لە ئاستیا وەك بوونەوەرێکی زیادی ئەبینرێ. تەنیا شتێك کە لە دەستی دێ ئەوەیە، شێوەیەك بۆخوێندنەوەی شیعرەکە پێشنیار بکاو ئیتر بێدەنگ بێ. یانی دەبێ هیچ نەڵێ. بۆیە تکا دەکەم دوای خوێندنەوەی ئەم پێشەکیە، لە بیری بەرنەوە. بە واتایەکی تر، ئەوە وەك بەسەرهاتی ئەو حەکایەتخوانەی لێدێ کە لێیان پرسی کەی دەگەیتە کاکڵی مەبەست؟ گوتی: کاکڵی مەبەست هەر ئەوەیە. شیعری پاز بەسەرهاتێکی بێ‌کۆتایە لە حەکایەتخوانێکی بێ‌کۆتایی.

چیرۆکەکەی، بەسەرهاتەکانی تر دووپات دەکاتەوە، کە خۆی ئەبێتە حەکایەتی، حەکایەت بێژەکان. پرسیار: کێ چیرۆکەکە دەست پێدەکا؟ دیسان پاز لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا، تا ئەو جێیەی کە لە هەر شاعیرێکی نوێخواز چاوەڕێ دەکرێ نزیك بۆتەوە. چونکە هەر شاعیرێکی بەتوانا، دەڵێ وەڵام ئەوەیە، وەڵامێك وجوودی نیە. جگە لە نیشانەیەکی پرسیار (؟) یا لەمەڕ "بەردی هەتاو"دا، نیشانەیەکی وەك (:) کە خوێنەر بۆ دیسان خوێندنەوە، بانگهێشتن دەکا. ئەو شیعرە بە شێوەی "Fingan's Wake"(*1) وتراوە، کە لە مابەین ویستنی گوتنی هەموو شتێك و بە تەنگەوە بوون بۆ بێدەنگی موتڵەق وەك "تراپیستەکان"(*2) دەڵێن؛ لە هاتوچۆدایە. ئەوە شیعرێکە هەموو کەس پێداویستی بە هۆنینەوەی هەیە، پرسیار: ئاخۆ (دانتە)ش وەها هەستێکی نەبوو؟ وەڵام: بەڵێ، وایە. ئەگەر تاریفێکتان دەوێ من ئەڵێم "بەردی هەتاو" شیعرێکە بە شێوەی "هیراکلیتوس"(*3) هەروەها شعیرێکە "مارتین بۆبر"(*4) پەسەندی کردووە، کەڕێی دەربازبوون لە ناهومێدی ئەگزستانسیالیستیی لە دیتنەوەی خۆ لە خەڵکدا ئەزانێ. هەر بۆیە ئەوە شیعرێکی سیاسیە. ئەگەرچی کارێکی بە ‑ڕێنیشاندانی هاسانی بەشەردۆستانەو ئازادی خوازانە نیە، هەروەها ئەو شیعرە، وەك زۆربەی شیعرەکانی پاز، شیعرێکە باسی نەخەوتن دەکا.

"نووسراوی دۆناڵد گاردنر، وەرگێڕی ئینگلیزی شیعرەکە"

# بەردی هەتاو

بیەك لە بلوور، سپی چنارێك لە ئاو
فوارەیەكی کەڵەگەت کە -با- دەیچەمێنێتەوە
دارێك سەماكەر بەڵام ڕەگی لە قووڵاییدا
بەستێنی چۆمی کە پێچ دەکاتەوە، ئەڕواتە پێشێ
بەسەر خۆیا ئەچەمێتەوەو ئەخولێتەوە
گشت دەمێكیش بەڕێوەیە:
كوێرە ڕێی كوژاوەی ئەستێران
یا بەهار گەڵێ کە بێ پەلە تێپەڕین
ئاوێ لەژێر جووتێ پێڵووی نووقاودا
کە شەو تا بەیان ڕیسالەتی لێ هەڵدەقوڵێ
بوونی تەنیا لە دووپاتەی شەپۆلان دا
شەپۆل بەدوای شەپۆلا دێو هەموو شتێ دادەپۆشێ
ئاقارێكی سەوز کە كۆتایی نیە
وەكوو تریفەی گرشەداری باڵەكان
ساتێ لە جەرگەی ئاسمانا لێك ئەكرێنەوە،
كوێرە ڕێیەكی زۆر بەرین لە قووڵایی بیابان دا
لەڕۆژانی داهاتوو،
ڕوانینی زیت و خەمینی ڕۆژە ڕەشی،
وەك باڵندەیەك کە گۆرانیەكانی دارستان ئەكەنە بەرد،
ئەو دڵ خۆشیە بێ هۆیانەی
لە چڵ و پۆپە شاراوەكانەوە بەسەرمان دا ئەبارن،
ساتەكانی نوور کە باڵندە بەدەنووكەوەی ئەگرن
ئەو مزگێنیانەش کە لەپی دەستمانیان لێوڕێژ كردووە.
بوونێك وەك هێرشی بە هەڵكەوتی گۆرانی
وەكو بایەك لە ئاوری دارستانا دەنگی هەڵبڕێ،
ڕوانینی زیت و بەردەوام کە ئۆقیانوس و

چیاکانی دونیا بە حەواوە هەڵ ئەواسیٚ،
قەوارەیەك لە نوور لە ئاقیقەوە تێپەڕیٚ،
دەست و پێیەك لە نوور، زگێ لە نوور، کەنارەکان،
ڕەوەزێکی تاوەسووت، لە شێ هاوڕەنگی هەور
هاوڕەنگی ڕۆژ، کە بە پەلە بەرەو پێش هەنگاو هەڵدێنیٚ،
زەمان بروسکەی لیٚ ئەبێتەوەو بارستایی هەیە،
ئێستاش دونیا لەودیوی لەشی تۆوە دیارەو
لەڕوونی تۆوەیە ڕوونە.

من لە قووڵایی تەلارەکانی دەنگەوە تێدەپەڕم،
لەنێو بوونەوەری دەنگدانەوە ئەخلیسکێم
وەکوو کوێریٚ بە ڕوونیدا تێدەپەڕم
لە دەنگ دانەوەیەکی مەحف بووەوە، لە گەڕانەوەیەکی تردا
لە دایك دەبم.
ئاخ دارستانی ئەستونە بە جادوو ڕازاوەکان
من لەژێر میچەکانی نوورەوە
ڕیٚ ئەکەمە نێو دالانە پرشنگ دارەکانی پایز،

من بەنێو لەشی تۆدا وا تێدەپەڕم، هەروەکو بەنێو دونیادا
زگت گۆڕەپانێکی تاوەسووتە
مەمکەکانت دوو پەرستگەی دەستە خوشکن، کە تێیاندا
خوێنت پارێزەری ڕازە هاوهێڵەکانی خۆیەتی
نیگاکانم وەك لاولاوێك دەئاڵێنە باڵاتەوە
تۆ ئەو شارەی کە دەریا گەمارۆی داوی
ئەو قەلایانەی نوور دوولەتی کردوون.
هاوڕەنگی هەڵووژە، شۆرەکات
هاوڕەنگی ڕەوەزو باڵندە گەلێکە
وەبەر ڕقی نیوەڕۆیەك کەوتوون، کە هەموویانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە،
چەشنی ئێشتیاکانی من جل پۆشیو

وەک ئەندێشەی من ڕووت و قووت تێدەپەڕی،
من بەنێو چاوەکانت دا تێدەپەڕم هەروەکو بەنێو ئاودا
جووتێ چاو کە بەورەکان بۆ خواردنەوەی خەون خۆی ئەخزێننە پاڵەوە،
بڵێسەیەکیش کە بەر ئەبێتە گیانی باڵندەی باڵ زێڕین،
من بەنێو تەوێڵتدا تێدەپەڕم وەک بەنێو مانگدا
بە ئەندێشەتدا هەروەک بەنێو هەوردا
بەنێو لەشتدا وەک بە خەون و خولیاتدا،

کێلگەی گەنمەشامی داوێنت کەروێشکە دەکاو دەنگ هەڵدەبڕێ
داوێنی بلوورت، داوێنی ئاوت،
لێوت، قژت، نیگات،
شەو بە گشتی دادەباری، ڕۆژ بەگشتی
سینگم بە قامکە ئاوەکانت هەڵئەدڕی،
بە دەمی ئاوت چاوەکانم ئەبەستی
لە ئێسقانما دادەباری‌و، لە سینگمدا
ئاویلکەداری، ڕیشەکانی ئاوەزێی تا قووڵایی خاک بەرەو پێش ئەبا،

وەک چۆمێ، هەموو درێژاییت دەپێوم
لە لەشتەوە تێدەپەڕم وەک لە دارستانێکەوە
وەکوو کوێرە ڕێیەک لە کۆسارا سەرگەردانەو
کوت و پڕ بە هیچی کۆتایی دێ،
من بەسەر لێواری تێغی ئەندێشەتدا ڕێ دەپێوم و
لە گەشاوەیی تەوێڵی سپیتدا سێبەرم هەڵدەوەرێ‌و لەت لەت ئەبێ،
لەت و کوتەکانم دەخەمە سەریەک
بێ لەش بەڕێی خۆما تێدەپەڕم، بەپرس و ڕا
بە کوێرە کوێر،

دالانە بێ کۆتاییەکانی بیرەوەری،
ئەو دەرگانەی بەڕووی هۆدەیەکی چۆڵا کراونەوە

که لەوا هەموو هاوینەکان پێکەوە ئەڕژێن،
لەوێ گەوهەری تینوێتی لەناوەوە ئەسووتێن،
ڕوومەتێ، هەر کە وەبیری دێنمەوە مەحف دەبێتەوە،
دەستێ کە هەر وێیدەکەوم کوت کوت ئەبێ،
تاڵێك کە جاڵجاڵۆکەکان لە ئاژاوەدا
بەسەر بزەی ساڵەهای ساڵی ڕابردوویاندا تەنیوە،
لە گەشاوەیی تەوێڵمدا ئەگەڕێم
ئەگەڕێم بێ ئەوەی شتێ ببینمەوە، لە ساتێك دەگەڕێم و
ڕوخسارێکی پڕ لە برووسکەو دڵەڕاوکێ
کە ئەخزێتە نێوان لق و پۆپە یەخسیرەکان لە شەودا،
ڕوخساری باران لە باخی سێبەرەکاندا
ئاوێك کە بە قۆشمەیی لە تەنیشتمەوە تێدەپەڕێ،
ئەگەڕێم بێ ئەوەی بدۆزمەوە، بە تەنیا دەنووسم
کەسێ لێرە نیە، ڕۆژ بەر دەبێتەوە، ساڵ دەکەوێ
من لەگەڵ سات بەر ئەبمەوە، ئەکەومە قووڵاییەکانەوە،
کوێرە ڕێیەکی نادیار لەسەر ئاوێنەکان
کە وێنەی تێکشکاوی من دووپات دەکاتەوە
پێ ئەنێمە سەر ڕۆژەکان، سەر ساتە سواوەکان
پێ ئەنێمە سەر بیری سێبەرەکەم
ئەمن بۆ دیتنەوەی ساتێ، بەسەر سێبەرەکەما تێدەپەڕم،

من لەو ساتە دەگەڕێم، لە دڵ ئەستێنیدا باڵندەیەکە
من هەتاوم لە کاتژمێر پێنجی ئێوارەدا دەوێ
کە هێدی ئەکەوێتە سەر دیواری بەردی ڕازاوە،
زەمان خەرمانی میوەکانی پێدەگەیاندو
ساتێکیش قەڵەشتیان ئەبرد، گەورە کچان بە هەڵەداوان
لە قووڵایی گوڵ ڕەنگیانەوە ئەهاتنە دەرێو
لە حەسارە بە بەرد هەڵچنراوەکانی قوتابخانەدا بڵاو ئەبوونەوە،
یەکیان باڵا بەرزتر لە پایز

بەکراسی نوورەوە، لەژێر ئاسمانەوە لەنجەی ئەکرد
فەزا دەئاڵایە باڵای،
بە پێستێکی مەنگوینیو ڕووناکترەوە دایدەپۆشی،

بەورێك هاوڕەنگی نوور، مامزێکی ڕەنگ خەنەیی
کە شەوگەڕان وە دوای کەوتوون
کیژێك کە نیگای لیّ دزیمەوە،
بەسەر پەرژینی مانگەشەوی
بارانێکی سەوزدا خۆی چەماندبووەوە،
ڕووی بێ ئەژماری گەورە کچ!
ناوتم لە بیرچووەتەوە، ملوسینا(1)،
لۆرا، ئیزابیل، پێرسەفوونە(2)، ماری
تۆ هەموو ڕوویەکانیو هیچ کامیان
تۆ هەموو ساتەکانیو هیچ کامیان
دارو هەور لەتۆ دەچن،
تۆ هەموو باڵندەکانیو ئەستێرەیەکی بەتەنیا
تۆ تیژایی شمشێری
ئەو کاسە خوێنەی جەللاد بەدەستیەوە گرتووەو دەیبا
لاولاوێکی، ئەچێتە پێش و ڕۆح لە ئامێز دەگرێ
لە ڕەگەوەی هەڵدەکشێو لەخۆی جیادەکاتەوە.

دەستنووسی ئاور لەسەر بەرد
قڵیشێ لە بەردا، شای ماران،
ئەستونێ لەمژ، کانییەك لەبەردا،
خەرمانەی مانگ، هێلانەی هەڵۆیان
تۆوی دەم با، پنچەدڕووی مەرگ هێنەر
کە سزای هەمیشەمانی خۆی ئەبەخشێ،
شوانکارەی کیژۆڵەی دەربەندی زەریاو
دیدەبانی دەربەندی مەرگ



لاولاوی ئاوێزان لە هەڵدێری خەواڵوودا
نیلوپەڕی ئاوێزان، گیای ژاراوی
گوڵی ڕابوون، مێشووی ژیان،
خانمۆڵەی شمشاڵ ژەن و برووسکە
لقێ لە یاسەمەن، خوێی نێو برین،
چڵە گوڵێکی سوور بۆ پیاوێکی زامدار
بەفری تەموز، مانگی ئاوێزان بە دارەوە
دەستنووسی زەریا لەسەر بەردی ڕەش
دەستنووسی هەتاو، دەنکی هەنار، گوڵەگەنم،

ڕووی بلێسە، دزراو و قووت دراو
ڕووی تازەلاو
گەپچاڕی ئەو ساڵانەی بە سەماوە وەکو تاپۆ تێپەڕین
وا گەپچاڕی ڕۆژگەلێکە، ئەسوورێتەوە بە دەوری ئەو حەوشەو
حەسارەدا،
سات ئاوری تێبەرئەبێ و ڕوخسارە زۆرەکانی ئاور
ئەبنە یەك ڕوخسار
هەموو ناوەکان ناوێکن
گشت سیماکان سیمایەکن
هەموو سەدەکان، ساتێکن و
هەتاکوو سەدەهای، سەدە
جووتێ چاو ڕێ بە داماتوو دەگرێ.

شتێکم لەسەر ڕێ نیە جگە لە ساتێ
کە ئەوشەو لە گرەوی خەونی
وێنە پێکەوە شەتەك دراوەکاندایەو
بە ناخۆشی لە خەون هەڵبڕاوە،
کە لە خۆڕا ئەو شەوە بەتاڵانی بردووە
وشەیەك کە پیت بە پیت مەحف بووەتەوە

ئەو ساتەی زەمان لە دەرەوە
ریخۆڵەکانی ئەرێژێتە خوارێو
دونیا بە پێی پیلانێکی کوشت و برِو پێشەکی
دەرگەکانی ڕۆح دەکوتێ،

تەنیا لە ساتێکدا کە شارەکان، نێوەکان و گوڵەکان
یا هەر نیشانەیەکی ژین،
بەسەر تەوێڵی مۆنی منا ئەڕژێن
ئەوساتەی هەڵپڕوکانی گەورەی شەو
ئەندێشەی من تێکدەشکێنێ، ئێسقانەکانم تێکدەهاڕێ
خوێنم مێورو مێورتر ئەجمێ
ددانەکانم ئەسوێن و
پێڵووەکانم بە هەور دادەپۆشرێن و ڕۆژو ساڵەکان
قورسایی ترسی بێ جێ هەڵدەچنن،

ئەو ساتەی زەمان باوەشێنەکەی
توند، توند بە دەستیەوە دەگرێو
لە پشت وێنەکانیەوە شتێ ناجمێ
سات لەخۆیدا ئەبزوێو هەر خول دەخوا
لەو جێیەی وا مردن لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی دەدا
شێویلکەی خەمین و بە باوێشکی شەو و
قسە تووڕەو بێماناکانی مردنی سەماکەر، هەڕەشەی لێدەکەن،
مەرگی زیندوو، ڕووداپۆشیو
سات لەناو دڵی خۆیدا ئەتلێتەوە،
بە چەشنی مستێکی قووچاو
لۆدەیەك میوە لە ناوەوە ئەگا
خۆی لە ناخەوە ئەخواتەوە، دەقەڵشێو دەکرێتەوە.
ساتی ڕوون دەرگە لەخۆی دادەخا
لەناوەوە ئەگاو

له قووڵاییه‌کاندا ڕیشاژۆ ده‌کا
له ده‌روونی منا ئه‌گووروێو هه‌موو له‌شم دائه‌گرێ،
لق و پۆپه فێداره‌کانی من ده‌خه‌نه ده‌ره‌وه
ئه‌ندێشه په‌ره‌وازه‌کانم ڕه‌وه باڵنده‌ی ئه‌ون
هه‌واڵی له ده‌ماره‌کانمدا ده‌گه‌ڕێ،
له داری تێگه‌یشتندا، له میوه‌ی به‌بۆنی زه‌ماندا،
هۆ ئه‌و ژیانه‌ی ده‌بێ تۆ بژین
تۆ ژیاون
زه‌مانێ که دیسانه‌وه وه‌کوو ده‌ریا ده‌شکێیو
ده‌که‌ویه دوور وڵاتان بێئه‌وه‌ی سه‌ر وه‌رسووڕێنی،
ئه‌و ساته‌ی تێپه‌ڕی هیچ ساتێ نه‌بوو،
ئێستا ئه‌و ساته ده‌گاتێ، به هێوریو هه‌ڵده‌ئاوسێ
له‌ناو ساتێکی ترا ده‌تۆقێ، ئه‌وسا خێرا ون ده‌بێ.

له شه‌وگاری شۆره‌کات و به‌رددا
که به نووکی نادیاری چه‌قۆ بلۆق ده‌کا
به ده‌ستنووسێکی سوورو ئاڵۆز
له‌سه‌ر پێستم ده‌نووسیو ئه‌و زامانه
وه‌ك کراسی گڕ گشت له‌شم داده‌پۆشن
گڕده‌گرم بێ ئه‌وه‌ی بسووتێم، له ئاو ده‌گه‌ڕێمو
له چاوه‌کانتا قاتی ئاوه، چاوه‌کانی تۆ به‌ردن‌و
مه‌مك و زگ و برژانگیشت به‌ردن،
ده‌مت بۆنی خاکی لێدێ،
ده‌مت بۆنی ژاری زه‌مانی لێدێ
له‌شت بۆنی چاڵێکی ده‌ورگیراو ده‌دا،
داڵانێ له ئاوێنه که چاوه تینوه‌کانی من دووپات ده‌کاته‌وه
داڵانێك که به‌رده‌وام
بۆ جێگه‌ی ڕۆیین ده‌گه‌ڕێته‌وه.
من کوێرم و تۆ ده‌ستت گرتووم

لەنێو ڕاڕەوە تاریکە بێ‌ئەژمارەکانمەوە
بەرەو ناوەندی جەغزم دەبەی، شەپۆل دەدەی
وەك ڕووناکی بڵێسەیەك لە تەشوێیەکا بەستبێی
وەك تیرێژێ بەسەری زیندوویی پێستی هەڵدەکەنێ‌و
خولیایەك باڵای دار بۆ بەند کراوی مەحکووم بە مەرگی هەیە،
نەرم و تووڵ وەك قەمچی‌و، بەرز
وەك چەکێ بەرەو مانگ خرابێتە سەرپێ
لێواری تیژی وشەکانی تۆ سینگم هەڵئەدڕێ
لە خەڵکم هەڵئەبڕێ‌و بەتاڵ جێم دێڵێ،
تۆ بیرەوەریەکانم یەکەیەکە لێدەستێنی،
من ناوی خۆم بیرچۆتەوە،
هاوەڵانم لەناو بەرازەکانەوە دەپرمێنن
یا لەژێر هەتاوی دۆڵێکی قووڵدا لەپێ کەوتوون و دەسوێن،

جگە لە زامێك هیچم لێ نەماوەتەوە
دەربەندێ کە کەسی لێوە تێناپەڕێ،
بوونێکی بێ ڕۆچنە، ئەندێشەیەك کە ئەگەڕێتەوەو
خۆی، خۆی دووپات دەکاتەوە، دەبێتە ئاوێنەو
لە ڕوونی خۆی‌دا خۆ ئەدۆڕێنێ،
وەخۆهاتنەوەیەك، بەچاوی پشکوتووەوە قوچاوە
ئەڕوانێتە بەخۆداهاتنەوەی‌و هێند دەڕوانێ
لە ڕوونیا نوقم دەبێ:
من خەرمانەی پوولەکەکانی ئەتۆم دیت
لە بەر ڕوونی بەربەیاندا مەیلەو سەوزی ئەنواند، میلوسینا
لەنێو نوێنەکاندا پەپکەت خواردبوو، خەوتبووی
ساتێکیش وەخەبەر هاتی وەك باڵندەیەك قیژاندت و
بۆ هەتا هەتایە کەوتیە خوارێ، سووتای‌و بوویتە خەڵووز،
جگە لە هاوارێ هیچت لێ بەجێ نەما،
لە کۆتایی سەدەکانەوە لەخۆم دەڕوانم

نزیك بین و بەكوخەكوخ لەنێو كوگایەك
وێنەی كون و لە مێژینەدا ئەگەڕێم:
هیچ شتێ دەست ناكەوێ، تو كەس نەبووی،
تەپولكە خولەمێش و گەسكە كولەیەك
چەقویەكی ژەنگاویو پەڕێكی توز تەكاندن
پێستێ كە لەسەر تیغێكی لە ئێسقان داتاشراو هەلواسراوە
مێشووە ترێیەكی وشك هەلگەڕاو، گوڕێكی ڕەش و
لە قوولایی گوڕیش دا
چاوانی كیژێ كە هەزاران ساڵ لەمەوبەر مرد،

چاوانێ كە لە قوولایی چاڵێدا نێژراون،
چاوانێ وا لەوێڕا بو لامان وەر دەسووڕێن،
چاوانی منالانەی پیرەدایكێ
كوڕە جوانكیلەكەی وەك باوكێكی لاو دەبینێ،
چاوانی دایكانەی كچێكی تەنیا
لە باوكیدا ساوایەكی كوڕ دەبینێ،
چاوانێ كە، لە قوولی چاڵی ژینەوە
وە دوای ئێمە دەكەون و خویان قوولایی مەرگێكی دین.
-بەلام نا؟ ئاخو كەوتنە نێو ئەو چاوانە
تەنیا ڕێی گەڕانەوە بو سەرچاوەی ڕاستەقینەی ژین نیە؟
كەوتنە خوار، گەڕانەوە، خەون بەخووە دیتن
هەبوونی ژیانێكی تر كە خەومان پێوە دەبینێ
چاوانی داهاتوویەكی دی، ڕەوە هەورێكی تر، مردنی مەرگێكی دیكە
ئەو شەو هەموو ئەو شتانەیە پێداویستیم پێیانەو
ئەو ساتەش بێ براِنەوە دەكرێتەوەو بوم لێك دەداتەوە
لە كوێ بووم، كێ بووم، ناوی تو چیە،
ناوی من چیە:
داخو بو هاوین
گەلالەیەكم دادەڕشت -بو هەموو هاوینەكانیش-

ده ساڵ لەمەوبەر لە شەقامی کریستۆفەر
لەگەڵ فیلس کە دوو قووڵایی لە ڕوخسارابوو
پاساریەکانیش دەهاتن ڕووناکی لێ بخۆنەوە؟
ئاخۆ کارمن لە ریفورما بە منی وت
"هەوایەکی فێنکی هەیە، لێرە هەموو دەم ڕەزبەرە"
یا لەگەڵ کەسێ تر ئەدوا
یا من لە خۆڕا شتێك دەڵێم کەس نەیوتووە؟
ئاخۆ ئەوە من بووم لە شەوی رەشماڵ بەسەری ئاکساکادا دەرۆیشتم،
چەشنی دارێکی سەوزو ڕەش،
وەك بای سەرشێت لەگەڵ خۆم دەدوام و
کە ئەشکەڕامەوە دیوەکەم -دیوەکەی جاری جارانم-
ئاخۆ ئەوە من بووم لە ئاوێنەدا خۆم ئەدیت؟
ئاخۆ هەلاتنی رۆژمان لە ئوتێل و ڕنێتەوە دیت؟
کە لەگەڵ دار شابەڕووەکاندا سەمای دەکرد،
ساتێ قژت دادەهێنا وتت "تازە زۆر درەنگە" و
من پەڵەیەکم بەسەر دیوارەوە دیو هیچم نەگوت؟
ئاخۆ پێکەوە چوینە ناو بورجێکەوە هەتاومان دی
ئەچۆڕایە پشت ڕەوەزەکانەوە؟
ئاخۆ لە بێداریتا ترێمان خوارد؟ لە پرۆتە
گوێزمان کڕی؟
ناوو شوێنەکان
شەقام، شەقام، ڕوخسارو گۆرەپان و شەقام
وێستەگەکانی مێڵی ئاسن،پارك، مۆدە تاکە کەسیەکان
پەڵەکانی سەردیوار، یەکێ قژی دادێنێ،
یەکێ لە پەنا منەوە ستران ئەچڕێ، کەسێ پۆشاك لەبەر دەکا،
مۆدە، شوێن، شەقام، ناو، مۆدە،

مەدرید، 1937
لە گۆرەپانی دل ئانجل

ژنان منالّ لەکۆڵ بە لەنجەولارەوە گۆرانیان دەگوت
ساتێ هاوارەکان بیستران و ئاژێرەکان ناڵاندیان،
ماڵەکان لە تەپ وتۆزدا بە چۆکدا هاتن،
قەڵا دوو لەت بوو، بەردەرگاکان تێك ڕمان و
گژەبای لاساری ماتۆڕی فڕۆکەکان:
دوو کەس بەرۆکیان دادڕیو دڵدارییان کرد
تا لە بەشی بێ بڕانەوەیی ئێمە پارێزگاری بکەن
لە بەشی ئێمە لە زەمان و لە بەهەشت
هەتا بچنە قووڵایی ڕیشەمانەوە، فریامان کەون،
هەتا میراتێ زیندوو کەنەوە ڕێکگرانی ژیان
هەزاران ساڵ لەوەپێش لێیان دزیبووین،
ئەوان جلەکانیان هەڵدڕیو ئاوێزانی یەکدی بوون
چون ساتێ لەشە ڕووتەکان بەیەك دەگەن
مرۆڤەکان لە دەست زەمان ڕادەکەن و زامدار ناکرێن
هیچ شتێ دەستی پێیان ڕاناگا، ئەوان دەگەڕێنەوە بەرەو سەرچاوەی خۆیان
لەوێ من و تۆ یەك نیە، سبەی، دوێنێ، ناوێك نیە.
ڕاستەقینەی دوو مرۆڤ رۆحێکەو لەشێك
هۆ بوونی ڕێك..
لەو شارانەی کە دەنێژرێن
هۆدەکان لێك دوور دەکەونەوە
هۆدەو شەقامەکان، ناو گەلێکیش سۆزێکی وەك زامیان هەیە،
هۆدەیەك پەنجەرەی بەرەو دیوەکانی تر دەخرێتە سەرپشت
هەر بەو کاغەزە دیواریە ڕەنگ دۆڕاوەوە،
لەو جێیەدا کە پیاوێکی قۆڵهەڵماڵیو هەواڵەکانی ڕۆژ دەخوێنێتەوە
یا ژنێك جل ئوتوو دەکا
هۆدەیەکی ڕوەو خۆر
کە لق و پۆپی دار هەڵووژە سێبەریان بۆ کردووە
دیوێکی تر:
لە دەرەوە دایمە بارانە

حەسارێك و پەیكەرێ لە زەرد داتاشراوی سێ منداڵ،
مۆدەگەلێ كە وەك پاپۆڕە بەجم و جوڵەكان لە دوورگەی نووردان
یاوەكوو ژێر دەریابییەكان:
بێدەنگی پەرە دەستێنێو لەنێو شەپۆلە سەوزەكاندا بڵاو دەبێتەوە،
دەست لەهەر شتێ ئەدەین وەك فۆسفۆر ئەدرەوشێتەوە
ئەو كەلاوانەی سەرووەتیان تیا نێژراوە، وێنەی خاوو خێزان بە كۆمەڵ،
كە ئێستا ڕەنگیان دۆڕاندووە، قاڵیە شڕو وڕەكان
ڕكەو مۆدە بە ژمارەكان
هەموو ڕوویان گۆڕاوەو باڵیان لێ ڕواوە
هەر نەخشێكی لە گەچ دارێژراو هەورێكە
هەموو دەرگەكان بەڕووی زەریادا ئەكرێنەوە، بەڕووی مێرگەڵان و ئاسماندا
هەر مێزێك خەیاڵی میوان دارییەكە
هەموو چەشنی سەدەفی نووقاون، زەمان لە خۆڕا گەمارۆی داون
ئیدی ئێستا نەزەمان ماوە، نەدیوار، تەنیا فەزا ماوە فەزا
دەستەكانت ئاواڵەكەو ئەو سامانە
وەسەر یەك نێ،
میوەكان لێوەكە، لە ژیان بخۆ
لەژێر دارێ ڕاكشێ، ئاو بخۆوە،

هەموو شتێ ڕووی خۆی گۆڕیوەو پیرۆزە،
هەر ژوورێك ناوەندی دونیایە
ئەمە یەكەم شەوی دەستپێكردنی گشت شتێكە، ڕۆژی سەرەتایە،
ساتێ دووكەس ئەویندارانە یەكیان خۆش دەوێ، دونیا لە دایك دەبێ،
دڵۆپێ نوور لە ئەندەروونە ڕوونەكانەوە دێت و
مۆدە وەك میوەیەك دەكرێتەوە
یا وەك ئەستێرەیەك لە هەرەتی بێدەنگیدا ئەتۆقێو
یاسایەكیش كە مشكەكان لمۆزیان تێوەرداوە،
پەرژینی ئاسنی بانگ و بەندیخانەكان،
پەرژینی ڕازاندنەوەی ئیدارەو حەساری تێل دڕوو،

مۆری کائۆچۆیی، نەشتەرو سیخەکان
دڵدانەوەی چەك بە ئاهەنگێکی بەردەوام
دووپشکێ بە پلەی دوکتوراو دەنگێکی شیرینەوە،
پڵینگێ کڵاوی ئاوریشم لەسەر،
سەرۆکی لیژنەی گیاخۆران و خاچی سوور،
ئێستری پەروەردەو فێرکردن،
تیمساحێکی داپۆشراو بە پۆشاکی فریارەس،
باوکی خەڵك، سەرۆك، کۆسەماسی،
میعماری داهاتوو، بەرازێ بەجلی شەرەوە،
خۆشەویستی تاقانەی کڵێسا
کە ددانە دەستکردە ڕەش هەڵگەڕاوەکانی
لە ئاوی پیرۆزدا ئەشواو
دەچێتە پۆلی زوبانی ئینگلیزیو دیموکراسی،
دیوارگەلێ کە نادیترێن، دەمامکێکی پروکاویش
مرۆڤێ لە مرۆڤێکی تر جیادەکاتەوەو
لە خۆشی،
شتەکان گشت هەڵدەوەرن.
لە ساتێکی بەربڵاودا ئێمە بیر لە تاقانەیی لە کیس چوومان دەکەینەوە،
بیر لە دەستەو ئەزتویی رێکی مرۆڤ بوون،
لە شکۆو گەورەیی مرۆڤ بوون،
گەورەیی نان بەخشینەوەو، هەتاو و مردن بەش کردن،
مۆجزەی لە بیرکراوی زیندوویی:
خۆشەویستی جەنگە، کە دووکەس یەکتر لە ئامێز بگرن
دونیا ئەگۆڕێ، ئارەزووەکان قەڵەو دەبن
ئەندێشەکان پان و پۆڕ دەبنەوە
لە سەرشانی یەخسیرەکان باڵەکان چرۆ دەردەکەن،
دونیاش ڕاست ترو هەست پێکراو تر دەبێ،
شەراب ئەبێتەوە بە شەراب
نان بۆنەکەی جارانی خۆی ئەداتەوەو ئاویش ئاوە،

خۆشەویستی جەنگە، هەموو دەرکەکان دەخاتە سەر پشت،
تۆ ئیتر سێبەرێکی ژمارە دارنی
ئەربابێکی بێ چاوو ڕوو مەحکوومت کا
بە زنجیری تا هەتایی،
دونیا سەراپا دەگۆڕێ
کە دوو مرۆڤ بەچاوی ناسینەوە لەیەکتر بڕوانن
خۆشەویستی دادڕینی کراسی هەموو نێوێکە لەبەر کەسێك:
ئەلۆئیز وتی "لێگەڕێ ببمە نەشەمەی تۆ"
بەڵام پیاوە خۆی بەدەستی یاساوە دا
ئەوی خواست و ئەوانیش لەجیاتی خەڵات
یەختەیان کرد،
چ پیرۆزە تاوان و
خۆ کوشتنی ئەویندارانی، خوشك و برا
کە وەك دوو ئاوێنە شەیدای وێك چوونی خۆیان بوون
لەگەڵ یەك دەست تێکەڵ دەکەن،
چ پیرۆزە نانی بێ ئابروویی خواردن،
زیناکردن لە پێخەفی خۆڵەمێشدا
چ بەرزە ئەوین و شەللاقێك لە چەرمی خاو
وڕێنەی لاولاوی ژاراوی،
نێربازێکیش، کە بەجێی مێخەك تف لەبەر ئێخەی دەدا،
چ شیرینترە بوونەبەرد لە جێی بەکۆمەڵ
لەوەی خۆ بەدەست ئەو ماشنیەوە دەی
کە شیلەی ژین هەڵ دەمێنجێ، وەك مەویر هەڵی دەڕێژێ و
لە ساتی بێتاقەتیدا
بە ئەبەدییەت دا ڕمبازێن دەکا
لە ساتەکان بەندیخانە ساز دەکا
زەمان دەکاتە قەرەپووڵی مسی و بێ بایەخ؛
چ باشە پاکی و گوڵێکی نادیار
کە بە تەنیا لەنێو لق و پۆپەکانی بێدەنگیا وێستاوە، و

ئەڵماسی سەختی پاکان و تۆبەکاران
کە ئیشتیاکان دەپاڵێوێ‌و زەمان چەك و چۆڕ دائەدا،
زەماوەندی هێوری‌و ڕابوون،
دۆژ دامان لەنێو گوڵەکانیدا گۆرانی دەڵێ
هەر ساتەی گوڵێکە لە بلوور،
جیهان یەکەیەکە دەمامکەکان لەڕووی هەڵدەگرێ‌و
لە ناوەندیشا، ڕووناکی دەردەکەوێ،
ئەو کەسەی پێی دەڵێن خودا، بوونی بێ نێو و شوێنی خۆی
لە بەتاڵی ئەندێشەدا دەبارێنێ، بوونی بێ‌سیما
لە خۆیا ڕادەبێ، هەتاوێ لەنێو تاوەکان،
هەڵچنرانی حزورو نێوەکان:
دوای ورێنەکەم دەکەوم، بەوەتاغ و شەقامەکاندا،
بە کوێرە کوێر، دەچمە نێو ڕاڕەوەکانی زەمانەوە،
لە پلیکانەکان دەچمە سەرو دێمە خوار،
بێ‌بزوتن دەست بە دیوارەکاندا دێنم،
ئەگەڕێمەوە سەر خاڵی دەست پێکردن
لە ڕوخساری تۆ دەگەڕێم
دەچمە نێو کۆڵانەکانی بوونمەوە
ژێر هەتاوێکی بێ زەمان،
لە پەنا منەوە، تۆش وەك دارێك پیاسە ئەکەی،
وەك چۆمێ هەنگاو هەڵدەبڕی،

چەشنی گوڵەگەنم لە دەستمدا ئەڕوێی
وەك سمۆرە لە دەستمدا هەڵدەلەرزی
وەکوو هەزارەها باڵندە هەڵدەفڕی
پێکەنینت بەسەرم دا ئەپرژێ
سەرت وەکو ئەستێرەیەکی بچووکە لە دەستمدا،
ساتێ بە پێکەنینەوە نارنج دەخۆی
دونیا دیسان سەوز ئەنوێنێ

دونیا سەراپا دەگۆڕێ
دوو کەس بە گێژی یەکتر بگرنە باوەش و
لەسەر مێرگەڵان ڕاکشێن، ئاسمان دێتە خوارێ،
دارەکان قوتەقوت دەکەن، لە فەزا زیاتر هیچ نیە
هەر ڕووناکیو بێدەنگیە،
شتێ جگە لە فەزا نیە
کە ئامێزی ئاواڵەیە تاکوو هەڵۆی چاو بەناویدا هەڵفڕێ،
هۆزی سپی هەورەکان کۆچ دەکەن
لەش لەنگەر ئەگرێ، ڕۆح بایەوان هەڵ ئەدا،
کەژو کۆ دەکەوێتە بەین ئێمەو ناومان و
لە سەوزاییو شینایی سەرچاوەدا نوقم دەبین،
زەمان موتڵەقە، هیچ شتێك واوە نایە
جگە لە خودی زەمان و ڕووباری بەختەوەری،

هیچ شتێك تێناپەڕێ، بێدەنگی، چاو دەتروکێنێ،
(بێدەنگ: لەو ساتەدا فریشتەیەك هەڵفڕیوە
بە گەورەیی ژیانی سەدان هەتاو)،
ئاخۆ ئەوە هیچ بوو تێدەپەڕی، ئاخۆ ئەوە تەنیا چاو تروکانێك بوو؟
-میوانداریو دوور خرانەوە، یەکەم دڵڕەشی،
ئێسقانی شێوێلکەی کەر، دەنگی خنکاوو بەتاڵ
تاوانباری شڵەژاوو سەرشێت
کە دەڵێی لە سارایەکی خۆڵەمێشیدا کەوتووە،
هاوارو زریکەی "ئاگاممنون" (3) و
"کاساندرا" (4) کە بەرزتر لە لرفەی دەریا
نزاو هاوارەکان دووپات دەکاتەوە،
سوقرات، شەتەك دراو بەزنجیر (هەتاو هەڵدێ،
مردن وەخەبەرهاتنە: "کریتۆ(5) بە قەبەری باوەی ئیکسولاپیوسەوە(6)
من ژانی ژیان چاکی کردمەوە")،
چەقەڵ لە کاولاشەکانی نەینەوادا

درێژە بە قسەکانی ئەدا، تاپۆیەك کە پرۆتۆس(7)
شەوێك پێش تێك هەڵچوون دیتی، موکتزوما
لەسەر نوێنی پڕ لە درووی بێ خەویدا گینگڵ ئەدا،
رۆبیسپێر بە سواری کەژاوەوە بەرەوپیری مەرگ ئەچێ
سەفەرێکی بێ کۆتا، کەسات بە ساتی دیتراو،
بە باشی ناسراوە،
ئێسقانی شێویلکەی لەرزۆکی خۆی بەدەستەوە گرتووە،
چۆرکا چووەتە نێو بەرمیلەکەیەوە
دەڵێی لەسەر تەختێکی ئەرخەوانی دانیشتووە،
"لینکۆلن" کە هەنگاوەکانی پێش هەڵبڕان بڕێرراون
ئەچێ بۆ دیتنی شانۆ،
شەقشەقەی مردنی "تروتسکی" وەکوو بەرازێکی غەزریو دەناڵێنێ،
"مادرۆ"(8) و پرسیارێ کە کەس وەڵامی نەداوە:
ئەوانە بۆچی دەمکوژن؟
تووك و نزاو بێدەنگی تاوانبارەکان،
سۆفیو شەیتانێکی داماو
گۆڕستانی قسە دووپاتەو وتە خۆشەکان
کە سەگی مانا بە پەنجە گۆڕەکانیان ئەدەنەوە
ورێنە، هاواری سەرکەوتن،
دەنگێکی سەیرو سەمەرە کەساتی مردن لێمان هەڵدەستێو
کوتەی دڵی ژینی ساواو
شەقە شەقی ئێسقانەکان، کە لە کێشەدا بەسەر یەکا ورد ئەبن
ردەمی پێغەمبەر کە کەف هەڵ دەخرێنێو
هاواری ئەو هاواری جەللادو
هاواری مەحکوومی ئەوان،
بڵێسەیە،
چاوەکان، و ئەوانیش بڵێسەگەلێکن ئەو پێیانا ئەڕوانێ،
گوێ بڵێسەیەکەو دەنگی ناخیشی بڵێسە،
لێو زوخاڵی قاڵ بۆوەیەو زوبان داخێکی ئاورینە،

لێکخشان و پیاوێ کە وەشتێ ئەکەوێ،
ئەندێشەو شتێ کە بیری لێ دەکەنەوە، کەسێ بیردەکاتەوە خۆی بلێسەیە،
هەموو شتێك لە سووتانە، دونیا بلێسەیەکە،
هیچ شتێك لەخۆڕا ئاور ناگرێو هیچ شتێکیش
جگە لە ئەندێشە بلێسەی لێهەڵناستێو دوکەڵ:
جەللادو مەحکوومێ نیەو تەنیا
هاوار
لە پاش نیوەڕۆیەکی هەینیدا و بێدەنگی
بێدەنگی کە خۆی بە چەند نیشانەیەك دادەپۆشێ،
بێدەنگی کە بێئەوەی بدوێ قسە ئەکا، ئاخۆ هیچ ناڵێ؟
هاواری مرۆڤەکانیش شتێ نیە؟
ئاخۆ ساتێ زەمان تێدەپەڕێ، شتێ ڕانابرێ؟

—هیچ شتێ تێناپەڕێ، تەنیا هەتاوە
پێڵووی گەرمی لێك ئەنێ؛ بە هێوری ئەجوڵێت، هیچ شتێ،
هیچ قوربانیەك نیە
زەمان قەت قەت بۆ دواوە ناگەڕێتەوە
مردووەکان لەو جێیەی بە مەرگەوە بەسراون دەمێننەوە
قەت بەمردنێکی دی نامرن،
هەرکام بەندی جووڵەو ئاکاری خۆیانن، کە دەستیان پێیان ڕاناگا،
ئەوان لەنێو تەنیایی‌و مردنیانەوە
بەبێ ڕوانین و بێ نێوبڕ لێمان دەڕوانن،
مردن بۆتە پەیکەری ژیانیان،
ئەوان هەموو دەم لەو جێیەن لە ئاست ئەبەدیەت دا هیچ نیە،
هەر ساتێ لە ئاست ئەبەدیەت دا شتێ نیە،
شای سێبەرەکان کوتەی دڵت دەپێوێو
دواین ئاکارو بزوتن، شێوەی زبری دەموچاوت،
خەتە جۆراوجۆرکانی
ڕووت تەواو دادەپۆشێ،

ئێمە میراتی مێژوویی ژیانێکین
ژیانێك، نەژیاو و بێگانە، کە کەمتر هی ئێمەیە
-توخوا ژیان کەی هی ئێمە بووە؟
کەی ئێمە ئەوەی بەڕاستی هەین، هەین؟
زەویەکی خۆڕاگرمان نیە،
ئێمە هەرگیز شتێ جگە لە گێژیو بەتاڵایی نین،
دەمگەلێ کە لە ئاوێنەدا گەشاوەن، داخۆرپان، قێزکردنەوە،
ژیان هی ئێمە نیە، هی مرۆڤەکانی ترە،
ژیان تەنیا بۆ کەس نیە ئێمە تێکڕا ژیانین
-نانێکی برژاو بەتینی تاو بۆ خەڵکی
بۆ هەموو ئەوانەی کە خودی ئێمەن-
من ساتێ هەست بە بوون دەکەم کە خەڵك بم،
ئاکاری من گەر هی خەڵك بێ، بەشی منی پێوەیە،
بێشك بۆوەی هەبم، دەبێ بەشێك لە خەڵك بم
هەتا لەخۆم بێمە دەرێ، دەبێ خۆم لە باڵای خەڵکا ببینمەوە،
خەڵکێ کە نەبنە من، هەر نین
خەڵکێ کە بە تەسەلی بوونم ئەدەنێ
من نیم، منێك لە ئارادا نیە، ئەوەی هەیە، هەر -ئێمەیە-
ژیان بوونە خەڵکە، هەنگاوی بەرزترە، هەنگاوێکی ئەولاترە،
لەوبەری من و تۆوە دایمە ئاسۆیەك هەیە
ژیان کە ئێمە لە ژین هەڵدەبڕێو نەناسمان دەکا،
سیمایەکمان بۆ دادەڕێژێو تێکی دەشکێنێ،
برسی بوون بۆ زیندوویی، هۆ مردن، نانی گشت مرۆڤەکان،
ئەلۆئیز، پێرسەفوونە، ماری،
ڕووت بنوێنە
ئێستا کە دەتوانی ڕووی ڕاستەقینەم ببینی، ڕووی کەسێ تر،
ڕووی من بەردەوام باڵانوێنی ڕووی هەموو مانە،
ڕوو دارو نانەوا،
شۆفێر، هەورو مەلەوان،

ڕوخساری هەتاو دەربەند پێدرۆو پابلۆ
ڕوخساری هاوبەشی ئێمە بە تەنیایی،
وەئاگام بێنە من تازە لەدایك بووم:
ژین و مەرگ
لەتۆدا ئاشت دەبنەوەو دەستەملان، شۆڕەژنی شەو
قەڵای پڕ تریفەو زوڵاڵ، شاژنی سپێدە
گەورە کچی مانگ، دایە گەورەی ئاوەکان،
لەشی دونیا،ماڵی مردن،
لە ساتی لەدایك بوونمەوە تا ئێستا بەردەوام لە دارماندام
من ئەکەومە قووڵایی خۆمەوە بێ ئەوەی بگەمە بنەوە
لە چاوەکانتدا پەیدام کە، خۆڵە بابردووەکەم بێنەو
خۆڵەمێشەکەشم بەگشتی خڕکەوە،
ئێسقانی لەت و کوتیشم
وێك خەوەو لێکی گرێ دە.
وجودم بدەمێنە، لە خاکی خۆتدا بمنێژە
دە، لێگەڕێ، بێدەنگیت ئەندێشەی لەخۆدا ئاڵۆز
مێورکاتەوە:
دەستەکانت ئاوەڵاکە
مۆ خاتوون کە تۆوی ڕۆژەکان دەچێنی،
ڕۆژ نەمرە، هەڵدێ، باڵادەکا
لە دایك بووەو قەت شەکەت نابێ
هەر ڕۆژەی لە دایك بوونێکی نوێیە، هەر هەڵهاتنێ لە دایك بوونێ،
منیش هەڵدێم
ئێمە هەمووماں لە کەل دێینە دەر، هەتاو بەڕووی هەتاوەوە هەڵدێ
خوان بە ڕووی خوانەوە هەڵدێ،
بەڕووی هەموو پیاوانەوە،

دەروازەی بوون هەڵم ستێنەو لە کەل وەرە دەر،
لێگەڕێ با ڕووی ئەو ڕۆژە ببینم،

لێگەڕێ با ڕووی ئەو شەوە ببینم،
هەموو شتێ ئەگۆڕێو پێکەوە ئەلکێ
ڕێچکەی خوێنی پرد، کوتەی دڵ،
بمبە بۆ ئەو پەڕی شەو
بۆ ئەو جێیەی کە من تۆم و
ئێمە یەکین،
بۆ وڵاتێك کە هەموو دەروونەکان پێکەوە شەتەك دراون:
دەروازەی بوون، بوونت بەربڵاوکەو ڕابە
ڕووت بگۆڕە، ڕەنگە تۆش هەبی،
دەست لە ئازاری رووت وەربدە، سەرهەڵبڕە
تا چاوت بەڕووی مندا بپشکوێ، کە ئەڕوانێتە ڕوخسارت،
هەتا دەمەدەمی مەرگ لەژیان بڕوانی،
ڕووی زەریا، نان، تاشەبەرد و کانی
سەرچاوەیەك، کە ڕووی ئێمە لە ڕوخسارێکی بێ ناودا
ئەفەوتێ، بوونی بێ ڕوخسار،
حوزوورێکی لە تاریف نەهاتوو لەنێو حزوورەکان..

دەمەوێ درێژەی بدەم و بچمە پێش، بەڵام بڕستم لێ بڕا:
هەر ساتە بەنێو ساتەکانی تردا دەجمێ
من خەوە بەردینە بێ خەونەکانم دیت
وەك بەردەکانیش لە کۆتایی ساڵەکاندا
زەمزەمەی خوێنی خۆمم بیست
کەلە دەمارەکانیا بە ورەور تێدەپەڕی، زەریا بەوادەی نووزەوە
دەنگی هەڵبڕیبوو،
یەکە یەکە دیوارەکان قەڵشیان ئەبرد،
گشت دەرکەکان ئەشکان و ئەکەوتنە سەر پشت
هەتاویش لەسەر تەوێڵما دەتۆقیێو
پێڵووە قووچاوەکانمی ئەبزاوت،
قۆناغەی بونمی ئەدڕی

*من له خۆم ڕزگار دەکرد،*
*منی لەخەوی حەیوانی سەدە بەردینەکان دەردەکێشا*
*جادووی ئاوێنەکانیشی، بە شۆڕشەوە ڕادەبوون،*
*بیەك لە بلوور، سپیچنارێك لە ئاو*
*فوارەیەکی کەڵەگەت کە -با- دەیچەمێنێتەوە*
*دارێك سەماکەر بەڵام ڕەگی لە قووڵاییدا*
*بەستێنی چۆمێ کە وێك دێ، ئەڕواتە پێشێ*
*بەسەر خۆیا ئەچەمێتەوەو ئەخولێتەوە*
*گشت دەمێکیش بەڕێوەیە:*

## پەراوێزی پێشەکی:

**1*-ڕۆمانێکی جیمس جۆیسە.**
**Trappist-*3، هێندێ لە مەسیحیەکان کە باوەڕیان بە بێدەنگی هەمیشەیی هەیە.**
**3*-فەیلەسوفێکی یۆنانییەو باوەڕی بە "دایمەگۆڕان" هەیە.**
**4*فەیلەسوفێکی ئەگزستانسیالیستە.**

***سیانزەهەمین ئەگەڕێتەوە... ئەوە هەمان یەکەمینە؛***
***بەربحوامیش هەر یەك شتە- یا ڕەنگە هەر ئەو ساتە بێ؛***
***ئاخۆ تۆ شاژنی، هۆ، یەکەمین و دوایین کەس؟***
***ئاخۆ تۆ سوڵتانی، هۆ تاقانەو دوایین خوا؟***
**(بەشێ لە شیعری "ئارتمیس" بەرهەمی ژرار دونرڤاڵ)**

## چەند یاداشتێك:

**1-میلوسینا:** ژنێکی پەریزادە لە ئەدەبی سەدەکانی ناوەڕاستی فەرەنسادا، کە دەبێتە ژنی شوالیە ریمۆند. بەو مەرجەی مێردەکەی لە ڕۆژێکی تایبەتی حەوتوودا چاوی پێی نەکەوێ. سەرەنجام ریمۆند بە پێی هاندانی براکەی، هەر لەو ڕۆژە تایبەتە دەچێتە پەیو شوێنی میلۆسیناو لە حەمام دا دەیبینێ، کە نیوەی لەشی مارە. ریمۆند دەیبینێو تاوانی بەتفەڕی یەکێ لە کوڕەکانی ئەخاتە پاڵ ئەو مارەوە، میلۆسینا وەك ئەژدیهایەك ڕادەکاو لەوەبەدوا هەر ساتێ دەمی مەرگی یەکێ لەخزمەکانی دێ، بەو شێوەیە لە دیوەخانی

"Urvasi, Prvavas" دەردەکەوێ، ئەفسانەی میلۆسینا وەك ئوستوورەی "Lusignan" هیندی دەچێ.

2- **پێرسەفونە :** خواوەندی دونیای ڕۆحەکان و هاوسەری خوای دونیای مردووەکانە، کە هادس هەڵی گرت و بردیە دونیای ژێرەوە.

3-**ئاگاممنون :** شای ئاراگواس و سەرکردەی سوپای ئاتن، لە شەڕی تێروادا کە کاتێ گەڕانەوە ژنەکەی دەیکوژێ.

4-**کاساندرا :** عازەبێ کە هەواڵی غەیبی هەبووە، کچی پەریام بووە، شای تێرواداو خوشکی پاریس بووە.

5-**کریتۆ :** هاواڵێکی سوقراط بووە.

6-**ئیکسولا پیوس :** خواوەندی پزیشکی لە ئەفسانە یونانیەکان دا.

7-**برۆتووس :** سەناتۆرێکی رۆمیو یەکێ لە قاتڵەکانی ژولیوس سەزارە.

8-**فرانسیسکۆمادرۆ :** سەرۆك کۆماری مەکسیك بووە (1913–1873)

**سەرچاوە:**

سنگ آفتاب، اوکتاویوپاز، ترجمه‌ء احمد میر علائی،/ چاپ دوم **1371**.

❑

# چەپکە گوڵێکی چکۆلە

■ گابریل گارسیا مارکیز
● و. لە فارسییەوە: جەمال ئەحمەد زادە


مارکیز

شەمەندەفەرەکە لەو تونێلەی لە دڵی گاشە بەردەکاندا لێدرابوو بە لارە لار هاتە دەر و ڕێگای کێڵگە بەرین و وەك یەکەکانی گرتە بەر. هەوا شێدارو لە شنەی دەریاش خەبەرێ نەبوو. هەوای قورس و خەفە بە پەنجەرەکەدا دەهاتە ناو واگۆنەکە. لەسەر جادەی باریکی قەراخ هێڵی ئاسنەکە. چەند عارەبانەیەکی پڕ لە هێشووی سەوزی مۆز دەبینرا، کە مانگا بە دوای خۆیدا ڕایانی دەکێشا. ئەو بەری جادەکە، لە نێو زەویە بێ بەرهەمەکاندا، لێرەو لەوێ چەند نووسینگەیەکی کاری لێبوو کە پانکەی کارەباییان تیادا دامەزرابوو، چەند بینای خشت و چەند خانوویەکیش دەبینرا کە لە تارمەکانیاندا کورسی و مێزی چکۆلەی سپی ڕیز کرابوو. سەعات یازدەی بەیانی بوو بەڵام هێشتا گەرما توندی نەکردبوو.

ژنەکە گوتی: "*باشتر وایە پەنجەرەکە پێوە بدەی، دەنا قژت بە ڕەشایی دووکەڵ ڕەش دەبێت*".

کچەکە هەوڵیدا پەنجەرەکە پێوەبدا، بەڵام ئەڵقەی شووشەکە ژەنگی هێنابوو و نەدەجوولا. لەم تەنیا واگۆنی دەرەجە سێیەدا، جگە لەوان کەسی تری تیا نەبوو. دووکەڵی لۆکۆمۆتیڤ لە پەنجەرەکە نەدەبڕا. کچەکە لەسەر کورسیەکەی هەستا. هەرچی هەیان بوو و نەیان بوو، واتە ئەو زەرفە نایلۆنیەی خواردەمەنی تێدا بوو و لەگەڵ ئەو چەپکە گوڵەی ڕۆژنامەیان تێوە پێچابوو، دایانانە سەر زەوی و لەسەر مێزەکەی ئەوبەر، دوور لە پەنجەرەکە، بەرامبەر بە دایکی دانیشت. هەردووکیان جل و بەرگی هەژارانە و سادەی تازیەیان لەبەردا بوو.

کچەکە دوازدە ساڵێك دەبوو، یەکەم جاریشی بوو سواری شەمەندەفەر بێت.

تەمەنی ژنەکە، بەو دەمارە مەیلەو ڕەشانەی پشت چاوی و بەو جەستە لەڕو لاوازەی و بەو کراسە شرۆڵەی بەری، ئەوەندە زۆر بوو پێ نەدەچوو دایکی کچەکە بێت. ژنەکە دانیشتبوو، بڕبڕەی پشتی لە پشتی مێزەکە توند کردبوو و جانتا (وێڕنی) یە توێخ هەڵدراوەکەی بە هەردوو دەست لە باوەش گرتبوو. گەورەیی تێکەڵ بە پەرێزی کەسێکی هەبوو کە بە هەژاری ڕاهاتبێ.

سەعات دوازدە ئیتر تەواو گەرمی کردبوو. شەمەندەفەرەکە نزیکەی دە دەقیقە بە مەبەستی ئاوگرتن لە وێستگەیەك وەستا کە بە چوار دەوریەوە هیچ شارێك نەدەبینرا. لەو بێدەنگیە تێکەڵ بە نهێنیەدا، کێڵگەکان دیمەنێکی جوان و دلگیریان هەبوو؛ بەڵام هەوای مەندی واگۆنەکە بۆنی چەرمی تازەی لێدەهات. شەمەندەفەرەکە بە خێراییەکی کەم دەڕۆیی. لە دوو شاری وەك یەك وەستا، کە خانووە داریەکانی ڕەنگی ڕوونیان هەبوو. ژنەکە وەنەوزی داو پاشان خەوی لێکەوت. کچەکە کەوشەکانی لە پێ داکەند و بەرەو ئاودەستەکە ڕۆیشت تا چەپکە گوڵەکە بخاتە زەرفی ئاوەکەوە.

کە گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی، دایکی چاوەڕێی دەکرد تا شتێك بخۆن. ژنەکە لەتکێ پەنیر و پارچەیەك نانی کابە و کولیچەیەکی دا بە کچەکە و هەر بەو جۆرە بەشی خۆشی لە زەرفە نایلۆنیەکە دەرهێنا. کاتی نانخواردن، شەمەندەفەرەکە زۆر لەسەرخۆ بە سەر پردێکی ئاسنیدا گوزەری کرد و بە شارێك دا وەك دوو شارەکەی پێشوو، تێپەڕی. بەڵام لە مەیدانی ئەم شارەدا کۆمەڵێك خەڵك دەبینرا. تاقمی ئۆرکێسترا لە ژێر تیشکی هەتاودا ئاوازێکی خۆشیان لێدەدا. لەو لاکەی تری شاریش، کێڵگەکان بە دەشتێك کۆتاییان دەهات کە لە بێ ئاوی‌دا شەقار شەقار ببوو. ژنەکە دەستی لە خواردن کێشایەوە.

گوتی: "*پێڵاوەکانت لە پێ بکە*".

کچەکە چاوی لە دەرەوە کرد؛ جگە لە دەشتی خۆڵکراو شتێك نەدەبینرا. لێرەدا خێرایی شەمەندەفەرەکە زیادی کرد. پاروی ئاخری کولیچەکەی خستەوە ناو زەرفە نایلۆنیەکە و پێڵاوەکانی لەپێ کرد. ژنەکە شانەکەی دایە دەستی.

گوتی: "*قژت دابهێنە*".

ئەو کاتەی کچەکە زوڵفەکانی شانە دەکرد، دەنگی شووتی شەمەندەفەرەکەش بەرز بووەوە. ژنەکە عارەقەی ملی وشك کردەوە و چەوری دەم و چاوی بە دەستی سڕی. کە کچەکە لە شانەکردنی زوڵفەکانی بووەوە شەمەندەفەرەکەش بە تەنیشت خانووەکانی قەراخ شارێکدا گەورەتر و خەمبارتر لە شاری پێشوو، تێدەپەڕی.

ژنەکە گوتی: "*ئەگەر کارێکت هەیە هەر ئێستا بیکە. دەنا دوایی بۆت نیە لە هیچ شوێنێك ئاو*

*بخۆیتەوە، تەنانەت ئەگەر لە تینوویەتیدا بشمری. بە هیچ جۆرێکیش نابێ بگری"* .

کچەکە سەری لەقاند، وشکە بایەکی سوتێنەر، لەگەڵ شووتی شەمەندەفەرو تەقە تەقی واگۆنە کۆنەکان، بە پەنجەرەکەدا هاتە ناوەوە. ژنەکە زەرفە نایلۆنیەکە و باقی خواردنەکەی کۆکردەوە و خستیە ناو جانتا دەستیەکەی. بۆ کاتێکی کەم، لەو بەر هەتاوی سێشەممەی مانگی ئووت دا، لە پشت پەنجەرەکەوە، دیمەنێکی تەواو لە شار بینرا. کچەکە ڕۆژنامە تەڕەکانی کە ئاویان لێ دەچۆڕا لە گوڵەکانەوە پێچا، کەمێك لە پەنجەرەکە دوور کەوتەوەو چاوی بڕیە دایکی. ژنەکە بە بزە وەڵامی دایەوە. دەنگی شووتی شەمەندەفەرەکە بەرز بۆوە، خێرایی کەم بووەوە و تۆزێك دواتر وەستا. وێستگەکە هێندە چۆڵ بوو باڵندە باڵی لێنەدەدا. ئەوبەری شەقامیش، لەنێو شۆستەکەدا کە دار چوالەکان سێبەریان خستبووە سەر گازینۆی بلیارد ئاوەڵا بوو. گەرما هەموو شاری لەخۆ گرتبوو. ژنەکەو کچەکە لە شەمەندەفەرەکە دابەزین، لە وێستگەی شەمەندەفەرەکە، کە کاشیەکانی درزیان بردبوو و گیا لەملاو لەولایانەوە هاتبوونە دەر، تێپەڕین و چوونە ئەوبەری شەقامەکە کە سێبەر بوو.

نزیکەی سەعات دوو بوو. شار لەو دەمەدا، لەبەر بێهێزی نیوەڕۆخەوی دەکرد. دووکانەکان، دایرەکان و خوێندنگە دەوڵەتیەکان هەموو لە سەعات یازدەڕا داخرابوون و تا نزیکەی سەعات چوار، کە شەمەندەفەرەکە دەکەوتەڕێ، نەدەکرانەوە. تەنیا هوتێلی بەرامبەر وێستگەی شەمەندەفەرەکەو نادی خواردنەوە و گازینۆی بلیارد و نووسینگەی تەلەگرافی تەنیشت گۆڕەپانەکە کراوە بوون. خانووەکان، کەزۆربەیان بە شێوەی خانووەکانی کۆمپانیای مۆز دروست کرابوون، دەرکەکانیان لە ناوەوە داخستبوو و، پەردە کرکرەییەکانیان دادابووەوە. ناو ماڵەکان هێندە گەرم بوو کە بە شێکیان نانی نیوەڕۆیان لەنێو حەوشەدا خواردبوو. چەند کەسێکیش کورسیەکانیان پاڵ دابوو بە دیوارەکانەوەو هەر لەوێ لەنێو شەقامەکەدا لەژێر سێبەری دار چوالەکاندا خەوتبوون.

ژنەکەو کچەکە هەوڵیان دەدا بەژێر سێبەری دار چوالەکاندا بڕۆن. بێئەوەی خەو لە کەسێك تێك بدەن هاتنە ناو شارەکەو یەکسەر بەرەو ماڵی قەشە ڕۆیشتن. ژنەکە بە نینۆك لە تۆڕی سیمی دەرکەکەیدا، کەمێك وەستاو دیسان بە نینۆك لێی دایەوە. دەنگی فرە فرِی پانکە لەناو ماڵەکەوە دەهات. هیچیان گوێیان لە دەنگی پێیەکە نەبوو. جیڕەی هێواشی دەرکەکەیان گوێ لێبوو و ئەوەندەی پێ نەچوو کە دەنگێك بە سڵ کردنەوەوە لە پشت تەلبەندەکەوە گوتی: *"کێیە؟"* ژنەکە هەوڵیدا لە پشت تەلبەندەکەوە سەیر بکات.

گوتی: *"ئیشم بە قەشەیە"* .

*"هەر ئێستا خەوتووە"* .

ژنەکە پێی داگرت: *"ئیشی پەلەم پێیەتی"* .

لە شێوەی قسەکردنی ژنەکەدا هێمنی دەخوێنرایەوە.

دەرکەکە بە بێدەنگی کەمێك کرایەوەو ژنێکی قەڵەویچکەی کەمێك بە تەمەن دەرکەوت ڕەنگی بە پێستەوە نەمابوو، زوڵفەکانیشی ڕەنگی ڕەش و خۆڵەمێشییان هەبوو. چاوەکانی لە پشت چاویلکە ئەستوورەکەیەوە چکۆلەتری دەنواند.

گوتی: *"وەرنە ناوەوە"* . و دەرکەکەی تەواو ئاوەڵا کرد.

چوونە ژوورێکەوە کە پڕ بوو لە بۆنی مەندی گوڵ. ژنی ماڵەکە ئەوانی بۆ لای مێزە داریەکە بردو ئیشارەی کرد دابنیشن، کچەکە دانیشت، بەڵام ژنەکە جانتاکەی توند بە هەر دوو دەست

گرتبوو و گێژ و وێژ وەستابوو. هیچ دەنگێک بەرزتر لە دەنگی فڕەفڕی پانکەکە نەدەبیسترا.

ژنی ماڵەکە دیسان لە کۆتایی ژوورەکە دەرکەوت. زۆر بە هێمنی گوتی: *"دەڵێ پاش سەعات سێ بێنەوە. تازە پێنج دەقیقەیە ڕاکشاوە"*.

ژنەکە گوتی: *"شەمەندەفەرەکە سەعات سێ و نیو ڕێ دەکەوێت"*.

وەڵامەکەی کورت و نیشانەی متمانە بە خۆبوونی پێوە دیار بوو بەڵام هەر هەمان شێوەی هێمن و خۆشی هەبوو. ژنی ماڵەکە بۆ یەکەم جار بزە گرتی.

گوتی: *"زۆر باشە"*.

کاتێک دەرکەکە بۆ جارێکی تریش پێوەدرایەوە، ژنەکە لە تەنیشت کچەکەی دانیشت. ژووری باریکی میوان بێنرخ و خاوێن بوو. ئەوبەری ئەو مەحاجەرەیەی ژوورەکەی کردبوو بە دوو کەرتەوە مێزێکی ساکاری لێبوو بۆ ئیش کردن کە ڕوومێزیەکی مشەمای لەسەر بوو و لەسەر مێزەکەش ماشینێکی کۆنی چاپ لە تەنیشت ئینجانەی گوڵەکە دەبینرا. قەفەزەی بایەگانی کەنیسەکەیان لە تەنیشت مێزەکە دانابوو. ڕواڵەتی نووسینگەکە دەری دەخست کە قەیرە کچێک ئەوێی ڕێک و پێک کردووە.

دەرکەی کۆتایی ژوورەکە کرایەوە و ئەم جارەیان قەشە، کە چاویلکەکەی بە دەسەسڕ خاوێن دەکردەوە دەرکەوت. تەنیا ئەو کاتەی چاویلکەکەی لە چاو کرد دەرکەوت کە برای ئەو ژنەیە کە دەرکەی کردەوە.

پرسیاری کرد: *"چ ئەمرێکتان هەیە؟"*.

ژنەکە گوتی: *"کلیلەکانی قەبرستانمان دەوێ"*.

کچەکە گوڵەکانی نابووە سەرکۆشی، دانیشتبوو و قاچی لە سەریەک دانابوون قەشە سەرەتا سەیری ئەو و دواتر سەیری ژنەکەی کردو پاشانیش لە پشت تەلبەندەکەوە چاوی لە ئاسمانی ڕوون و بێ هەور بڕی.

گوتی: *"بەم گەرمایە باشتر وابوو ئارامتان بگرتایە تا ڕۆژ ئاوا دەبوو"*

ژنەکە بێ ئەوەی قسە بکات سەری ڕاوەشاند.

قەشەکە هاتە ئەمبەری پلیکانەکە و لەنێو کەنتۆرەکەدا دەفتەرێکی یادوەری، کە بە مشەما بەرگی گیرابوو، لەگەڵ قەڵەمدانێکی داری و شووشەیەکی مورەکەبی هەڵگرت و لە پشت مێزەکە دانیشت. دەستەکانی گەلێک تووکن بوون و، بەمە بێ موویی سەری قەرە بوو دەبووەوە.

پرسی: *"دەتانەوێ بچنە سەر کام قەبر؟"*.

ژنەکە گوتی: *"قەبری کارلۆس سێنتێنۆ"*[٩].

"کێ؟"

ژنەکە دووپاتی کردەوە: "کارلوس سێنتێنۆ."

قەشە دیسان تێ نەگەیەیی.

ژنەکە هەر بەو ئاوازە پێی گوت: *"ئەو دزەی حەوتوویەک لەمەوپێش لێرە کوژرا. من دایکی ئەوم"*.

قەشە هەر لەسەریەوە تا قاچی تەماشای کرد. ژنەکە بە سەبرو حەوسەڵەو بە بێ گەردی چاوی تێبڕی. قەشەکە سور بووەوە. سەری داخست و خۆی خەریکی نووسین کرد. زانیاری لە ژنەکە دەپرسی و لە شوێنە بەتاڵەکانی سەر پەڕەکە دەینووسی و ژنەکەش، بێ ئەوەی پەلە بکات، وردەکاریەکانی وا بە حەوسەڵە بۆ شیدەکردەوە دەتگوت لە ڕووی شتێکەوە دەیخوێنێتەوە. وردە وردە قەشە دەم و چاوی ئارەقەی لێ نیشت. کچەکە ئەڵقەی پێڵاوی قاچی چەپی کردەوە. پاژنەی پێی بە هێواشی دەرهێناو پێی خستە سەر شوڵی مێزەکە. پاشان خەریکی قاچی ڕاستی بوو.

کارەساتەکە دوو شەممەی حەوتووی پێشوو، سەعات سێ، دوو سێ کۆڵان ئەولاتر ڕووی دابوو. ڕێبێکا، ئەو بێوەژنە تەنیایەی کە لە خانوویەکی پڕ لە شڕو شاڵاتدا دەژیا. لەنێو لێزمەی دەنگە دەنگی باراندا گوێی لە دەنگی کەسێك بوو، کە لە دەرەوەڕا هەوڵی دەدا بە تەوژم دەرکەکەی پێشەوە بکاتەوە. ژنەکە لەسەر جێگا هەستا، لە ناو سنووقەکەیدا لە دووی دەمانچەیەك گەڕا کە لە زەمانی سەرهەنگ (ئۆرێلیانۆ بووێندیا)[2] وە کەس تەقەی پێ نەکردبوو، بێئەوەی چراکە هەڵبکات چووە ژووری میوان. ئەوەی ڕێنوێنی ژنەکەی دەکرد دەنگە دەنگی قفڵەکە نەبوو بەڵکو ترسێك بوو کە بیست و پێنج ساڵ تەنیایی لە دەرونیدا کەڵەکەی کردبوو. لە زەینیدا نە تەنیا شوێنی دەرکەکە بەڵکو مەودای نێوان زەوییەکەو قفڵەکەی هەڵسەنگاند. دەمانچەکەی توند بە هەردوو دەستی گرت، چاوەکانی لێك ناو دەستی بە ماشەکەیا نا.

یەکەم جار بوو کە لە هەموو تەمەنیدا تەقەی دەکرد. دەنگی تەقینەوە کە هێور بووەوە، جگە لە چپەی نم نمی بارانی سەر سەربانە گڵەکە شتێکی تر نە دەبیسترا. پاشان دەنگی زرینگە ئاسای کەوتنی شتێك لەسەر هەیوانی چیمەنتۆ و دەنگێکی نزم و خۆش بەڵام زۆر بێ هێزی هاتە گوێ: "ئاخ، دایکە". ئەو پیاوە داماوەی کە ڕۆژی دوایی لە پێش ماڵەکەدا کەوتبوو و مێشکی پژابوو. کراسێکی فلانێلی خەت خەتی ڕەنگاو ڕەنگ و پانتۆڵێکی ئاسایی لەبەردا بوو، کە لە جێی قایش تەنافێکی لێ بەستبوو. پێڵاوی لە پێدا نەبوو. لەو شارەشدا غەریب بوو.

قەشەکە ئیشی نووسینەکەی تەواو کرد. لە ژێر لێوەوە گوتی: *"گوتت ناوی کارلۆس سێنتێنۆس بوو"*.

ژنەکە گوتی: *"سێنتێنۆ ئایالا[3]. تاقانە کوڕم بوو"*.

قەشە جارێکی تریش چوو بۆ لای کەنتۆرەکە. دوو کلیلی گەورەی ژەنگاوی لە پشت دەرکەکە هەڵواسرابوو. کچەکە لە خەیاڵی خۆیدا دەیهێنایە پێش چاوی کە کلیلەکانی (پیتەر)ی پیرۆزن، هەروەك دایکیشی لە منداڵیدا وای هێنابووە بەرچاو، هەر وەك ئەو ڕۆژە کە قەشەش هێنابوویە بەرچاوی خۆی. قەشە کلیلکەکانی هەڵگرت، لە سەر ئەو دەفتەرە کراوەی کە لەسەر پلیکانەکان دانرا بوو، ڕوو لە ژنەکە، ئیشارەتی کرد بە شوێنێك لە سەر ئەو پەڕەیەی کە تازە نووسیبووی و گوتی:

*"ئێرە ئیمزا بکەن"*.

ژنەکە جانتاکەی نایە بن باڵی و ناوی خۆی بە خەتێکی ناخۆش نووسی. کچەکە گوڵەکانی هەڵگرت، نەرمە نەرمە هاتە تەنیشت پلیکانەکەو چاوی بڕیە دایکی.

قەشە هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: *"قەت هەوڵتان نەدابوو بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنوێنی بکەن؟"*

ژنەکە کە ئیمزاکەی تەواو ببوو، گوتی:

*"مرۆڤێکی زۆر باش بوو"*.

قەشە لە پێشدا چاوێکی لە ژنەکە کرد و پاشانیش چاوێکی لە کچەکە کرد و بە سەرسوڕمانێکی ئیماندارانەوە وای بە بیردا هات کە ئەوان نیازیان نیە بگرین و فرمێسك بڕێژن. ژنەکە هەر بەو ئاوازە درێژەی پێدا:

*"پێم دەگوت کە قەت دزی لە خەڵکی داماو نەکا. ئەویش بە قسەی دەکردم. ئەوجا بۆت باس بکەم، قەدیم هەر جارکە دەچوو بۆ بۆکسێن، ئەوەندەی مستاوێ دەکەوت کە سێ شەو و ڕۆژ هێزی نەبوو لە جێگاکەی هەستێ"*.

کچەکە بەدوای قسەکانی دایکی کەوت و گوتی: *"ناچار بوو هەموو ددانەکانی بکێشێ"*.

ژنەکە گوتی: *"ڕاستە. ئەو ڕۆژانە هەر پارووێك دەمخوارد تامی ئەو مستانەی دەدا کە شەوانی شەممە لە سەر و چاوی کوڕەکەم دەدرا"*.

قەشە گوتی: *"ناکرێ لە خواستی خودا تێ بگەین"*.

بەڵام ئەم قسەیەی زۆر بە دڵنیاییەوە نەدەگوت؛ هەم بەهۆی ئەزموونی زۆرەوە کە تا ڕادەیەك تووشی گومانی کردبوو، هەم بە هۆی گەرماوە. پێی گوتن کە دەبێ سەر و چاویان داپۆشن بۆ ئەوەی تووشی نەخۆشی تاوەسووت نەبن.

بە دەم باوێشك و وەنەوزەوە چەند دەستوورێکی دا کە چۆن قەبری کارلۆس سێنتینۆ بدۆزنەوە. کاتی گەڕانەوەش پێویستی نەدەکرد لە دەرکە بدەن، کلیلەکەیان دەخستە ژێر دەرکەکەوە، ئەگەر بۆشیان بلوایە، هەر لەوێ کەمێك پارەیان بۆ کەنیسە دادەنا. ژنەکە زۆر بە وردی گوێی لە فرمانەکانی گرت و بێ ئەوەی بزە بکات سوپاسی کرد.

قەشە پێش ئەوەی دەرکە بکاتەوە کەسێکی بینی کە لوتی بە تەلبەندەکەوە نابوو سەیری ناو ماڵەکەی دەکرد. لە دەرەوەی ماڵەکەش تاقمێك منداڵ وەستابوون. دەرکەکە کە بە تەواوی کرایەوە، منداڵەکان بڵاوەیان کرد. بە پێی عادەتی جاران لەو سەعاتەدا کەس نەدەهاتە ناو شەقام بەڵام ئێستا نەك تەنیا منداڵەکان بەڵکو چەند کەسێکی گەورەش لە ژێر دار چوالەکاندا وەستابوون.

قەشە سەیرێکی ناو شەقامەکەی کرد کە گەرما گرتبوویە خۆی و مەسەلەکە تێگەیی. دەرکەکەی بە هێواشی پێوەدایەوە.

بێ ئەوەی سەیری ژنەکە بکات، گوتی: *"تۆزێك ڕاوەستن"*.

خوشکی قەشە، کە هێلەکێکی ڕەشی بەسەر کراسی خەوەکەیدا لەبەر کردبوو، زوڵفەکانی بەسەر شانیدا بەردابووەوە، لەناو دەرکەی کۆتایی ژوورەکە دەرکەوت. بێئەوەی قسە بکات سەیری قەشەی دەکرد.

قەشە گوتی: *"چ باسە؟"*

خوشکەکەی لە ژێر لێوەوە گوتی: *"خەڵکی بینیویانن"*.

قەشە گوتی: *"چاك وایە لە دەرکەی حەوشەکەوە بڕۆن"*.

خوشکەکەی گوتی: *"ئەوێش هەر وایە. هەموو لە پشت پەنجەرەکانەوە کۆبوونەتەوە"*.

ژنەکە وا دەهاتە بەرچاو کە تا ئەو کاتە بیری لێ نەکردبێتەوە. هەوڵیدا لە پشت تەلبەندەکانەوە سەیری شەقامەکە بکات. پاشان چەپکە گوڵەکەی وەرگرت و بۆ لای دەرکەکە ڕۆیی. کچەکە دوای کەوت.

قەشەکە گوتی: *"بوەستن با خۆر ئاوا ببێ"*.

خوشکی قەشە، کە لە کۆتایی ژوورەکەدا بێ جووڵە وەستابوو، گوتی:

*"گەرما دەتانکات بە کەباب. بوەستن چەترتان بدەمێ"*.

ژنەکە گوتی: *"سوپاس، ئاوا ئاسودەترین"*.

دەستی کچەکەی گرت و پێی نایە شەقامەکە.

* * *

**سەرچاوە:**

کتێبی "پرندگان مرده" نووسینی گابریل گارسیا مارکیز– وەرگێر بۆ فارسی: احمد گلشیری– تهران1373. وەرگێڕ بۆ کوردی: جەمال ئەحمەد زادە.

**پەراوێز:**

1- Carlos Centeno.

2- Aureliano Buendia.

3- Ayala.

□

# گفتوگۆ

■ لەگەڵ کۆرنلیۆس کاستۆریادیس دا

سازدانی: ڕامین جەهانبەگلو



## گفتوگۆیەك لەگەڵ:

# "كورنلیۆس كاستۆریادیس"دا

■ رامین جەهانبەگلو

● و: ڕەووف بێگەرد

كورنلیۆس كاستۆریادیس، لە بیرو سیاسەتی سەردەمی دوای جەنگدا، یەكێكە لەناوە دیارەكانی فەرەنسا، لەهەموو دەیەی **1950**و سەرەتای دەیەی **1960**دا لەگەڵ كەسایەتیە ناودارەكانی وەك كلود لفورو ژان فرانسوا لیوتار بووە ئەندامی ڕێكخراوەیەكی سیاسی ئەفسانە ئامێز بەناوی (**یان سوسیالیزم یان بەربەریەت**) بەڵام ئەو بە پێچەوانەی هەندێك لە هاوسەردەمەكانیەوە تا كۆتایی تەمەنی لەسەر بیری سیاسی رادیكاڵیانەی خۆی لە چالاكیدا بوو.

كاستۆریادیس بەوە بەناوبانگە كە هەوڵی داوە ئەنگێزەی ئازادی خوازی بیری ماركس، كە پوختەی چەمكە سەرەكیەكەی لە خودموختاری "**Autonomy**" دایە لە بونیادە وشك و دوگماكەی ماركسیزم رزگار بكات. ئەو هەر لە سەرەتای چالاكی سیاسیدا، بەجۆرێكی نائاسایی، رەخنەی توندی لە بیروكراتیەتی كۆمۆنیستی تێكەڵ كرد بە بەرپرسیارەتی بە چەپی شۆڕشگێڕەوە، كاستۆریادیس لە كۆمەڵێك لێكۆڵینەوەیدا لەسەر فەلسەفەی زانست، تیۆری كۆمەڵایەتی، فەلسەفەی سیاسی و هیرمونوتیك، تەفسیری لە تیۆرەكانی فرۆیدا دەوری گرنكی دیوە، هێڵی سەرەكی بیری كۆمەڵایەتی كاستۆریادیس بریتیە لە دامەزراندنێكی خەیاڵیانەی كۆمەڵگایەك كە ساڵی **1975** لە فەرەنسادا بڵاوبوەوە، هەموو بەرهەمە سیاسیو كۆمەڵایەتیەكانی لە دوو بەرگا لە بنكەی بڵاوكردنەوەی زانكۆیی –مینەسوتا–(**1988**)



**کۆرنیلیۆس کاستۆریادیس**

کەوتە بەردەستی خوێنەران. دەزگای بڵاوکردنەوەی زانکۆی ئوکسفوردیش ساڵی **1991** هەڵبژاردەیەکی لە نوێترین نووسراوی فەلسەفی، سیاسی، خۆبەڕێوەبردن لە نیویۆرك بڵاوکردەوە.

لە کۆتایی دەیەکانی **1970**دا کاستۆر یادیس وەك دەروون شیکارێك لە پاریس کەوتە کارکردن. لە باری تیۆریەوە لە گروپێکی گرنگی دەروون شیکارەوە نزیك بوو کە پەیرەویان لە (لاکان) دەکردو ساڵی **1969** بەهۆی کاری ناجۆری لاکانەوە لە شێوەی پەروەردەو فێرکردندا لێی جیابوونەوە، کاستۆریادیس ساڵی **1997** لە پاریس مرد، ساڵی **1990** پیتەر دیوز و پیتەر ئسبورن لە زانکۆی ئسکس ئەم دیمانەیەیان لەگەڵ سازداوە. پاشان مانگنامەی مانتیلی ریویو بە بۆنەی مردنیەوە لە کەشکۆڵە فەلسەفیەکەیدا بڵاوی کردۆتەوە.

***-ئەگەر بە یارمەتی باسی ئەو ئەزموونە بنەڕەتیانە بکەیت کە تۆیان بەرەو فەلسەفەو سیاسەت و دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان ئەو دوانە کێشا.***

+پێش هەر شتێك دەمەوێت ئەوە بڵێم کە هەمیشە لە مندا مێملیەکی فیکری هەبوە، لەم ڕووەوە قەرزاری بنەماڵەکەمم، من زۆر زوو، بە جۆرێکی پێکەنین هێنەر، یەعنی لە تەمەنی **13** ساڵیدا ئاشنای فەلسەفە بووم. ساڵی **1935** لە رێگای ساڵنامە کلاسیکیەکانەوە رووم لە فەلسەفە کردو، لە ڕێی بڵاوکراوە کۆمۆنیستیەکانەوە لە یۆنان و بەردەوامیش لە ڕێی بەرهەمی مارکسەوە رووم لە سیاسەت کرد. ئەم دوو زەمینەیە هەمیشە هاوتەریبی یەکتر بوون.

ئەوەی منی بۆ مارکسیەت راکێشا، وەك ئەوەی کە ئەوسا خۆم شایەت بووم، هەستێکی زۆری نائومێدانە بوو لە ناعەدالەتی باری ئەوسا.

*-باری سیاسی ئەوسای یۆنان چۆن بوو؟*

+لە ساڵی 1935دا یۆنان لەژێر چەپۆکی دیکتاتۆریەتی میتاکزاسدا بوو کە لە هەموو سەردەمی شەڕو داگیرکردنی یۆناندا هەرمایەوە. ئەوسا من لە دوا ساڵی خوێندنی ناوەندیا بووم، پەیوەندیم بە ڕێکخراوێکی لاوانی کۆمۆنیستی نهێنیەوە کرد، ئەو لایەنەی کە من کارم تیا دەکرد زوو هەڵوەشا، چونکە هەموو هاوڕێکانم گیران، من بەخت یاری کردم و نەگیرام.

کە یۆنان داگیرکرا دەستم کردەوە بە چالاکی سیاسی، سەرەتا لەگەڵ چەند هاوڕێیەکدا جەختمان بۆ گۆڕینی سیاسەتی حیزبی کۆمۆنیست بوو، بێگومان ئێستا دەردەکەوێت کە هەوڵەکان بێ ئومێد بوون. دوای ماوەیەك گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە ئومێد بەخشین بەو هەوڵانە بێجگە لەوەهم چیتر نەبوون. پاشان بوومە هەواداری تروتسکیەکان و بەدرێژایی داگیرکردنەکە لەگەڵ ئەواندا کارم کرد. پاشان ساڵی 1945–1946 چووم بۆ فەرەنسا، لەوێ پەیوەندیم بە حیزبی تروتسکیەکانەوە کرد، بەڵام رەخنەم لە ستراتیژی تروتسکیەکان هەبوو کە رووسیایان بە دەوڵەتی کرێکاری دەدایە قەڵەم، سەرئەنجام ئێمە ساڵی 1948–1949 بڵاوەمان لێ کرد. پاشان دەستمان کرد بەکارکردن لە (یا سۆسیالیزم یا بەربەریەت)دا کە تا ساڵی 1965 بەشێوەی بڵاوکراوەو لە ساڵی 1967ەوە بەشێوەی گرووپ بەردەوام بوو.

*-دەتوانین بڵێین کە تۆ هەر لەسەرەتاوە تەفسیری تروتسکیەکان کە دەربارەی یەکێتی شورەوی هەیان بوو قبووڵت نەکرد؟ یان بۆ ماوەیەك قبووڵت بوو؟*

+بەڵێ دوای ماوەیەکی زۆر کورت، هەرکە لە ستالینیەکان دابڕام، یەکەم شت کە هەستم پێکرد ئەوە بوو کە کاری شۆڕشگێڕی روو لە نەمانەو لە روسیادا بیرۆکراتیەتی چینێکی مشەخۆر فەرمانڕەوایە. بەڵام زۆر زوو رووم لەو بیرەش وەرگێڕا، دەبێت ئەوە بزانیت کە لەسەردەمی دیکتاتۆریەتی میتاکزاسدا هەموو کتێبە چەپەکان سووتێنرابوون و دوای ئەوە بوو وڵاتەکە داگیرکرا، بۆیە هەر نەدەبوو دەست بۆ ئەو جۆرە ئەدەبیاتە ببرێت. لەگەڵ ئەوەیشدا، لە ساڵی 1942–1943دا بەخت یاری کردم و چەند بەرگێکی کتێبی (شۆڕشی خیانەت لێکراوی تروتسکی)و (ستالین)ی بوریس سفارین کە کتێبێکی سەرسوڕهێنەرەو ئێستا لە فەرەنسادا چاپی تازەی کراوەتەوە پەیدا کرد، لە کتێبی (شۆڕشی خیانەت لێکراو)دا بۆم دەرکەوت تروتسکی کەوتۆتە دژایەتی لەگەڵ خۆیدا.

*-دژایەتیەکە لە چیدایە؟*

+بۆ نموونە تروتسکی دەڵێت روسیا دەوڵەتێکە لە بنەڕەتدا سوسیالستیە، چونکە هەموو موڵکایەتیەکان لەژێر دەستی دەوڵەتدایە، کەچی هەردوای ئەوە دەڵێت دەوڵەتی بیروکراتیەکانە. کەوابێت ئەوە ئاشکرایە کە موڵکداریەتیش لەژێر دەستی بیروکراتیەکاندایە، لێرەدا پرسیارێکی لۆژیکی دێتە ئاراوە کە بیروکراتیەت چ پەیوەندیەکی بەدەوڵەتی کرێکاریەوە هەیە، کاتێك کە ئامێرەکانی بەرهەمهێنان بەدەست بیروکراتەوە بێت؟ وەك لە دواییدا تێگەیشتم ئەم بیرە ماوەیەکی زۆر بوو پەراگەندە ببوو. دەکرا لەنێو دانیشتوانی ئۆردوگای زۆرەملێی روسیادا لە 1926–1927

پەیدای بکەیت. بیروکراتیەت خەریك بوو ببێتە چینێکی فەرمانڕەوا و چەوسێنەر. ئەوەی ئەم باوەڕەی لای ئێمە بەهێزتر کرد یەکەمین هەوڵی ستالین بوو بۆ ئەنجامدانی کودەتایەك لە یۆناندا لە دیسەمبەری ساڵی **1944**دا، ئەمە بۆ ئەو خەڵکانەی لەژێر رابەرایەتی حیزبی کۆمۆنیستا خەباتیان دەکرد شتێکی کەم نەبوو، بەڵام لای من بارەکە تەواو ڕوون و ئاشکرا بوو، ئەگەر لەوکاتەدا ستالینیەکان دەسەڵاتیان بگرتایەتە دەست رژێمێکی وەك رژێمی روسیایان دادەمەزراند، من ئەوسا ئەمەم وت و نوسیشم، ئەمە تاقە شتێك بوو کە ناکۆکی خستە نێوان من و خەبات کەرێکی کۆنەوە -ئیسپیروس ئیستیناس- کە لە هەموو ئەو ماوەیەدا لەگەڵیا کارم کردبوو و بەمانایەك مامۆستای سیاسی من بوو. چۆن دەبوو ئەم ڕووداوە لەسەر بنەمای تیۆری تروتسکی دەربارەی رژێمی روسیا- واتا شۆڕشی پرولیتاری -کە فاسید بووە لێك بدرێتەوە؟

بیروکراتیەت وەك هێزێکی مێژوویی نیمچە خۆبەڕێوەبەر وا پێدەچوو بیەوێت لەسەر بناغەی سوودو ڕوانینی خۆی رژێمێك دابمەزرێنێت.

تێگەیشتنی تەواوی سیاسی من دەربارەی بیروکراسیو دەربارەی پرسیاری سوسیالیزم چیە؟ لەو کاتەدا سەری هەڵدا، ئەگەر سوسیالیزم بە میللی کردنی موڵکایەتی نیەو ئەگەر تەنیا شێوازی بیروکراسی بەرنامە دارێژراوێکی چڕ نیە ئەی چیە؟ لەمەوە یەکسەر بیری خۆ فەرمانڕەوایی هاتە ئاراوە؛ سۆسیالیزم وەك خۆبەڕێوەبردن و خۆفەرمانڕەوایی لە بەرهەمهێنان و ژیانی سیاسی. واتا خودموختاریی کۆمەڵ لەسەر هەموو ئاستەکان.

***-دابڕانت لە تروتسکیەکان چ کاریگەریەکی هەبوو لە سەر ناسینی شۆڕشی روسیا؟ وەك من تێگەیشتووم (یا سۆسیالیزم یا بەربەریەت) لەگەڵ بیری (ئۆپۆزسیۆنی چەپ)ی یەکێتی شورەویدا تەواو یەك بوون.***

+بەڵێ، ئەمە تاڕادەیك وایە، بەڵام ئەوان وەك پێویست پێش نەکەوتن، پاشان لە ساڵی **1921**دا من دەقێکم دەربارەی نامەیەکی ئالکساندرا کولونتای بۆ ئۆپۆزسیۆنی چەپ و سنووردارییەکەی نووسی، بەڵام لە راستیا ئەمە مەسەلەی ئێمە نیە، کەموکووڕیەکان لەمانەدا ئاشکرا دەبن: دەربارەی دەوری حیزب، دەوری یەکێتی کرێکاران و شتی دی. هەڵبەتە راپەڕینی کرونشتات دوا ئاماژەی هەندێك چالاکی سەربەخۆی جەماوەر بوون کە حیزبی بەلشەویك تێکی شکاندن. بەڵام رەخنەکانی من لە بیروکراسی زۆر بە خێرایی سەری کێشایە رەخنەگرتن لە زۆر شتی دی. رەخنە لە تێڕوانینی لینینیست لە حیزب و پاشان ئابووریی مارکسیزم. ئەو کاتە من وەك ئابووری زان و بەتایبەت لەسەر کتێبی **داس کاپیتاڵ** دەستبەکار بووم، من نەمتوانی لەم کتێبەدا هیچ شتێك لە ڕووداوە واقعیەکان تێ بگەم، هەروەها لە ڕووی تیوریشەوە، هەموو رەخنەی من لە تیورەی بەهاوە دەست پێ دەکات کە دوا شکڵی لە دەقەکانی مارکس و ئەرەستۆوە سەرچاوە دەگرێت کە لە **Crossroads in the Labyrinth** بڵاوبۆتەوە. دوای ئەوە ڕەخنەم لە هەموو تێڕوانینی مارکسیستی بوو لە سوسیالیزم و لایەنە خەیاڵ ئامێزەکانی: نەهێشتنی بیری سیاسەت، چۆنیەتی ئەو بەهەشتەی کە لەدەست نووسەکان (دەستنووسەکانی مارکس-وەرگێڕ)دا وەسفکراوەو، ئەو جێگایەی کە ئێوە بەیانیان

دەبنە ماسیگر تیایداو دوای نیوەڕۆ شاعیرو شتی تر، هەڵبەتە نازانم دوای تاریکی داکەوتن چ کارێکی تر دەکەن! ئەم بیرەیش لای مارکس بایەخێکی رەهای هەیە -کە کار کۆیلایەتیەو ئازادی لە دەرەوەی بواری کارە- ئازادی دەست بەتاڵیە. ئەمە لە نووسینەکانی مارکسدا دووبارە دەبنەوە.کارمەیدانێکە ناچاری بیکەیت یان پێویستە بیکەیت.

***-ئەمەیان زیاتر تایبەتە بە مارکسی پیرەوە، وا نیە؟***

+ئەمە لە داس کاپیتاڵدایە، قەڵەمرەوی ئازادی تەنیا لە رێگای کەمکردنەوەی کارەوە بەدی دێت، ئێوە بەدرێژایی کات لەژێر کۆنترۆڵی زەرووزەتدان، ئەمە هەر لە بناغەوە دژایەتیە لەگەڵ هەر ئەندێشەیەکی خۆبەڕێوەبردنی بەرهەمهێنەران و خودفەرمانڕەوایی مەبەستی بەرهەمهێنان.

**-سەردەمێك كە لە بناغەوە گۆڕاوەو سەردەمێك كە تەكنەلۆژیایش وەك مەیدانی راهێنانی توانا مرۆڤایەتیەكان و ئازادیەكانی مرۆڤ گۆڕانی بەسەردا هاتووە -بەڵام ماركس ئاماژەی بۆ كاركردووە وەك -پێویستیە سەرەتاییەكانی ژیان-**

+ئەمە لە دەستنووسە سەرەتاییەکاندایە: بەڵام لە سیستمی فیکری مارکسدا لەبیرکراوە، پاشان نۆرە دێتە سەر رەخنە لە شتێك کە دەتوانین پێی بڵێین ئیکونیوزمی (ئابووری گەرایی) مارکسیستی: چەمکی خەیاڵی رەسەنی دان بە بەرهەمهێنان و ئابووری لەسەرانسەری مێژوودا.

ئەمە بە ئاشکرا نەقڵ کردنی چەمکی خەیاڵی سەرمایەداریە بۆ سەراپای مێژووی مرۆڤایەتی، پاشان بەرهەمی فەلسەفی (**بیری مارکسیستی و شۆڕش**) یەکەمین بەشی بنەمای بیری کۆمەڵ The imaginary institution of society ی بە دواداهات کە لە پێنج ژمارەی دوایی **یا سۆسیالیزم یا بەربەریەت** لە ساڵانی **945-946**دا بڵاوبوونەوە.

**یا سوسیالیزم یا بەربەریەت**

*-تكایە لە بارەی یا سۆسیالیزم یا بەربەریەتەوە بۆمان بدوێ، ئەو پێكهاتە سیاسیەی كارت تیا دەكرد چی بوو؟ رەخنەتان دەربارەی تێڕوانینی لینینیستی لە بارەی حیزب. گرووپ لە دیدی ناوەوەداو لەچۆنیەتی رێكخستنیەوە چۆن بوو؟ بەشداریەكانی چۆن ئەنجام دەدا؟ بەلای تۆوە چ دەستكەوتێكی بەردەوامی هەبوو؟*

+ئەم گرفتە رێکخراوەییە بەناوبانگە هەمیشەیی بوو، لە قۆناغی یەکەمدا هەندێك لە دواکەوتووەکان و لەوانە خۆیشم (کە لە دەوروبەری ساڵی **1950**دا لەناوچوو) لە بەرژەوەندی تێڕوانینەکانی لینینیستی بۆ حیزب زۆر بەهێزبوون، ناکۆکیەك لەناوخۆدا هەبوو دەربارەی رێکخستن، لەنێوان ئەوانەدا کە بڕوایان وابوو رێکخستن هیچ پێویست ناکات (پرۆلیتاریا خۆی هەموو کارەکان ئەنجام دەدات) ئێمە تاقە گرووپێکین کە بیری پەروەردە دەکەین و ئەوانی دی کە وەك من جەختیان دەکرد (ئێستایش هەر لە سەر قسەی خۆمم کە رێکخستنێکی سیاسی پێویستە) هەڵبەتە نەك وەك حیزبێکی پێشڕەو بەڵکو جۆرێك لە رێکخستنی سیاسی، چالاکی سیاسی، چالاکیەکی ناوکۆیی کە هەنگاوی دیاریکراو بۆخۆی دادەنێ و ئیدی ئەو هەنگاوە بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەیەك بێت یان هەر شتێکی تر بێت. مرۆ ناچارە بەوەی کۆمەڵێك بڕیاری بدات، لێرەوە بۆ بڕیاردان دەبێت کۆمەڵێك مەرج

دابنرێت، واتــە زۆرینــە حوکـم دەکـات، بـەڵام ئاشکرایە کەمایەتیش دەبێت بیروبۆچوونـەکانی خۆی بەشێوەیەکی ئاشکرا رابگەیـەنێت. بـەڵام هـەندێك شت هەیە پێویستە بەکۆی دەنگـەکان بڕیاری لێ بدرێت. دەبێت لە چالاکیـە گشتیەکاندا ئارادەیەك هاوسەنگی هەبێت. بـەڵام من هـەر لـە سەرەتاوە وتم کە ئـەنجامدانی ئـەم کـارە دەبێت تـەنیا لەسـەر بنـەمای جۆرێـك لـە ئەندێشـەی خۆبەڕێوەبردنی کۆیی، ئەنجام بدرێت، هـەروەها رێکخستنی سیاسی دەتوانێت رۆڵێکی هەبێت نەك وەك نموونەیـەك بـەڵکو وەك جۆرێـك چـالاکی شایانی لاسایی‌کردنەوە، نیشانی کەسەکانی بدات کە دەتوانن بەشێوەیەکی نێوکۆیی خۆرێك بخـەن و دەتوانن خۆیان کاری خۆیان بەڕێوەبەرن.

***-ئەمـە زۆر لـە تـێڕوانینی رێکخراوەکـانی رۆزالوکسمبورگ دەچێت.***

+ئەشێ بەشێوەیەك لە شـێوەکان وابێـت، بێگومـان لـەم روانگەیـەوە ئـەم مەسـەلەیە بـووە هـۆی جیابوونـەوەی لفۆر، ئـەو دژی هـەر جـۆرە رێکخسـتنێکی رەسمی بـوو "ئێمـە گرووپێکـین رووناکبیر، ئێمە تەنیا گۆڤار دەردەکەین و بەس"

دەبێـت ئێـوە هەلومـەرجی ئـــەو کاتـــەتان لـەیادبێت، جـەنگی سـارد نزیـك سـاڵی **1947** دەسـتی پێکـردو لـە ئـەورووپاو بەتایبـەتی لـە فەرەنسـادا، سـتالینیەکان، تـا ئەندازەیـــەك باڵادەست بوون، تەنانەت ئەگەر لە ساڵی **1947**دا وازیـان لـە حوکمڕانیـش بهێنایـە تـەواوی چەپـەکانیان لەگـەڵدا بـوو، چـیرۆکی سـارتەرو ئەوانی دی، هاوسەفەرەکانت لە بیرە؟ ئێمە زۆر گۆشـەگیر بووین، سـەردەمێك بـوو دوای شـەڕی کۆریـا، گرووپەکـەمان لـە دە دوانـزە کـەس تێنەدەپەڕی، ئەوانـەی گوێیان بـۆ دەگـرتین زۆر کەم بوون، گرووپە پۆست چەپە هەمیشەییەکان.

ئێمـە زەمینـەی پۆسـت چـەپیمان نەهێشـت، هەرکەس بایەخێکی هەبوو هاتە نێـو **یـا سۆسیالیزم یان بەربەریەتـەوە** بێجگـە لـە تروتسکیەکان، بـەڵام بارەکە زۆر دژوار بوو، پاشان، دوای سـاڵی **1953** و مەرگی ستالین، پەشێوی بەرلین، مانگرتنەکانی چیکۆسلوفاکی لـە **1954**دا، پاشـان رووداوەکـانی مەجەڕسـتان و پۆڵۆنیـا لـە **1956**دا دۆخـە سیاسـیەکە گـۆڕاو، بڵاوکراوەکـان خوێنـەری تازەیـان بـۆ پـەیدابوو -بێگومـان نـەك زۆریـش- ئەوسـا ئێمـە هـەزار دانـەمان لـە گۆڤارەکـە دەفرۆشت کە دەستاودەستی دەکرد، دوای ئـەوە شەڕی جەزائیر دەستی پێکردو ئێمە بەرانبـەر بـە شەڕەکە هەڵوێستمان وەرگرت.

ئەوسـا لـەنێو خوێندکـارانی زانکـۆدا جۆرێـك لەبەرگری کردن هەبوو، هەندێك لەوانە هاتنـە نـاو ئێمـەو گرووپەکـەمان فـراوان بـوو، ماوەیـەك لـە ساڵی **1958**-**1959**دا لـە هـەموو فەرەنسـادا، لە کۆمەڵێك ویلایـەتدا، ئێمـە نزیکـەی سـەد کەسێك دەبووین، لە **1962**-**1964**دا توانیمان لـە پـاریس کۆمەڵێك کۆڕ سازبدەین بە بەشـداریکردنی **300**-**400** کـەس. بـەڵام هـەموو ئەمانـە وەك دەیـان بینیت، زۆر سنووردار بوون، هەڵبـەت دوای **1968** کەسانێکی زۆر بانگەشـەی ئـەوەیان بـۆ خۆیـان دەکـرد کـە لـە -**یـا سۆسـیالیزم یـا بەربەریـەت**- دا بەشداربوون. من لە وەڵامـی ئەوانـەدا وتوومـە ئەگەر بەراستی هەموو ئەوانە لە -یـا سوسـیالیزم یا بەربەریەت-دا بوونایە، رەنگـە لـە دەوروبـەری ساڵی **1958**دا دەسەڵاتی فەرەنسـامان بگرتایەتـە دەست.

***-کەواتـە پێش ئـەو ساتـەوەختـە، لـە کۆتـایی دەیـەکانی 1960دا کـاتێك لـە ئـەنجامی ئـاڵ و گۆڕەکـانی باری سیاسـیو ئابووریدا، چەپـەکان زۆربوون، ئێوە وەك رێکخستن بڵاوەتان لێکرد؟***

+بەڵێ، ئێمە لە کارخانەی رینو کەسانێکمان هەبوون بۆ کرێکارەکان بڵاوکراوەیەکی تایبەتیان دەردەکرد، ئەو پاشکۆی بڵاوکراوەیە وابەستە نەبوو بە -**یا سۆسیالیزم یا بەربەریەت**- ەوە، ئەو بڵاوکراوەیە خودی کرێکاران و هەندێکی تر بەرهەمیان دێناو بڵاویان دەکردەوە، بەڵام ژمارەکانی زۆر سنووردار بوون، ئەوسا زۆر چالاکی ژێرزەمینیو نەناسراوو بێناو هەبوون، وەك دەرکەوتنی دانی کوهن بندیکت لە ساڵی 1968دا.

*-بۆ چالاکیەکانی **یا سۆسیالیزم یا بەربەریەت** وەستان؟*

+ئەمە بڕیارێك بوو من بەتەواوی هانم دەدا، پێش هەر شتێك لەنێوان 1960-1963 لە جیابوونەوەیەکدا جیابوونەوەیەکی تر دروست بوو. لە ساڵی 1960دا من دەقێکم نووسی لەژێر ناوی (سەرمایەداری نوێو شۆڕش) کە کامڵترین رەخنەی ئەو سەردەمە بوو لە سەر هەڵوێستی مارکسیستی کلاسیك. رەخنە لەو ئایدیایەی کە مەسەلە ئابووریەکان مەسەلەگەلێکی سەرەکین و شتی لەو بابەتە. نووسینەکە بانگەشەیەك بوو بۆ ئەوەی کە هەڵتەکاندنی کۆمەڵ مەسەلەیەکی زۆر گشتی ترە: مەسەلەی لاوان، مەسەلەی ژنان، مەسەلەی گۆڕینی خەسڵەتی کار، شارگەری، مەسەلەی تەکنیك. گۆڕینی تەکنەلۆژی، هەموو ئەمانە لەلایەن هەندێك لەو گرووپانەوە کاردانەوەیەکی بەهێزی دروست کرد کە نوێنەری تیۆریان **لیوتار**بوو. ئەو لەو کاتەدا مارکسستێکی سەرسەخت بوو، ئەمە لە 1963دا بووە هۆی جیابوونەوەیەك گرووپەکەی لاواز کرد، ئێمە لە زۆرینەکان بووین. گۆڤارەکەمان پاراست، ئەوان بەناوی -**دەسەڵاتی کرێکاران**- ەوە بەردەوامیان بە دەرکردنی گۆڤارەکە دا، ئەمە یەکەمین بڵاوکراوە بوو بەم ناوەوە. پاشان ئیتالیەکان پوترە ئوپریو یان بڵاوکردەوە. ئەمانە بەشێك بوون لە کارە ژێر زەمینیەکان. لە ئیتالیا، پیش ئەوە زۆر لەمانە خوێنەری **یا سۆسیالیزم یا بەربەریەت** بوون، بەڵام گرووپەکە لاواز بوو.

وەك وتم بڵاوکراوەکە تا دەهات روو لە فراوانی بوو. تیراژەکەی زیاد لە جاران بەرەو پێش چوو، کەسانێك دەهاتنە دانیشتنەکان بەڵام چالاك نەبوون، ئەوانە بەرخۆرێکی ناچالاك بە ئەندێشەکان بوون. ئەم پیاچوونەوەی رەخنەگرانەیە رەنگی دەدایەوە، چونکە لە بەرهەمهێنانی بڵاوکراوەیەکدا مەسەلەی سەرەکی هاوکاران، بەتایبەتی نووسەرەکانیەتی، زۆر جێگای پێکەنینە: ئێمە هیچ پارەمان نەبوو، بەڵام بڵاوکردنەوەی یا سۆسیالیزم یا بەربەریەت چ کێشەیەکی مادی نەبوو، بەردەوام لە پیشکەوتنا بووین، مەسەلەکە بابەتەکانی بوو. خەڵکی پێویست بۆ ئەم کارە نەدەهاتنە گرووپەکەوە، هاوکاریەکەی منیش شێوەی جیاوازی لەخۆدەگرت، من چ لە رەخنەی تیۆری مارکسیستی و چ ئەوەی بەدەستهێنانێکی نوێی تیابێت زیاد لە جاران نوقمی بونیادە تیۆریەکان بووم، ئەمە یەکەمین بەشی **بونیات گوزاری خەیالی کۆمەڵ** بوو.

*-لەو کاتەدا هەروەك ئابووری زانێك کارت دەکرد؟*

+بەڵێ، من لە بڵاوکراوەی oecd کارم دەکرد، پیاچوونەوە، لایەنی شازی گۆڤارێکی تیۆریك -فەلسەفی کە پێدەچوو ئۆرگانی شۆڕشێکیش بێت. بۆ نموونە ئەوە یەکەم جار بوو لە فەرەنساو هەموو ئەوروپادا کە گوزارشێکی سادە لەسەر رووداوەکانی برکلی بڵاوبکرێتەوە،

پیاچوونەوە، پێشبینی بزووتنەوەکانی ساڵانی شەستی دەکرد.

ئەمەیان لەوێدا هەیە. دەربارەی خوێندکارانی زانکۆ، ژنان و شتی دی ئەمە نووسراوە، بەڵام بەس نەبوو، بۆیە لەو کاتەدا، ساڵی **1966** وتمان:

"لەمڕۆدا، چالاکی بێ هوودەیە، باشتر وایە بوەستین و پاشان دەست پێ بکەینەوە" هەڵبەتە دوو ساڵ دوای ئەوە **1968** هات.

من نازانم ئەگەر ئێمە لە **1968**دا هەر بەشێوەی گرووپێك بماینایەتەوە، چی ڕووی دەدا؟ بەڵام بزوتنەوەی **1968** زۆر خێرا کەوتە دەستی ماویەکان و ترۆتسکیەکان و هەندێکی دی، بێگومان نەك لە سەرەتاوە، مەبەستم قۆناغە گەورەکەیە، بەڵام زۆر خێرا، مرۆڤ ناتوانێت مێژوو بنووسێتەوە.

### فەلسەفەو خەیاڵ

***-ڕەنگە ئێستا بتوانین بابەتەکە بەرەو مەسەلەی فۆرمەلەی فیکری ئێوە وەربگێڕین. سەرچاوەی سەرەکی دوورکەوتنەوەی ئێوە لە مارکسیزم چی بوو؟ هەوێنی کامڵ بوونی ئێوە دوور لە سیاسەتی کۆمۆنیستی توندڕەوانە چی بوو؟ تۆ باسی پەیوەندی خۆتت لەگەڵ مارکسیزمەکاندا بەشێوەی نێگەتیڤ کردووە، بەپێی ئەو بابەتانەی کە بەرەبەرە لاتانداو سەرئەنجام کەم و زۆر دەستتان بۆ پرۆژەیەکی گشتی سەربەخۆ برد. لەم قۆناغی دووەمەدا کێ ئیلهام بەخشتان بوو؟***

+گرفتە بۆ من وەڵامی پرسیارێکی لەم جۆرە بدەمەوە، دەبێت بڵێم سەرچاوەی سەرەکی **هەمان ڕەخنەی هەمیشەیی** بوو. ئەو دەزگا فیکریەی کە منی وەك مێردمناڵێکی تەمەن **13** ساڵ بۆ خۆی ڕاکێشابوو، ئیدی کارایی نەما. ئەو ئایدیایەی کە تۆ بە وێنەیەکی گونجاو لە مێژووی مرۆڤایەتیو دنیای تیا ببینیت و بیەوێت بە قۆناغێکی خۆشی کۆتایی بگات.

***-تۆ ناوی ئەرەستۆت هێنا.***

+بەڵێ، بەڵام ئەوە ساڵی **1975** بوو، لە هەموو نووسینەکانما بۆ **یا سۆسیالیزم یا بەربەریەت** کە ئێستا بەشێوەی موجەلەد لە فەرەنسادا بڵاوبۆتەوە. من وا دەزانم بە سەریەکەوە جارێك ناوی ئەفلاتون و جارێك ناوی توسیدیدسم هێناوەو تەواو. پێش یەکەمین بەشی **دەزگای خەیاڵیانەی کۆمەڵگا** (**1964-1965**) ناوی هیچ فەیلەسووفێك نەهاتۆتە ئاراوە، مەسەلەکە ئەوە نیە کە من نامەوێت ناو بهێنم، ئەمە بەڵگەی **ڕەخنەی هەمیشەییە**. مەسەلەی سەرەکی کە بوونەهەوێنی ئەزموونە هاوچەرخەکان بوو، ئەزموونی بزوتنەوەکانی کرێکاران، بابەت، ڕەخنەی سەرمایەداری، ڕەخنەی پەرەسەندنی ئابووری سەرمایەداری، خەسڵەتی ناماقووڵی ئەو ئامانجانەی خرابوونە ڕوو بەهۆی ئابووری سەرمایەداریەك کە مارکسیزم کەم و زۆر بەشداری تیا کردبوو. زیادبوونی سامانی مادی و شتی دی، لەو قۆناغەدا چەند پرسیارێکم لەخۆم کرد: "مێژوو چیە؟" "کۆمەڵگا چیە؟" کار لەسەر ئەم بونیادە لێرەوە دەستی پێکرد. لە ساڵی **1959**دا. پێشتر لە وتارێکدا کە ساڵی **1953** لە ڕەخنە لە ئابووری مارکسیزمی و لێکۆڵینەوەی لە داهێنان لە مێژوودا بڵاو کرابوەوەو ئەو تۆوە ڕژابوو، تەنانەت پێش ئەوە، لە **1950-51**دا، لە لێکۆڵینەوەی داهێنان و خۆبەڕێوەبەریدا بیرەکەی خرابوە ڕوو، بەڵام بە ئەندازەیەکی تەواو پوخت و کامڵ نەبوو.

*-ئەمەت لە مرلوپۆنتی وەرنەگرتوە؟*

+نا، پەیوەندی بە مرلۆپۆنتیەوە نیە، ئەوەی من بیزانم مرلوپونتی بیرۆکەی دروست کردن یان ئەفراندنی نەبوو، من هەر بە مێردمناڵی فەلسەفە رایکێشابووم. بەڵام دوو شتم بە شێوەی جیاواز لەبەرچاو گرتبوو، رەنگە ئەمە سیفەتێکی شەخسی سەیر بێت، من دەمویست بیری سیاسیو چالاکی سیاسی لەگەڵ فەلسەفەدا تێکەڵ بکەم، ئێوە نە بە هۆی کردەیی (عملی)یان پەروەردەیی بەرەو لای کرێکار ناچن تا پێیان بڵێن رەخنەی سێیەم بخوێننەوە، بەڵام من هێشتا ئەو رایەم هەیە، لەم لایەنەوە من وا بیر ناکەمەوە بتوانین راستەوخۆ لە فەلسەفە بەرئەنجامی سیاسی وەربگرین.

*-راتان دەربارەی سوریالیزم چیە؟*

+شتێکم لێ دەزانی، چونکە لە یۆنان هەندێك سوریالستمان هەبوو من زۆرم خۆش دەویستن، کە هاتمەوە فەرەنسا شتی زیاتر فێر بووم، من زۆر شەیدای بریتۆن و وتەکانی بووم، لەو سەردەمەدا پەیوەندی من بە بریتۆنەوە رەهەندێکی زۆر شاعیرانەی هەبوو، بیست و پێنج ساڵ دوای ئەوە وتم: **داهێنان یەعنی شیعر وتن** و من مانایەکی ترم بە شیعر بەخشی. بۆ مرۆڤ دژوارە،0 فۆرمێکی کامڵ و شەریفانە بە روونکردنەوەی ژیاننامەی خۆی بدات. ئێوە بەردەوام لەبەردەم کاریگەریەکدان کە تەنانەت خۆتان هیچی لێ نازانن، یان هەر نازانن چۆن کاری لێ کردوون، رەنگە دواتر ئەوە بزانن. بەڵام لەنێو ئەو کەسانەی کە لەو سەردەمەدا لە فەرەنسا بۆ من لە هەموو گرنگتر بوو بریتۆن بوو، دوای ئەو بنیامین بیرت کە پاشان هاتە نێو سوسیالیزم یان بەربەریەتەوەو دەقێکی لەو بڵاوکراوەیەدا چاپ کردو سوریالیسیتێکی لاوتر بەناوی ژان ژاك لیبل کە ئەندامی گرووپەکەو زۆر تێکەڵی ئێمە بوو.

***-تەفسیرتان بۆ ناهوشیاری لای فرۆید چیە؟ دەکرێت خوێندنەوەیەکی زۆر دیترمینزیانە (جەبرگەرایانە) لە فرۆید بکرێت. بەڵام لە بن دێڕی بەرهەمەکانیا بیری داهێنانی ناهوشیاری ئاشکرایە، لەوە دەچێت سوریالیستەکان ئەم تێڕوانینەیان هەبووبێت و ئەم خوێندنەوەیان بۆ کردبێت.***

+بەڵێ، سوریالیستەکان تێڕوانینێکی وایان هەبوو، بەڵام هەرگیز تیۆریزەیان نەکرد، سوودیان لێ وەرگرت، یەعنی بەو جۆرە تەفسیریان لێ کرد، ئەمە بەشە خەیاڵیەکەی فرۆیدە، فرۆیدێك کە هەمیشە باسی خەیاڵی دەکرد، بەڵام هەرگیز ناوی شتێکی نەدەبرد، هێڵی پۆزیتڤیستی لەودا زۆر بەهێزە. بێجگە لەوە ئەمە ڤیەنای سەدەی نۆزدەو بەرێزگرتنی تیۆرە زانستیەکانە.

فرۆید بەوەی کە لە پێشدا دەیوت منداڵان بە شێوەی جیاجیا سەرەڕۆن ئاژاوەیەکی نایەوە. ئەگەر ئەو ئەمەندەی بخستایەتە سەر قسەکانی: "هەر چیەك من پێتانی دەڵێم تەنیا خەیاڵی تایبەتی خۆمە" ئەو تەنانەت زیاد لە جاران ببوە جێی گاڵتە پێکردن. لە دەوروبەری **1911**دا بەیانێکی ئیمزاکرد، داوای دروست کردنی ئەنجومەنێکی کرد بۆ بڵاوکردنەوەی بیری پۆزیتیڤیزم بە یارمەتی پیتزولد، هیلبرت، ئەنشتاین و کەسانی دی. فرۆید کەسێکی پڕ لە دژایەتی بوو.

***-تاکەکان لە چوارچێوەی پێکهاتەی دەزگایەکی تایبەتی کۆمەڵەوە فۆرمەلە بوون، تۆ دەربارەی دەزگای خۆبەڕێوەنەبەر Heteronomous ی کۆمەڵ نووسیوتە کە بە***

*شێوەیەکی مێژوویی بەدی هاتووە، هەروەها وەك بەهایەکی سیاسی باست لە خۆفەرمانڕەوایی کردووە، لەگەڵ ئەمانەدا ئەگەر پرۆسەی (دەزگا)یان (دامەزراندن) بەو مانایە بێت کە بەرهەمی چالاکی کۆمەڵ نیە بەڵکو منداڵدانێکە تیایدا هەموو چالاکیەکان ئەنجام دەگرن، کەواتە چۆن دەزگایەکی خۆ فەرمان ڕەوایی کۆمەڵگا دەتوانێت دروست بێت؟ لەوە دەچێت دەزگا هەمیشە لە پێش چالاکیە ئەزمونیەکانی مرۆڤەوە بێت.*

+ئەمەیان مەسەلەی سیاسەتی خۆفەرمانڕەواییە، مەسەلەی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی خۆبەڕێوەبەرە. من وا هەست ئەکەم بتوانین لە دنیای خۆراوادا چەند دەزگایەکمان هەبێت، تەسەور بکرێت، دابمەزرێت و ئەمە تاڕادەیەك ئەنجام دراوە. ئەو دەزگایانەش کە پاشکۆ نین، ئەگەر ئێمە چەند دەزگایەکمان هەبێت کە نەك تەنیا ڕێ بەو کەسانە بدات، بەڵکو هانی کارەکە بدات، ئەگەر ئێمە دۆخە گشتیەکە بەجۆرێك واڵا بکەین کە بشێت لێکۆڵینەوەی تیا بکرێت، هۆیەکانی راگەیاندن ئاسان بکات و.. ئەمە شتێکی تەواو جیاوازە لەو کۆمەڵگا کلاسیکیەی ناتوانێت خۆی بەڕێوە بەرێت، لەم جۆرە کۆمەڵگایەدا تاکەکان ناچارن بیر لە شتێك بکەنەوە کە کۆمەڵگا پێیان دەڵێت بیری لێبکەنەوە.

*-بەڵام ئایا بونیادی فەلسەفی دەزگا بەو مانایە نیە کە لە ئاستی ئۆنتۆلۆژیا بەستراوە بە (کۆمەڵگای خۆبەڕێوەنەبەر) Heteronomy ەوە، کە بە شێوەیەك لە شێوەکان ئیلقای ئەوە دەکات، کاتێك مرۆڤ باس لە خۆبەڕێوەبردن یان دژەکەی -هیترونومی- دەکات، لە ڕووی سیاسیەوە بەکردەوە لە بارەی شتێکی ترەوە دەدوێت؟*

+ئێمە لێرەدا لەژێر باری بیرێکدا کاردەکەین بە میراتی بۆمان ماوەتەوە، لە پشت ئەوەوە کە ئێوە دەیڵێن بۆچوونێکی خۆفەرمانڕەوایی هەیە کە من ناوی ئازادی میتافیزیکی بەمانا زیان بەخشەکەی لیٚ دەنێم.

*-مەبەستان وێناکردن (تەسەور)ی کانتیە؟*

+دەشێ کانت تەنانەت سارتەریەتیش بێت، مەبەست ئەوەیە هەر کەسێك ئەگەر بەڕەهایی هیچ کاریگەریەکی دەرەوەی لەسەر نەبێت و تەواو خودڕەو بێت، ئەوا خودموختار یان خۆفەرمانڕەوا دەبێت، کە ئەمە شتێکی بێمانایە، ئەمە فانتازیایەکی فەلسەفیە، فەلسەفە ئەم فانتازیایەی قبووڵ نیەو بەرانبەر بەو فانتازیایە واقعیەت دەکاتە پێوانە. فانتازیا وجودی نیە، خۆ بەڕێوەبردن وەك ئەوەی من لە تاکدا هەستی پێ دەکەم ڕێگر نیە لە شتێکی دی، چاڵێك نیە ئەو ناوەڕۆکانەی لەخۆ گرتبێت کە هەرگیز دەستیان بۆ نەبراوە. خۆ فەرمانڕەوایی پرۆسەیەکی بەرەو پێش بردنە. کە بەو پێیە تۆ هەمیشە کۆمەڵە ناوەڕۆکێکت هەیە کە بە گریمانە وەرگیراو و دیاری کراوە، بە قەرز وەرگیراوە، تۆ لەم دنیایەدایت، لەناو کۆمەڵدایت، بەمیراتی زمانت بۆ ماوەتەوە، تۆ لە مێژوویەکی دیاری کراودا دەژیت و وەك هایدگەر دەڵێت: فڕێ دراویتە ئەم ژیانەوە. ئەوە بەدەست خۆت نەبووە کە ساڵی 1925 یان ساڵێکی دی لەدایك بوویبێت و هەر دەبێت لە دایك بووی ئینگلستانیش بیت، مەسەلەکە ئەمەیە: تۆ هەرگیز فەیلەسووفێکی گەورەی ساڵی 2100 ناناسیت، فەیلەسووفێك رەنگە شێوەی بیرکردنەوەکەی ئێوە بگۆڕێت، لەم جیهانەدایە کە دەبێت ئێمە چەمکێکی

كاريگەرمان بۆ خۆ فەرمانڕەوايى هەبێت.
خۆفەرمانڕەوايى بەو مانايە نيە كە من بەتەواوى لە هەموو شتێكى دەرەكى جيابم، لە بارەى ئەو بابەتانەوە كە لە سەدا نەوەدو نۆيان بە قەرز وەرگيراوەو لە دەرەوە هاتوە، من چالاكيەكم هەيە كە بيرم لێ كردۆتەوەو رەخنەگرانەو بيرمەندانە هەڵى دەسەنگێنم، من دەتوانم بە جۆرێكى سەرنج راكێش بڵێم نەخێر يان بەڵێ. من دەتوانم لە ڕێى بيركردنەوەى راديكالانەى خۆمەوە رێگا بە ڕەوتى دينامیكى تەداعيەكان و ئايدياكانى خۆم بدەم.

ئێمە دەربارەى بير قسە دەكەين كە پڕبێت و بژارى لێ بكەين. چونكە خەيالى راديكالى من دەشێت شتى بێماناو كاڵ و كرچيش بەرهەم بێنێت، يان ئەو شتانەى كاريگەر نين و بەكەڵك نايەن. من ئەم رەوتى پێش خۆخستنە بەزەينيەتى خۆفەرمانڕەوايى ناو دەبەم.

*-بەم پێيە خەيالى راديكال جۆرێكە لە سەرچاوەى رووت و پەتى؟*

+سەرچاوەيەكى هەميشەيى پيشاندانەوەى شتەكانە، لەناو كۆمەڵێكدا كە خۆ بەڕێوەبەر نەبێت مەيل و كاريگەريەكان بەكردەوە سەركوت دەكرێن و، تەنيا لەفۆڕمى خەونەكان، ناخۆشيەكان، نەخۆشى دەروونىو پێشێل كردندا دەردەكەون. ئەمە بەردەوام لەگەڵماندايەو دەشێت ئازاد بێت، بەو مانايە نا كە ئێمە هەموو ئەنجامەكەى قبووڵ بكەين، بەڵام دەتوانێت ئازاد بێت بۆ ئەوەى مانايەك بەدەست بێنێت، مانايەكى تازە كە لەسەر ئەو بنەمايەوە چالاكى فيكرىو هەڵسەنگاندنمان بتوانن كاريگەر بن، بۆيە ئەگەر ئێمە پەيوەندى لەگەڵ كۆدا لەبەرچاو بگرين، ئەم بيرەى كە من ئازاد نيم چونكە كەسانى تر لێرەن، يان لەبەرئەوەى ياسا هەيەو تەنيا لە بەرانبەر ئەم فانتازيا تەقليديەدا مانا پەيدا دەكات. كەسانى ترو ياسا هەر رێگرنين، سەرچاوەى ئازاديشن، سەرچاوەى بەرهەمهێنانن، سەرچاوەى تواناى كاركردنن، سەرچاوەى ئاسان كردن و دەوڵەمەندين.

*-كەواتە تۆ لە پرۆژەى خۆبەڕێوەبردنەكەتدا ئەوەت لەبەرچاو گرتوە كە چەند بتوانرێت تواناى بيركردنەوەو خۆئەندێشىو هوشيارى بگەيەنيت، ئايا ئەم بيرە بەمانا -كانتى- يەكەيە؟*

+نا، ئەم بيرە بەمانا كانتيەكە نيە.

*-ئەى چەمكى خۆفەرمانڕەوايى ئێوە قابيلى بەدى هاتنە؟ لە رووى فەلسەفيەوە بەشێوەيەك فۆرمەلەكراوە كە بشێ لە مێژوودا بەدى بێت. ئەشێ ئەمە لە رووى ماديەوە ئەگەرى بەدى هاتنى هەبێت؟*

+بەڵێ، دەشێت لە بارى ماديەوە بەدى بێت و ئەمە يوتوپيا نيە، بيرى كانتيەتيش نيە، مەودايەكى دوورە دەست نيە، ئەستێرەى قوتبەكانيش نيە.

*-لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، لە مێژوودا، وەك هەندێك لەوانەى لە بيرى ماركسەوە هەڵيان هێنجابێت، هيچ نيشانەيەك بۆ ئەمە دەرنەكەوتووە؟*

+نا، ئەمە گياندارێكى مێژووييە، گياندارێكى مێژوويى كە هێشتا تەواو كامڵ نەبووە.

*-بەڵام ئەگەر لە مێژوودا نيشانەيەك بۆ ئەمە لەبەردەستا نەبێت، ئەگەر بڕيارە دروست بێت، چۆن بەكردەوە بەرەو بەدى هاتن دەچێت؟*

+ئێمە نايزانين، ئێمە بۆ ئەوە كاردەكەين، بەڵام لە پێشەوە هيچ نازانين.

**سەرچاوە:**

گۆڤارى -بخارا- ژمارە 6 خرداد و تيرى 1378.

# فایلی ژمارە







• قوتابخانەی فرانكفۆرت

# وشەیەك بۆ ئەم فایلە

■ سەردەم

لە سەرەتای دامەزراندنی ئەم پرۆژەیەوە، خەون بەوەوە دەبینین ئەو زمانەی کە نالی لە شیعردا "ئیمتیحانی" دەکرد، لە جێگەیەکی دی تاقی بکەینەوە: جێگەیەك کە بەرەو ناسینی ئەو دنیا کلتووریانەمان بەرێت کە نەمانبینیون، بەرەو ناسینی شێوەی بیرکردنەوەو ژیانی خەڵکانێکمان بەرێت کە لە هەلومەرجێکی سەختر لە ئێمەو لە فەزای کوشتارێکی سەدجار گەورەتر لە ئێمەدا، ژیان و بیریان کردەوەو خەونیان بینیو بیرێکی زۆریش لە خەونەکانیان هاتەدی.

بیر لەوە دەکەینەوە هەوڵبدەین زۆرترین دەرگای فکریو زۆرترین روانگەی جیاواز بەرووی خوێنەری کوردا بکەینەوە، خەون بەوەوە دەبینین ئەو کەرەسە فکریە دەوڵەمەندەو فرە لایەنەی بخەینە بەردەست کە یارمەتی دەدەن بۆ ئەوەی زۆرتر رابمێنێو کەمتر پەلە بکات، قووڵتر بروانێو کەمتر بێباك بێ، زیاتر بیربکاتەوەو کەمتر نائومێد بێت. چونکە جگە لە بیرکردنەوە رێگایەکمان بۆ ئومێد نیە... ئایا لە جیهانێکدا کە تیایدا هێشتا مرۆڤەکان بە ئاسانی یەکدی دەکوژن، بە ئاسانی یەکدی ئاوارە دەکەن، بە ئاسانی یەکتر برسی دەکەن، هیچ شتێك لە بیرکردنەوە زیاتر هەیە کە رێگەیەکمان بۆ ئومێد بۆ بکاتەوە؟ ئومێد بەوەی کە هێشتا ماوین و بیردەکەینەوە، هێشتا ماوین و نارازین، هێشتا ماوین و خەون بە جیهانێکی جوانترەوە دەبینین، ئومێد بەوەی نائومێدی مێژووییەو بە بیرکردنەوەی من و تۆ، بە چالاکی پڕ حەماسەتی من و تۆ، بە خەونە زیندووەکانی من و تۆ، دەڕواو دەرەوێتەوە.

لە پێناوی ئومێدێکی وا مەزنیشدا بەرلەوەی پێویستمان بە چاوەڕوانی موعجیزەی سیاسیەکی دڵسۆز بێت (کە مەحاڵە بتوانێ موعجیزە بکات) پێویستمان بە چالاکی و زیندوویی‌و خەون بینینەکانی خۆمان هەیە، پێویستمان بە ئامادەبوونی بەردەوامی خۆمان هەیە، لە هەموو چرکە بچوك و گەورەکانی ژیاندا کە بێ بوونی ئێمە بەرەو هەموو شوێنێ دەڕۆن، جگە لە

خۆشبەختی.. دواجار پێویستمان بە بیرکردنەوەو فراوانکردنی ئاسۆکانی ڕوانینی خۆمان هەیە.

خوانی فکر، ئەو خوانەیە کە پێمان دەڵێت، گەر دەمانەوێت بژین و حەزی ژیان و پێکەنین لە دەست نەدەین، ئەوا دەبێ بیربکەینەوە. گەر دەشمانەوێ بیربکەینەوە، دەبێ بەردەوام کەرەسەو زەخیرەی ڕۆشنبیریمان دەوڵەمەندو دەوڵەمەندتر بکەین. دەبێ جیهانی فکرو ئەندێشەی ئەو کەسانە بناسین کە لە شوێنی دیو لە هەلومەرجی دیدا، توانیان بیربکەنەوەو بنووسن و بگۆڕێن.

سەردەم هەوڵدانێکی بچوکە بۆ ناسینی ئەندێشەو فکری ئەو کەسانە، نزیکبوونەوەیەکی شەرمنانەیە لەو کلتوورو بیرو نووسەرانەی جورئەتی بیرکردنەوەیان تاقی کردەوەو بەروبوومەکەشیان خواردو دەخۆن، بۆ ئەوەی ئەم پرۆژەیەش بە شێوەیەکی باشتر بەرەو پێشەوە بەرین، هەوڵدەدەین پەروەندی جیاواز لەسەر ڕوانگەو بیریاری جیاواز بکەینەوەو بە پێی توانای خۆمان (کە بێگومان بێ کەموکوڕیو هەڵە نابێت) زۆرترین زانیاری لە بارەیانەوە بەخوێنەری کورد بدەین.

ئەگەر لە ژمارەی ڕابردوودا ئەم کارەمان بە "کارل پۆپەر" دەست پێکرد، ئەوا لەم ژمارەیەدا بە کۆمەڵێ بیریار دەگەین کە ڕێکوڕاست لە جەمسەری دژ بە تێزەکانی پۆپەردان و ئەو وتوێژە توندەشی کە لە نێوانیاندا ڕوویدا، تا ئێستاش بایەخی خۆی لەدەست نەداوەو بڕێکی زۆر لە بیریارانی ڕۆژئاوای بەخۆیەوە خەریک کردووە. ئەو کۆمەڵە بیریارە کەس نین جگە لە بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت. قوتابخانەیەک کە بە پێی ئەو میراتە مارکسیو ڕادیکاڵانەی لێی هاتبووە دەرێ، ئەستەم بوو تێزەکانی ئەو فەیلەسووفەی "کۆمەڵگای کراوە" قبوڵبکات کە لە دەوری بەرگریکردن لە سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی ڕۆژئاوا، خڕ دەبۆوە.

بەڵام وەك جارێکیان ئالبیر کامۆ گوتبووی *[لێرەدا بە پێی مانا قسەکان دەهێنمەوە]* جیاوازی لە بواری ڕۆشنبیریدا بە پێچەوانەی جیاوازیە لە بواری سیاسیدا، ئەگەر دووهەمیان شەڕو کوشتارو ماڵوێرانی لێدەکەوێتەوە، ئەوا یەکەمیان دەوڵەمەندیو داهێنانی لێدەکەوێتەوە. جیاوازی لە بواری سیاسیدا سەرەتای جەنگ و کەرت بوونە بەڵام لە بواری ڕۆشنبیریدا سەرەتاو مەرجی دەوڵەمەندی داهێنان. بوونی یەکەمیان بۆ ژیان مەترسیدارە، نەبوونی دووهەمیان ژیان لاواز دەکات. بێگومان پرسیارەکەش لای ئێمە ئەوە نیە پۆپەریەکان ڕاست ئەکەن یان بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت. چونکە پرسیاری "کێ ڕاست دەکات؟" بۆ هەمیشە لە بواری فکردا بەسەرگەردانی دەمێنێتەوەو هەرگیز بە کەنارێکی ئاسوودە ناگات.. بەڵکو پرسیاری ئێمە ئەوەیە چ کەسێ زیاتر فکر و بیرکردنەوە ئەوروژێنێو پرسیار دروست دەکات و دەبێتە هەوێنی نووسینی دی.

کەوابوو با پۆپەرو فرانکفۆرتیەکانیش بخوێنینەوەو لێیانەوە فێری هونەرەکانی بیرکردنەوەو پرسیارکردن و قووڵ ڕوانین ببین.. ئەم فایلە هەوڵدانێکی بچوکە بۆ نزیك بوونەوە و ناسینی هێڵە گشتیەکانی قوتابخانەیەکی فکری کە کەمترین شت کە بتوانین لە سەریان بیڵێین، ئەوەیە کە ئەگەرچی لە هەلومەرجێکی سەدجار نائومێدانەترو کارەساتاویتر لە ئێمەدا ژیان، بەڵام توانیان بیربکەنەوەو خەون ببینن.

❑

# قوتابخانەی فرانكفۆرت: دیدی رەخنەگرانە

## -رەخنە لە پۆزەتیڤیزم و كۆمەڵگای نوێ-

■ د. حوسێن بەشیریە

• و. سەردەم

قوتابخانەی فرانكفۆرت یەكێ لە رووداوە گرنگ و كاریگەرەكانی فكری سیاسی رۆژئاوا بووە. ئەم قوتابخانەیە بەهۆی "دەزگای لێكۆڵینەوەی كۆمەڵایەتیەوە" پەرەی سەند، كە وەك دەزگایەكی سەربەخۆی زانكۆی فرانكفۆرت بۆ خوێندنەوەی فكری ماركسی، دامەزرا. دامەزراندنی دەزگای ناوبراو وەڵامێك بوو بۆ پێداویستی هەڵسەنگاندنی سەرلەنوێی ماركسیزم بەتایبەتی لە بواری پەیوەندی نێوان فكرو كاری سیاسی لە هەلومەرجی مێژووی پاش جەنگی جیهانی یەكەمدا- و لە هەلومەرجێكدا كە شۆڕشەكانی ناوەڕاستی ئەوروپا بەتایبەتی شۆڕشی 1918 لە ئەڵمانیا، تێكشكابوون.

ئەگەرچی هەندێك لە بیریارانی ئەم قوتابخانەیە بڕێك لە چەمكە ماركسیەكانیان خستبووە ژێر گومان و پرسیارەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم قوتابخانەیە دەورێكی كاریگەری لە بەهێزكردنی بزوتنەوەی فكری ماركسی رۆژئاوادا، بینیووە، گرنگترین ئامانجی بیریارە سەرەكیەكانی ئەم قوتابخانەیە، واتە: ماكس هۆركهایمەر (1895–1971) تیودۆرو ئادۆرنۆ (1930–1969) و هربرت ماركیوز (1895–1979) بریتی بوو لە پێشكەشكردنی تیۆرەی رەخنەگرانەو رەخنەگرتن لە كلتوورو شێوەی بیركردنەوەی بۆرژوازی. لەم ئاراستەیەداو بەهۆی رەخنەگرتنێكی رەشبینانەوە لە پرۆسەی عەقڵانیبوونی كۆمەڵگای نوێ، بەخێرایی لە فكری مێژووی كۆمەڵایەتی ماركس دوركەوتنەوەو روویانكردە رەخنەگرتن لە كلتوور و ئایدۆلۆژیا وەك هۆكارێكی گرنگ بۆ رزگاربوون لە دەسەڵات.

خەسڵەتی فەلسەفیانەی تیۆرەی رەخنەیی قوتابخانەی فرانكفۆرت لە دوو دەیەی دوایداو

بەهۆی بڵاوبوونەوەی تەفسیرە بونیادگەرو مێژوویییەکان بۆ مارکسیزم، زیاتر ئاشکرا بووە، "دەزگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی" لە سەرەتای دامەزراندنیەوە تا ساڵی 1933 لە ژێر کاریگەری تێڕوانینێکی تایبەتدا نەبوو بۆ مارکسیزم و [کارەکانی] زۆرتر خەسڵەتێکی ئەزموونگەریانەی هەبوو. لێکۆڵینەوەکانی "کارویتفیگل" لە بارەی شێوەی ئاسیای بەرهەمهێنانەوە کە دواتر لە کتێبی "دیسپۆتیزمی رۆژهەڵاتی" دا بڵاوکرایەوە، لەم ماوەیەی ژیانی دەزگای ناوبراودا، ئەنجام درا. پاش سەرکەوتنی نازییەکان دەزگا گواستیەوە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو تا ساڵی 1950 لەوێ مایەوە.

لەم قۆناغەدا بابەتی سەرەکی فکری فرانکفۆرت بریتی بوو لە رەخنەگرتنێکی فەلسەفی لە سەرمایەداری دوایی و بەها کلتوورییەکانی، پاش گەڕانەوەی دەزگاکە بۆ فرانکفۆرت لە ساڵی 1950دا، ئارەزووە فەلسەفیو ستاتیکیەکانی ئادۆرنۆ بەسەر قوتابخانەکەدا، باڵا دەست بوو. لەدوای ئەمەوە بیری فرانکفۆرتیەکان لە هەموو جێیەکی ئەورووپاو ئەمەریکادا بڵاوبووە. ئەمڕۆ چیدی قوتابخانەی فۆانکفۆرت نەماوە بەڵام هەندێك لە چەمکە بنەڕەتیەکانی ئەندێشەیان لە بەرهەمەکانی یۆرگن هابرماس (بیریاری هاوچەرخی ئەڵمانی) بەشێویەکی دی خراونەتە ڕوو[1].

لە ڕووی ئەبستمۆلۆژیەوە رەخنەگرتن و رەتکردنەوە پۆزەتیڤزم و هەموو چەمکێك لە "زانستی کۆمەڵگا" جێگەیەکی گرنگی لە ئەندێشەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا، داگیرکردووە. بە بڕوای ئەم بیریارانە بەشێوەیەکی گشتی پۆزەتیڤزم بۆ ناسینی واقعی کۆمەڵایەتی نەگونجاو و گومڕاکەرەو لەبەر ئەوەش کە تەنها سەرنج لەوە دەدات کە هەیە، ئەوا بەرگری لە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی جێگیر دەکات و دەبێتە بەربەستی لەبەردەم گۆڕانکاریداو [هەروەها] هۆکارێکی گرنگ و کاریگەرە بۆ پاراستنی جۆرێکی تازە لە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی لە سەردەمی سەرمایەداری دوایدا.

بیریارانی ئەم قوتابخانەیە لەبەرامبەر ڕێبازی پۆزتڤیزمدا بیری فەلسەفی عەقڵ دادەنێن [عەقڵ بەمانای] توانای تێگەیشتن لە جەوهەری دیاردە کۆمەڵایەتیەکان، ئەم تێگەیشتنە بۆ عەقڵ بەمانا هیگڵیەکەی (کە مەبەستی بیریارانی ناوبراوە) پەیوەندیەکی دەروونی بە ئازادیەوە هەیە، لێرەوە بەپێی ئەم تێڕوانینە ناسینی جیهان و دەستنیشانکردنی بەها راستەقینەکان، لەیەك جیانابنەوە. بە دیاریکراوتر بڵێین لەبەرامبەر پۆزەتیڤزمدا تیۆرەی دیالەکتیکی دەهێنە پێشی کە بە پێچەوانەی پۆزەتیفسمەوە چەمکەکانی خۆی لەشیکردنەوەی پرۆسەی ئاڵۆزی کۆمەڵگای نوێوە، هەڵدەهێنجێنێ. لە کتێبی "دیالەکتیکی رۆشنگەری"دا کە لە نووسینی هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆیە، رەخنە لە پۆزەتیڤزم لەگەڵ تاوتوێکردنی رەخنەگرانەی عەقڵانیەتی زانستیو تەکنەلۆژی وەك شێوەیەکی تازەی دەسەڵات لە کۆمەڵگای سەرمایەداری دوایدا، لێك دەئاڵێن. لێرە [واتە لە دیالەکتیکی رۆشنگەریدا] بە بڕوای ئەوان هۆی سەرەکی پاراستنی دەسەڵات تەنها پۆزەتیڤزم نیە وەك فەلسەفەی زانست و بەشێك لە بیرکردنەوەی بورژوازی، [بەڵکو هۆی ئەم دەسەڵاتە] خودی زانست و تەکنەلۆژیاو هۆشیاری تەکنەلۆژی یان "عەقڵئامێری"یە.

ئەم جۆرە تازەیەی دەسەڵات لە کۆمەڵگای سەرمایەداری پێشکەوتوودا چیدی دەسەڵاتی چینایەتی نیە، چونکە بەهۆی گۆڕانە

مێژوویەکانەوە پێکهاتەی چینایەتی سەرەکی لە کۆمەڵگای سەرمایەداری پێشکەوتوودا، بەشێوەیەك گۆڕاوە کە چینەکان چیدی بەهۆکاری سەرەکی گۆڕانی سیستەمی کۆمەڵایەتی ناژمێرێن و هەردوو چینە بنەڕەتیەکە بۆ پاراستنی هەلومەرجی باو یەکیان گرتووە. لەم ڕوانگەیەوە قوتابخانەی فرانکفۆرت لەبەردەم دوو تەفسیری سەرەکی ماتریالیزمی مێژوویدا واتە: مارکسیزمی ئەرسۆزکسیو مارکسیزمی هیگڵی، راوەستا، لێرەدا سەرەتا باسی رەخنەی ئەم قوتابخانەیە لە پۆزەتیڤزم دەکەین و پاشان تاوتوێی ئەو ئەندێشانە دەکەین کە لە مارکسیزمی ئەرسۆزکسیو هیگڵی، جیایان دەکاتەوە.

### *رەخنەگرتن لە تێڕوانینی پۆزەتیڤزم و پێشکەشکردنی دیدی رەخنەگرانە*

پۆزەتیڤزم کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستدا لەسەر بنەمای ئەندێشەکانی ئۆگۆست کۆنت وەك بزوتنەوەیەکی فەلسەفی بەهێز سەریهەڵدا، بڕوای وابوو کە زانست تەنیا زانینێکی جێی باوەڕە کە هەبێو رووداو و دیاردەکانیش تەنها بابەتی شیاوی زانین. پۆزەتیڤزم نکوڵی لە بوون یان قابیلی تێگەیشتنی ئەو هێزو جەوهەرانە دەکات کە دەکەونە میتازانستەوە و لەبەرئەمەش دژی هەموو شێوەیەکی میتافیزیك و هەموو جۆرە میتۆدێکی لێکۆڵینەوەی دینی جگە لە میتۆدی زانستی، وەك دەزانین رەگ و ریشەی ئەم ئەندێشەیە دەگەڕێتەوە بۆ فرانسیس بیکۆن و ئەزمونگەرە ئینگلیزیەکان.

کۆنت لە ژێر کاریگەری ئەم نەریتە فکریەدا بڕوای وابوو کە گۆڕان و پێشکەوتن بەسێ قۆناغدا تێدەپەڕێ: قۆناغی ئەفسانەیی، قۆناغی میتافیزیك و قۆناغی پۆزەتیڤزم، خەسڵەتی قۆناغی سێهەم وازهێنانە لە گەڕان بەدوای هۆی ئامانجی [علل غائی] شتەکان و سەرنجدانە لە دۆزینەوەی یاسای دیاردەکان. بە بڕوای کۆنت ئەم سێ قۆناغە، قۆناغەکانی گۆڕانی مێژووی مرۆڤایەتیو پەرەسەندنی هزری تاکەکەسیو هەروەها قۆناغەکانی پەرەسەندنی هەر لقێکی زانستەکانن. بیرۆکەی یاسای پەرەسەندنی سێ قۆناغیو وێناکردنی زانست وەك وەسفکردن و پێشبینی، کاریگەریەکی سەرەکی کردە سەر فەلسەفەی زانست. پۆزەتیڤزم لە رووی مێژووییەوە لەناو جەرگەی ئەو خۆشبینیەوە پەیدابوو کە سەرکەوتنەکانی شۆڕشی پیشەسازی و متمانەکردن بە عەقڵی مرۆڤ، هێنایە ئاراوەو پرۆژەیەکی گشتی پێشکەش بە ژیانی مرۆڤ کرد.

بە بڕوای پۆزەتیڤزمەکانی وەك کۆنت فەلسەفەی پۆزەتیڤزم دەتوانێ لەسەردەمی رمانی بنەما تەقلیدیەکانی کۆمەڵگادا، بنەمایەکی تازە بۆ دروستبوونی سیستەمێکی سیاسیو ئەخلاقی دەستەبەر بکا. زانست دەبێتە دەسەڵاتی "رۆحانی" کۆمەڵگای نوێو پیشەسازیش دەبێتە دەسەڵاتی "نا رۆحانی" کۆمەڵگا. لە کۆتایی پرۆسەی ناچاری. پێشکەوتندا "سۆسیۆکراسی" کە هەمان حکومەتی زانست و فەیلەسوفانی پۆزەتیڤزمە[3]، پەیدا دەبێت.

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا رێبازی پۆزەتیڤزم لە ئەندێشەکانی ئەرنست ماخدا شێوەیەکی رەخنەگرانەی بەخۆیەوە وەرگرت و ناونرا "ئیمپریوکریتیسیسم". بە بڕوای ماخ رووداو و شتەکان کۆمەڵێکی پێکەوە گرێدراوی ژیانن و لەبەرئەمەش لە نێوان حسیاتی فیزیای و دەروناسیدا، جیاکردنەوەیەکی واقعی بوونی نیە،

هەرشتێك كۆمەڵێكە لەژیان و زانست تەنها هۆكارێكە بۆ رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ زۆری ژیاندا. بە بڕوای ماخ حسیات كۆمەڵێ رەگەزی بێلایەن كە هەموو هەقیقەت و رووداوەكانی جیهان دروست دەكەن.

ئەندێشەكانی ماخ سەرچاوەی رێبازی پۆزەتیڤزمی لۆژیكی یان ئەندێشەكانی ئەلقەی ڤێنا بوو كە كەوتە بەر هێرشی راستەوخۆی قوتابخانەی فرانكفۆرت. ئەڵقەی ڤێنا لە دەیەی 1920دا چالاك بوو. بۆ بیریارە بەناوبانگەكانی ئەم ئەڵقەیە دەبێ ناوی مۆریتس شلیك ورودلف كارناپ بهێنین. ئەڵقەی ڤێنا بەتایبەتی لەژێر كاریگەری ئەندێشە فەلسەفیەكەی لۆدڤیك فینگشتایندا بوو. بە بڕوای ئەڵقەی ڤێنا مانای حوكمێك كۆمەڵە ئەزموونێكە كە هەقیقەتی ئەو حوكمە پێكدەهێنێ. بیریارانی ئەم قوتابخانەیە هەوڵیاندەدا زانست لە هەموو رەگەزە میتافیزیكیەكان جیابكەنەوەو بە نەفیكردنی هەموو پرسیارە فەلسەفیەكان جا چ میتافیزیكی یان ئەخلاقی یان ئەپستمۆلۆژی بێ، بواری زانست وەك بواری سەرجەم هەقیقەت رابگەیەنن. لە تێڕوانینی ئەواندا میتافیزیك لەبەر ئەوە قبوڵناكرێت چونكە حوكمەكانی لەسەرجەمدا بێ مانایە، چونكە ئەگەری سەلماندنیان لە ئەزموندانە هەروەها ئەوان نكوڵیان لە بوونی ئەخلاقێكی باڵا و سەروو مێژوویی دەكرد. هەموو هەوڵێكیشیان بۆ ناسینی بواری بەهاكانی ئەو دیوی جیهانی ئەزمونیان، رەتئەكردەووە.

بۆ نموونە بە بڕوای كارناپ حوكم و مەسەلە ئەخلاقیەكان لە بنەڕەتدا حوكم نین بەو مانایەی خاوەن مانای ئیدراكی نین و بە پێچەوانەی زانستەوە كە هوشیاری دەبەخشێ، لە بارەی بوونی شتێكی تایبەتەوە، زانیاری پێشكەش ناكەن. بە كورتی بیریارانی ئەڵقەی ڤێنا سەبارەت بە مەسەلەی جیاوازی زانست لە میتافیزیك و ئەخلاق، مەسەلەی جیاواز حوكمە مانادار و بێ ماناكانیان هێنایە پێشێو بڕوایان وابوو كە سەلماندنی ئەزموونیانە مەرجی پێویستە بۆ سەلماندنی مانادار یان زانستی بوونی حوكمێك هەروەها ئەوان بڕوایان بە یەكپارچەیی زانستی هەبوو. [لێرەوە] دوالیزمی "دەروونناسی" و فیزیایان رەت دەكردەوەو بەو مانایەی یەكێكیان جیهانی دەروون و ئەوی دیان جیهانی دەرەوە ئاشكرا دەكات و وایاندەزانی كە ئەو دوو زانستە هەردووكیان پێكەوە ئەزموونگەلێك وەسف دەكەن بەم مانایەش بابەتی زانست لەناو ئەزموندایە[4].

تێڕوانینی بیریارانی قوتابخانەی فرانكفۆرت بۆ رێبازی پۆزەتیڤزم وەك تیۆرەیەكی زانین و فەلسەفەی زانست، چوونیەك و یەكسان نەبووە، هربرت ماركیوز لە كتێبی "عەقڵ و شۆڕش"دا (ساڵی 1941) هێرشی كردە سەر رێبازی پۆزەتیڤزمی ئۆگست كۆنت و بەتیۆرەیەكی دژبە شۆڕش و پەرچەكردارێكی دانا دژ بە عەقلانیەتی رەخنەگرانە. بە بڕوای ئەو فەلسەفەی پۆزەتیڤزم لایەنگری ئەوەیە خوێندنەوەی كۆمەڵگا یەكسان بكات بە خوێندنەوەی سروشت بە پێی بنەمای دیدی پۆزەتیڤزم خوێندنەوەی كۆمەڵایەتی دەبێ یاساگەلێك بدۆزێتەوە كە بایەخیان وەك بایەخی یاسا فیزیاییەكان بێت. بە بڕوای ماركیوز زانستێك كە بە دوای دۆزینەوەی یاساكانی كۆمەڵگادا دەگەڕێ، رێگرێكی سەرەكی بۆ كارو گۆڕانكاری كۆمەڵایەتی دروست دەكات، لە بەرامبەر ئەمەدا ماركیوز لە سەر بنەمای تیۆرەی كۆمەڵایەتی دیالەكتیكی خۆی، جیاكاری دەكات لە نێوان خواستە درۆزنەكان كە بابەتی زانستی پۆزەتیڤزمەو خواستە راستەقینەكان كە بابەتی

ناسینی عەقڵانییە وەك دوو ڕووبەری بوونی کۆمەڵایەتی[5].

ماکس هۆرکهایمەر لە بەرهەمە سەرەتاییەکانی خۆیدا هێرشی کردە سەر ڕێبازو پۆزەتیڤزم، بەو مانایەی لە ئەڵقەی ڤیێنادا پێشکەش کرابوو. وەك گوتمان بیریارانی ئەڵقەی ڤیێنا بە هێنانە ئارای ئەندێشەی (زانستی یەکپارچە) لایەنگری میتۆدێکی زانستی هاوبەش بوون بۆ زانستە سروشتییەکان و زانستە کۆمەڵایەتییەکان لەبەرامبەر ئەمەدا هۆرکهایمەر ئەندێشەی "فەلسەفەی کۆمەڵایەتی" هێنایە پێشێ وەك سەرچاوەی سەرەکی پرسیارگەلێك کە دەبێ بەهۆی زانستە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانەوە بهێنرێتە ئاراوە. بە بڕوای ئەو "فەلسەفەی کۆمەڵایەتی" چوارچێوەیەکی ئەبستمۆلۆژی تەواو دروست دەکات کە تیایدا سەرجەم واقعی کۆمەڵایەتی، دەخرێتە سەرنجەوە.

بە بڕوای هۆرکهایمەر لە ڕوانگەی کۆمەڵناسی مەعریفەوە پەیوەندیەکی نزیك لە نێوان شێوەی بیرکردنەوەو هەلومەرجی گرووپە کۆمەڵایەتیەکاندا، هەیە. بەم پێیە دەبێ بۆ ڕەگ و ریشەی ڕێبازی پۆزەتیفزم بەناو هەلومەرجی نالەباری کردەیی [فعلی] چینی ناوەڕاستدا، بگەڕێین. بە بڕوای ئەو سەرجەم سیستەمی ئەمپریسیسمی نوێ سەربە جیهانی لیبرالیسی لە حاڵەتی گواستنەوە (یان تێپەڕیندایە)، هۆرکهایمەر لە ڕەخنەگرتنی ڕێبازی پۆزەتیڤزمدا وەك تیۆرەیەکی مەعریفە، بڕوای وابوو ئەم ڕێبازە مرۆڤ لە ناو نموونەی ئامێرناسای خۆیدا لە ریزی ڕوداوەو شتەکان دادەنێو بەم شێوەیەش جیاوازی بنەڕەتی نێوان زانستە کۆمەڵایەتیو زانستە سروشتیەکان دەسڕێتەوە.

هەروەها قوتابخانەی پۆزەتیفزم جیهان وەك چۆن لە ئەزموونداو بێ هیچ ناوەندێك ئاشکرا دەبێت، وێنادەکات و خواست و نیازە واقعیو ڕۆژانەیەکان لەیەك جیاناکاتەوە. ڕێبازی پۆزەتیفزم دەبێتە هۆی کۆکردنەوەو ئەرشیف کردنی حەقیقەتە تاك و پەرش و بڵاوەکان لەناو دەریای ڕوداوەکاندا، ئەمە لە کاتێکدا تێگەیشتنی دروستی کۆمەڵگا پێویستی بە بوونی تیۆرەیەکی دروست و دۆزینەوە تیۆرەیەکی دروستیش پێویستی بەخواست و ئیرادەیەکی دروستە.

هەروەها ڕێبازی پۆزەتیفزم جیاکاریەکی ڕەها دەکات لە نێوان شتی واقعی و بەهاکانداو بەم پێیەش زانست و ناسین لە خواست و پەیوەندیە مرۆییەکان جیادەکاتەوە. "دیدی دیالەکتیکی" لە بەرامبەر ڕێبازی پۆزەتیفسمدا بەدوای ناسینی واقعیەت لە هەمەکی خۆیدایە و بەشە پەرش و بڵاوەکانی ئەزموون لەناو بنەمای گشتی ئەزموونی مرۆڤدا دادەنێ. کاتێ ئێمە لەم دیدەوە وەك بوونەوەرێکی چالاك تەسەوری هەلومەرجی نالەباری جیهان دەکەین، ئەوا ئارەزووی گۆڕینی دەبێ بە بنەمایەکی ڕێنمایکەر کە بەهۆیەوە هەقیقەتە هەبووەکان ڕێکدەخەین و لە چوارچێوەی تیۆرەیەکیشدا فۆرمەلەی دەکەین[6].

هۆرکهایمەر بەم شێوەیە جیاوازی دەکات لە نێوان "دیدی تەقلیدی" و "دیدی ڕەخنەگرانە"دا. دیدی تەقلیدی دیدی زانستە سروشتیەکانە کە فەلسەفەو زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا لە شکڵی ڕێبازی پۆزەتیفزمدا، دەرکەوتوە. بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەم دیدەوە، زانستە کلتووری و مرۆییەکان بووە بە پاشکۆی زانستە سروشتیەکان. لەبەرامبەر ئەمەدا دیدی ڕەخنەگرانە لە زانستە مرۆییەکاندا جەخت لەوە دەکات کە هەقیقەت و مەسەلەکان "دەرەکی" نین و شێوازی دیاریکردنی هەقیقەتە بابەتیەکان

له ڕوانگەیەکی دەرەکیەوە شتێکی ڕاست نیە، هۆرکهایمەر لە ڕووی دارشتنی چەمکەکانەوە جیاوازی دەکا لە نێوان دیدی تەقلیدیو دیدی ڕەخنەگرانەدا، بەو مانایەی دیدی تەقلیدی دەست بە پۆلێنی لۆژیکی چەمکەکان بە شێوەیەکی دژایەتی هەڵنەگرو وەستاو دەکات و چەمکەکانیش بەو شێوەیە هەڵدەهێنجێنێ.

بە پێچەوانەوە دیدی ڕەخنەگرانە بۆ تێگەیشتن لە کۆمەڵگای نوێ، چەمکەکان لە شیکردنەوەی ڕەوتی ئاڵۆزی ئابووری ئاڵوگۆڕەوە هەڵدەهێنجێ، کەوابوو چەمکەکان دیدی ڕەخنەگرانە جگە لە کۆمەڵی چەمکی کورتکراوەو سادە بۆ یاسارێژکردنی واقعیەتی ئاڵۆز هیچی دی نیە، ئەگەرچی هەردوو دیدی تەقلیدیو ڕەخنەگرانە بەشێوەیەکی تەجریدیانە چەمکەکانیان هەڵدەهێنجێنن بەڵام ڕەوتی تەجریدو هەڵهێنجان لە تیۆرەی ڕەخنەگرانەدا خۆی ڕەوتی تەجریدی کۆمەڵگایەک دووبارە بەرهەم دێنێتەوە کە لەسەر بناغەی بەرهەمهێنانی ئاڵوگۆڕی دامەزراوە[7].

ئەو جیاوازیەی هۆرکهایمەر لە نێوان دیدی تەقلیدیو ڕەخنەگرانەدا دەیکات لەسەر بناغەی تێڕوانینی ئەو بۆ زانست ڕاوەستاوە کە وەك چالاکیەکی کۆمەڵایەتی سەیری دەکات. لە تێڕوانینی هۆرکهایمەردا دیدی تەقلیدی بناغەی چالاکی کۆمەڵایەتی زانایان و حەکیمە تەقلیدیەکان بووە لەناو سیستەمی دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتیدا کە لە پاڵ چالاکیە کۆمەڵایەتیەکانی دیدا ڕوویداوە بەڵام پەیوەندیەکی ئاشکراو ڕوونی لە گەڵیاندا نەبووە کاری کۆمەڵایەتی فەیلەسوفی ڕەخنەگر بە پێچەوانەی زانای بۆرژوازیەوە ئەوەیە کە کاری فکری ئەو. لەگەڵ ئارەزووی چینە سەرکوتکراوەکانی کۆمەڵگادا یەکێتیەکی دینامیکی پەیدا دەکات بە شێوەیەك کە پێشکەشکردنی دژایەتیە کۆمەڵایەتیەکان بەهۆی ئەوەوە نەك تەنها وەك دەربڕینی هەلومەرجێکی بەرجەستەی مێژووی بەڵکو وەك هێزێك لەناو ئەو هەلومەرجە دا بۆ دروستکردنی گۆڕانکاریە تیایدا. بەم شێوەیە هۆرکهایمەر هەوڵدەدات لە نێوان ناسین و ئامانج و نێوان عەقڵی تیۆریو عەقڵی عەمەلیدا یەکێتیەك دروست بکات و هەر ئەم ئەندێشەیەش خۆی یەکێکە لە خەسڵەتە سەرەکیەکان بیرکردنەوەی فرانکفۆرتیەکان[8].

تیۆدرۆ ئادۆرنۆ دیدی فەلسەفی سەرەتایی خۆی کە بەمانای ڕەخنەی هەموو تێڕوانینە فەلسەفی و تیۆرە کۆمەڵایەتیەکان بوو. ناوناوە "دیالەکتیکی نیگەتیڤ" و نکوڵیش لە ئەگەری وەرگرتنی هەموو خاڵی دەرچوونێکی ڕەهاو بنەماو بناغەی نمایی بۆ بیرکردنەوەی مرۆڤ دەکات. ئەو بە پێچەوانەی هۆرکهایمەرەوە هیچ مەیلێکی بۆ شیکردنەوەی ئابووریو تیۆرەی چینایەتی مارکس پیشان نەداو نکوڵی لە ئەگەری تیۆرەکانی زانستی مێژوو دەکرد. لەبەرئەمەش سەرقاڵی ڕەخنەی هۆشیاری چینایەتی بۆرژوازی بوو.. بابەتی سەرەکی دیالەکتیکی ڕۆشنگەری" کە هۆرکهایمەر و ئادۆرنۆ پێکەوە نووسیان، ڕەخنەی کلتووری بوو. لەو کتێبەدا کە دواتر زیاتر ڕونی دەکەینەوە، مێژووی شارستانی لە بنەڕەتدا بە شێوەیەکی فیبەریانە، وەك پێشکەوتنی دەسەڵاتی عەقڵئامێزی دەخوێنرێتەوە کەلە پرۆسەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی، لە بواری ڕەفتارو کاری کۆمەڵایەتیدا، ڕەنگ دەداتەوە.

کۆمەڵگای نوێ بەهۆی ئەو ڕوونیە درۆزنەی کە بەرهەمی بڵاوبوونەوەی فەلسەفەی پۆزەتیڤسمی زانستە، توشی دارمانێکی کلتووری بەربڵاو بووە. ئەگەرچی ئادۆرنۆ لە ئەمەریکادا

رووی کردبـووە ئـەو بەکارهێنانـەی شـێوازی ئەزموونگـەری کـە بەرهـەمی ئەمـەش کتێبـی "کەسـایەتی دەسـەلاتخواز"[9] بـوو کـە پەیوەندیـەکی بنـەڕەتی بـەتیۆرەی ڕەخنەگرانەکەیەوە نەبوو" بـەلام دواتـر پـاش گەڕانەوە بۆ ئەلمانیا دووبـارە دەستیکردەوە بە ڕەخنـەگرتن لـە کۆمەلناسـی نـاتیۆریو ڕێبـازی پۆزتفیسمی خستەژێر ڕەخنەوە. وەك دیدێـك کە نـەك تەنها ڕوونەکاتە ئـەوەی کە هەیـە بـەلکو بەشێوەیەکی پۆزەتیفانەش سەیری دەکات.

ئـادۆرنۆ لـە تیـۆرەی ئەبستمۆلۆژی خۆیـدا "ڕەخنـەی هاوتـای"[متقابل ] هەمـەکیو جوزئـی یان چەمك و بەلگـە [مصداق] پێشنیاریدەکات، بەو مانایەی کە دەبـێ ببینـرێ ئایا چەمك مافی بەلگەی خۆی پێشکەش دەکات و هـەروەها ئایا بەلگەش چەمکی خۆی بەکاردەهێنێ یان نەء. بۆ نمونە ئادۆرنۆ لـە چـەمکی "کۆمـەلگا"دا، کە لە تەسـەوری پۆزەتفیسـمەکاندا تێکشـکێنراوەو دابـەش دەبێ بۆ کۆمـەلێ بـەش، جـەخت لـەوە دەکات کە ئەم چەمکە لەمێژووی ئەورووپادا ڕەگی [شـأن سـوّم]* کۆمـەلگای فەرەنسـای پێـش شۆڕشـدایە. و لەبەرئـەوە خۆبـەخۆ چـەمکێکی ڕەخنەگرانەیـە چونکـە بـەلێنی ئـازادیو شـادیو خۆشبەختی مرۆڤی لە خۆیدا هـەلگرتووە. بـەلام کۆمەلگا هاوچەرخەکان ئـەم بەلێنـەیان جێبـەجێ نـەکردوە. لـە دیدی ڕەخنەگرانـەوە نـاکرێ بـە یەکسانی زانینـی "چـەمکی کۆمـەلگا" لەگـەل هەلومەرجی جێگـیرو بـاودا، فـەزای مێـژووی ئـەم چەمکـە وەلاوە بنێـین، کـەوابوو کۆمـەلگا بـە پێچەوانـەی تـێڕوانینی پۆزەتفیسـمەکانەوە چەمکێکی مێژووییە کە هەم جێگەی لە واقعدایە و هەم ڕانەکات لەوەی لەگەلیا ببی بەیەك شت.

هـەروەها دیـاردە کلتووریـەکان هـەلگری کۆمەلێ چەمکن کە لە سنوری شکلی کردەگیان [شکلی فعلی] زیاتر دەڕۆن و هـەلگری ڕەخنـەی واقعیەتی ژیانی کۆمەلایەتین، واقعیەتێك کە ئـەو چەمکانە لە ناویدا تواونەتەوە. بەرگری ئادۆرنۆش لە "چـەمکی" پرۆلیتاریا هـەر لەبـەر ئەمەیـە، تەنانەت ئەگەر شیکردنەوەی واقعیەتی پێکهاتەی کۆمەلایـەتی دەریخـات کـە چینـی کرێکـار چیدی بوونی نیە یان کرێکاران خۆیان بە پرۆلیتار نازانن یـان وەك لـە تیۆرەکـانی هـەندێك لـە ڕیفۆرمیستەکاندا دەگوترا، ئـەم چینـە توانـای شۆڕگێڕانەی خۆی لە دەستداوە، هیچ یەك لەمانە نـەبوون گرنگـی چـەمکی پرۆلیتاریـا وەك چەمکێکی ئازادیخواز ناسەلمێنن.

بەپێی ئەم تێڕوانینە بەلگە دەبێ بەرپرسیاری چەمك بێت، کۆمەلگای هەبوو دەبێ بەرپرسیاری کەمووکوڕی خۆی لە بەرامبـەر چەمکی بنـەڕەتی کۆمـەلگادا بـێ. بـەم شـێوەیە فەیلەسـووفی ڕەخنەگر واقعیـەت کـە لـە ڕێبازی پۆزەتیفسمدا بەشێوەیەکی ناڕەخنەگرانەو دژایـەتی هەلنـەگر دەرك دەکرێ، دەخاتە ململانێـوە لەگـەل خـودی چەمکدا. کەوابوو لە دیـدی ڕەخنەگرانـەدا خـودی چەمك لە سنووری واقعیەتی زەروری زیـاتر دەڕوا لـە کـاتێکدا کـە مـەرجی بـەکارهێنانی سـەرکەوتوانەی میتـۆدی ڕێبـازە پۆزەتیفـیزم قبوولکردنی هەلومەرجی راوەستاو، بەستووە[10].

تیـۆرەی ڕەخنەگرانـەی ئـادۆرنۆ بـە تـەواوی وەك تیۆرەیـەکی ڕەخنـەگرو خـالی لـە هـەموو توانایەك بـۆ دروسـتکردنی وێنەیـەکی پۆزەتیـف، واتـە پێشـنیاری جێگـیرێك بـۆ هەلومـەرجی بـاو، ڕاگـەیانرا. چونکـە بـەبێ تـێڕوانینی ئـادۆرنۆ وێنەکێشانی هەلومـەرجێکی داواکـراو لـە ڕووی ئەبستمۆلۆژیەوە مومکین نەبوو، بەو مانایـەی کـە کـارێکی لـەم چەشـنە پێویستی بـە قبوولکردنـی خالی دەرچوونێکی ڕەهایە بۆ فەلسەفە و هەروەها پێویسـتی بـە وێنـاکردنی جیـهان هەیـە وەك

کۆمەڵی مەسەلەو شتی ئەزموونی کە بەهۆی چەمکگەلێکی گونجاوەوە قابیلی دەرك کردنن. دیارە بیرۆکەی نەبوونی ئەگەری پێشنیارکردنی جێگرێك بۆ هەلومەرجی باو، بیرکردنەوەی ئادۆرنۆ بە سەختی لە مارکسیزم دور ئەخستەوە[11].

### "کۆمەڵناسی" سەرمایەداری دوایی؟

وەك پێشتر گوتمان قوتابخانەی فرانکفۆرت سەرەتا ڕێبازی پۆزەتڤیزمی بە شێوەیەك لە ئەندێشەی بورژوازی دادەناو بەها سوودخوازو پۆزەتیفزمەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری پێپێشکەوتویان بە یەکێك لە هێزە سەرەکیەکانی پارێزەری دەسەڵات دەزانیو هەر لەبەرئەمەش ڕەخنەگرتن لە ئایدۆلۆژیاو بەهاکان، بە هۆکارێکی گرنگ دەزانرا بۆ رزگاربوون لە دەسەڵات. بەڵام دواتر بەتایبەتی لە کتێبەکانی "دیالەکتیکی رۆشنگەری" و "مرۆڤی تاك رەهەند"ی (مارکیوزن)دا هۆی سەرەکی دەسەڵات گەڕێنرایەوە بۆ زانست و تەکنەلۆژیاو عەقڵانیەت ئامێری، لەم ڕوانگەیەوە قوتابخانەی فرانکفۆرت بۆ شیکردنەوەی سەرمایەداری دوای تەفسیرێکی جیاوازی لە دەربڕینەکانی مارکسیزمی ئەرسۆزکس و مارکسیزمی هیگڵی پێشکەش کرد.

مارکسیزمی ئەرسۆزکس کە رەگی لە ئەندێشەکانی ئەنگلز و بە تایبەتی لە "ئەنتی دۆرینگ"دا بووە، بڕوای وایە پرۆسەی مێژووی پرۆسەیەکی ناچاریانەی پەرەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەکانە کە بەهۆی دژایەتیەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداریەوە دەبێتە هۆی رزگاری و نەمانیلە خۆنامۆبوون. لە ڕووی ئەبستمۆلۆژیەوە مارکسیزمە ئەرسۆزکسەکان بڕوایان وابوو کە هوشیاری و چەمکەکان ڕەنگدانەوەش و هەلومەرجە دیاریکراوەکانن.

ئیکرنمیزم (ئابووریگەری) و دترمینزم (جبریەت) بە دوو بنەمای سەرەکی ئەرسۆزکسی دەژمێرێن. گۆڕانی مادی بەهۆی جوڵەی شۆڕشگێڕانەو گۆڕانی لەناکاوی گۆڕانکاریە چەندایەتیەکانەوە بۆ گۆڕانکاریە چۆنایەتیەکان، دروست دەبێ، کۆمەڵگا لەسەر بنەمای جوڵەی دیالەکتیکی کە هەم لە بواری سروشت و هەم لە بواری زیهن و کۆمەڵگادا یاسای سەرەکی گۆڕانە، دژایەتیەکانی خۆی چارەسەر دەکات و بە ئازادیو رزگاربوون لەنامۆبوون دەگات. قوتابخانەی فرانکفۆرت لە بەرامبەر مارکسیزمی ئەرسۆزکسدا ئیستدلالی کرد کە پێشکەوتنی بەردەوام لە دەسەڵاتی عەقڵانی بەسەر سروشتدا لە هەمان کاتدا دەبێتە هۆی پەیدابوونی شێوەیەکی تازەی "بەشت بوون" Refication کە هەموو شێوە هوشیاریەکی شۆڕشگێڕانەو خەباتی چینایەتی لەناو دەبات. لەم هەلومەرجەدا سیستەمی سیاسی لە چینەکان سەربەخۆ دەبێت و کۆمەڵگا دەچێتە ژێر دەسەڵاتی هێزێکی ناشەخسیو ناچینایەتیەوە. ئەم بەشتبوونە لێکچوونێکی ئاشکرای لەگەڵ ئەندێشەی ماکس فیبەر لە بارەی عەقڵانیبوون و پەیدابوونی "قەفەسی ئاسنین" ی کۆمەڵگای نوێوە هەیە.

مارکسیزمی هیگڵی لە ئەندێشە جۆرج لۆکاشدا گەیشتە لوتکەی خۆی. لۆکاش لە کتێبی "مێژوو و هوشیاری چینایەتی"دا تێڕوانینی ئەنگلزو لینین بۆ دیالەکتیك وەك کۆمەڵێ یاسا کە بۆ سروشت بەکاردەهێنرێ، رەت کردەوە. ئەو هەروەها ئەندێشە تیکونومیستی هەڵهێنجانی سەرجەم ژیانی کۆمەڵایەتیو ئەخلاقی لە ژێرخانی ئابووریەوە، خستە ژێر پرسیارەوە. پەیوەندی ناسین لە زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا وەك پەیوەندی ناسین لە زانستە سروشتیەکاندا نیە و خودو بابەت "چرکە گەلێك" و بەشەکانی

کۆمەڵگان و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی ژیهن لەخۆ نامۆن.

لە سەدەی نۆزدەدا بەهۆی گەشەکردنی پیشەسازیەوە، هێزە مادیەکان پڕبوون لە ژیانی ڕۆحانی لە کاتێکدا کە بوونی مرۆیی گۆڕا بۆ هێزێکی مادی، بەم شێوە رۆح بوو بە شت و شتەکانیش لە رۆحدا غەرق بوون. پەیوەندی دیالەکتیکی خودو بابەت بەتایبەتی سەبارەت بە پرۆلیتاریا ئاشکرایە. چونکە پرۆلیتاریا بەهۆی سەرمایەداریەوە، گۆڕاوە بۆ کار یان کالایەکی ئابوری، بەڵام ناتوانێ بەهۆی بەدەستهێنانی هوشیاری چینایەتیەوە هوشیاربێ بە هەلومەرجی خۆی وەك کالایەك. بەم پێیە پرۆسەی مێژوو بریتیە لە دروستبوونی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی پرۆلیتاریا کە دەبێتە هۆی خودهوشیاری تیۆریانە. بە بڕوای لۆکاش کار پرۆسەیەکی هەمەکیە وەك ئایدیا لە فەلسەفەی هیگڵداو ئەو دەزگایانەی کە بەرجەستە [یان بابەتی] دەکەن بەشێوەیەکی کاتی دەبنە بەربەست لەبەردەم پەرەسەندنیدا بەڵام دواجار بەهۆی ئەوەوە بەرەو کەنارێك پەرت دەکرێت.

ئەم دەزگایانە یان ئەم بەشانە لە هەمەکی لەبەرامبەر هەمەکیدا، بابەتی زانستە دروینەکانن لە کاتێکدا زانستی واقعی بیر لە پرۆسەی هەمەکی لە مێژوو و یان پراکتیکدا دەکاتەوە هەمەکی یان کاری مرۆڤ تا هەنووکە ناهوشیار بووە بە ماهیەتی خۆی بەڵام ناهوشیاری ئەو وەك ناهوشیاری رۆحی هیگڵی لە کاری تێگەیشتندا تەواو دەبێ. بەدەستهێنانی خودهوشیاری چینایەتی بەهۆی پرۆلیتاریەوە بەمانای پەیدابوونی هوشیاری مێژوویەو یەکێتی خودو بابەتە، کەوابوو کار وەك رۆحی هیگڵی بەتێپەڕین بەناو جیهانی لەخۆنامۆدا دەگەڕێتەوە بۆ خۆیو سەرجەم پرۆسەی مێژوویش لە پرۆلیتاریادا بە ناسینی خۆی دەگات[12].

قوتابخانەی فرانكفۆرت لە بەرامبەر ئەم تەفسیرەدا ئیستدلال دەکات لە خۆنامۆبوون و بەشت بوون لە کۆمەڵگای سەرمایەداری دوایدا سەرتاپاگیرەو پرۆلیتاریاش ناتوانێ دەربازبێ لێی و دەکرێ رەوتی گۆڕانی مێژووی تەنها وەك پێکهاتنی عەقڵانیەتی ئامێری تەفسیر بکەین. بەم پێیە دیدی رەخنەگرانەی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەم ڕوانگەیەوە لە دوو ئاراستە خەباتی دەکرد: یەکەم دژی بەیانی میتافیزیکی هەمەکی وەك بوارێکی میتای (ماوراءی) بەشێوەی مارکسیزمی هیگڵی. قوتابخانەی فۆانکفۆرت لە بەرامبەر ئەم تێڕوانینە میتافیزیکیەدا بۆ "هەمەکی" تیۆرەیەکی "کۆمەڵایەتی" گرتەبەر، بەو مانایەی کە هەمەکی تا ئەو شوێنە مانای هەیە کە ئاماژە بۆ کۆمەڵگا دەکات، دووهەم وەك روونمان کردەوە دژی دیدی پۆزەتیڤزم کە مانای لە هەمەکی دەستێنێ.

قوتابخانەی فۆانکفۆرت بۆ شیکردنەوەی کۆمەڵناسانەی سەرمایەداری دوای تێگەیشتنی ماکس فیبەر بۆ پرۆسەی عەقڵانیەت وەك لە دەستدانی ماناو ئازادی لەگەڵ شیکردنەوەی مارکسدا بۆ بەکالایی بوون تێك ئەئاڵێنێ. عەقڵانیەت بەمانای لە دەستدانی ئازادی و مانا، دەبێتە هۆی پەیدابوونی بەشت بوونی سەرتاپاگیرو رەخنەکردنی روو لە زیادی بەهاکانی ئابووری کالای بۆ ناو کۆمەڵگاو کلتوور.

هۆرکهایمەر لە بەرهەمە سەرەتاییەکانیدا بڕوای وابوو کە دەبێ بۆ پێگەی واقعی خاڵی دەرچوونی ئازادیخوازانەی دیدی رەخنەگرانە، بەناو هەلومەرجی پرۆلیتاریا لە کۆمەڵگای نوێدا بگەڕێین. مارکسیش تیۆرەی رەخنەگرانەی خۆی لە سەر بناغەی هەلومەرجی پرۆلیتاریا

دامەزراندبوو. بەلام بە بڕوای هۆرکهایمەر هەلومەرجی فیعلی پرۆلیتاریا زامنی ناسینێکی دروست نیە، چونکە ڕەنگە جیهان لە ڕوانگەی ئەم چینەوە جیاواز لەوەی کە هەیە دەرکەوێت (واتە ڕەنگە ئەو چینە خاوەن هوشیاری درۆزنانە بێت). لێرەدا بیریاری ڕەخنەگری ئەرکی ناسینی دروستی واقعیەتی دەکەوێتە ئەستۆ. بەلام دواجار لە ئەندێشەی هۆرکهایمەردا پێگەی واقعی یان کۆمەلایەتی بەدیهاتنی یەکێتی نێوان بیریاری ڕەخنەگرو چینە سەرکوتکراوەکان ڕوون نیە، چونکە نائومێدی هۆرکهایمەر سەبارەت بە ڕۆلی چینی کرێکار هێواش هێواش بەرەو ڕەشبینیەکی قولی برد سەبارەت بە بوونی هەر جۆرە هێزێکی بەڕاستی ڕزگاریخوازو شۆڕشگێڕ لە کۆمەلگای مۆدێرندا[13].

هۆرکهایمەر و ئادۆرنۆ لە یەکێك لە وتارە سەرەتاییەکانی خۆیاندا "پیشەسازی کلتوور" دەسەلاتی عەقلئامێریان بە یەکێ لە تایبەتمەندیە سەرەکیەکانی سەردەم دانا کە بە بڕوای ئەوان بۆتە هۆی لەناوبردنی سەربەخۆیی ڕێژەی تاکەکەس. لە سەردەمی سەرمایەداری دوایدا ئاوێتە بوونی کلتوورو سەرگەرمی بۆتە هۆی دروستبوونی کلتوورێکی مێگەلی دزێو. مەسرەفکەرانی پیشەسازی کلتووری ناچار بە کڕین و سوودوەرگرتن لە بەرهەمەکانی کردووە. دەکرێ ئاستی بەهێزی "پیشەسازی کلتووری" بە ئاستی بوونی سەرپێچیکردن [مخالفت] لە کۆمەلگادا بپێوین، تایبەتمەندی "پیشەسازی کلتووری" لە سەردەمی سەرمایەداری پێشکەوتودا ئەوەیە کە ئەگەری دژایەتی بنەڕەتی لەگەل پێکهاتەی جێگیرو بالا دەستدا نادات[14].

بەم شێوەیە لە سەردەمی دەسەلاتی عەقلانیەتی ئامێریدا بەهای تاکەکەسی دەکەوێتە ژێر هەڕەشەوە. هۆرکهایمەریش ڕایگەیاند کە پاراستن و گەشەپێدانی بەهاو ئازادی سنوورداری مرۆڤ، تەنها بەهۆی گێڕانەوەی ئارەزووە مەزهەبیەکانەوە دێتە دی، ئەو بڕوای وابوو ئەوەی لە ئیلاهیاتدا گرنگ دەردەکەوێت ئەو هوشیاریەیە کە جیهان "دیاردەیە" و هەقیقەتی ڕەهاو ئامانجی غائی نیەو ئەمەش خۆی ڕێگەمان لێدەگرێت تەسلیم بین لە بەرامبەر واقعیەتی نالەباردا[15].

ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر لە "دیالەکتیکی ڕۆشنگەری"دا فاشیزم کە زەمینە خۆشکردنی ئەفسانەو ئەندێشەی دژ بە عەقلانین، بەدەرئەنجامی پرۆسەی عەقلانیەت دەزانن. بە بڕوای ئەوان پەیدابوونی کۆمەلگا سەرکوتکەرو وێرانکەرەکان کە سەربەخۆیو ئازادی تاکەکەس لەناو دەبات، دەرئەنجامی هەمان ئەو هێزانەیە کە کۆی هێزە پێشکەوتنخوازەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری پێکدەهێنن. کەوابوو فاشیزم وەك لوتکەی گەشەکردنی کۆمەلگای نوێ بە ڕێکەوتنێکی مێژووی یان بەدەرئەنجامی بەردەوامی پاشماوەکانی کۆمەلگای ئەرستوکراتی لەناو دەروونی دەولەتی پیشەسازی نوێوە، نازانرێت.

بزوتنەوەی ڕۆشنگەری کە بە پرۆسەی عەقلانی دەسەلات بەسەر سروشتدا، دەست پێدەکات بەهۆی پەرەسەندنی خودی ئەو پرۆسەیەوە توشی شکست دەبێت. ڕۆشنگەری وەك دیدێکی عەقلانی بۆ جیهان و وەلامدانەوەیەك بۆ پێداویستی پاراستنی ژیانی مرۆڤ، پەیدا بوو. لەم پرۆسەیەدا زیهنی مرۆڤ خۆی لە سروشت جیا دەکاتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ وەك بابەتی دەسەلات مامەلەی لەگەل بکات. بەلام ئەم پەیوەندیە ژێرخانیە بە سروشتەوە، لە ئاستی سەرخانی کلتووریدا کۆمەلی زیان دروست دەکات. لەم پرۆسەیەدا چەمك و وتەزا

موجەرەدەکان دەبنە جێگری جیهانی بێ ناوەندی [بێ واسطە] ئەزموون. "بەهای سود" جێگای خۆی بە "بەهای ئاڵوگۆڕی" دەدات و مەسەلە بێ وێنەو تایبەتەکان دەبنە کۆیلەی بڕیارو یاسا گشتیەکان. دەسەڵات بەسەر سروشتی دەرەکیدا بە بەهای نکوڵیکردن لە سروشتی دەرونی مرۆڤ بەدەست دێ. دەسەڵاتگرتن بەسەر سروشتدا هاوڕێی لەگەڵ بەردەوامبوونی کۆیلە کردنی زهنیەتی مرۆڤدا، ئەنجام دەدرێ. رزگاربوون لە لۆژیکی دەسەڵات پێویستی بە ناسینی خودی زیهن هەیە وەك سروشت. بەڵام بەهۆی دەسەڵاتی پیشەسازی کلتووری زهنیەت ناتوانێ بەرهەمی پێشکەوتنی تەکنیکی رکێف بکات. پرۆسەی مێژووی مەیلێکی بەرجەستەی [یان دیاریکراوی] بۆ بەشت بوونی هەموو پەیوەندیەکان هەیە. دەسەلاتی پەیوەندی ئاڵوگۆڕی کاڵاییەکان لە ئاستی ژێرخاندا هاوڕێیە لەگەڵ بەکاڵایی بوونی دیاردەکانی سەرخاندا[16].

سەرەکیترین ئەندێشەی کۆمەڵناسیانەی ئادۆرنۆ، ئەندێشە سەرتاپا گیربوونی بەشت بوونە کە دواجار هەموو جوولەیەکی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی چ لە شکڵی هوشیاری چینایەتی و چ لە شێوەی دروستبوونی پێکهاتەی زیانبەخشی سەرمایەداریدا، لەناو دەبات، لە تێڕوانینی ئادۆرنۆدا فاشیزم لوتکەی پرۆسەی بەشت بوون بوو، بەڵام فاشیزم تەنها رەهەندی دەرونی هەلومەرجی هەنوکەیی [یان فیعلی] جیهانی سەرمایەداری دوایی، ئاشکرا کردووە. پاش کۆتایی هاتنی فاشیزمیش ئادۆرنۆ جەختی لە بەهای دیدی مێژووی خۆی کرد، بەو مانایەی پرۆسەی گۆڕانی مێژووی جگە لە دروستبوونی عەقڵانیەتی ئامێری هیچ چاری نیە، بەم شێوەیە دەبوو ئادۆرنۆ بڕوای ماتریالیزمی مێژووی کە لەسەر بنەمای ئەگەری کاری سیاسی دامەزراوە، رەتبکاتەوە، بەلام وەك بینیمان ئەو بەرگری لە ئەگەری بوونی چەمکە تیۆریەکان بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە بەرژەوەندیو ئارەزووی کۆمەلایەتیو سیاسی دەکرد و بەم پێیەش بەدوای پێشکەشکردنی شێوەگەلێکی تازەی هوشیاریدا دەگەڕا.

لە دیدی ئادۆرنۆوە پەیدابوونی هوشیاری ئازادیخوازی بە مانا لۆکاشیەکەی بەربەستی پرۆسەی هەمەکی عەقڵانیەت ئامێری کەوتوون. تەنها فۆرمە پەرش و بڵاوەکانی هوشیاری ستاتیکیانە دەتوانێ بەشێوەیەکی بنەڕەتی لە بەرامبەر ئەم پرۆسەیەدا راوەستێ. کەوابوو فەلسەفەی رەخنەگر بەسەرنجدان لە پرۆسەی گشتی بەشت بوون لە کۆمەڵگای نوێدا، تەنها ئومێدی بە ستاتیکایە. تەنها هونەرو فەلسەفەی رەخنەگر واتە رەخنەگرتنی فەلسەفەی هەمەکی درۆزن دەتوانێ فۆرمی تازە بۆ هوشیاری پێشکەش بکات، هونەری راستەقینە خاوەن توانای وێرانکردن و بناغە هەڵتەکاندنە. لەم ڕوانگەیەوە هونەر لە بەرامبەر زانستی پۆزەتیڤزمدا رادەوەستێ چونکە سیمایەکی باڵاترە لە ناسین کە ڕووی لە گەڕانەوە بەدوای هەقیقەت لە ئایندەدا. شێوەی هەڵوەستەکردنی هونەرمەندانە لەبەردەم واقعی کۆمەلایەتیدا هاوڕێیە لەگەڵ تێڕوانین و پێشنیار گەلێك بۆ هەلومەرجی گونجاو [یان لەبار] بۆ ئایندە، لە کاتێکدا زانست تەنها واقعی هەبوو پیشان دەداتەوە.

دیدی ستاتیکانە هۆکارێکە کە بەهۆیەوە دیدی رەخنەگرانە دەتوانێ وێنەی سەرتاپاگیربووی عەقڵانیەت ئامێری بکات کە لەسەر بنەمای ئابووری کالایی دەمەزراوە. تەنها کاری هونەری فەرد دەتوانێ ئەگەری پەیدابوونی عەقڵانیەتێك ئامادە بکات لەبەرامبەر بەشت

بووندا رابوەستێت. بەم پێیەش هەلومەرجی رزگاری ئەوەندە بالاو دوورەدەستە کە لە بەر دەست خەڵکدا نیە. هونەرو دیدی ستاتیکانە بە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی رزگاریخواز ناژمێریت و بەگشتیش ئەندێشە پێشکەوتن لە دوای بەشت بوونی گشتی کۆمەڵگا دواجار ناموکین دەبێو بەسەرنجدان لە سروشتی کۆمەڵگای جێگیر، دیدی رەخنەگرانەی ئادۆرنۆ وەرگرێکی [مخاطب] واقعی نادۆزێتەوە. هونەر وەك فۆرمێکی یەکێتی خودو بابەت بکەوێتە دەرەوەی بواری زەرورەت و لە دیسپۆتیزمی سەرتاپاگیری رۆشنگەرییو دەسەڵاتی عەقڵانیەت رادەکات. پەنا بۆ دەروونی خۆی دەبات بۆ ئەوەی نەفی هوشیاری بەشت بووی جیهانی ئەزموونی بکات، هونەر لە جیهانێکی لەم چەشنەدا خەسڵەتێکی پەروەردەیی [تعلیمی] نیە بەڵکو نموونەی بونێکی دی، پێشکەش دەکات. هونەر بۆ هونەر بەمانای هونەر دژی بازارە[17].

مارکیوز وەك گوتمان لەسەر بنەمای دنیای [تصور] هیگڵی، جیاوازی دەکرد لەنێوان خواستە راستەقینەو خواستە درۆزنەکاندا. بە بڕوای ئەو تا خواستە راستەقینەکان لەبەرچاو نەگیرێن، ژیانی کۆمەڵایەتی تاك رەهەندانە دەبێ تەنها خواستە رۆژانەیو درۆینەکانی لەخۆ دەگرێ. بەڵام بەدەر لەوەی چینێك خواستە راستەقینەکانی مرۆڤ هەست پێ بکات و یان حیزبێك پروپاگەندەی بۆ بکات، پانتایی مێژووی هیچ کاتێ لەم خواستە راستەقینانە مرۆڤ بەتاڵ نابنەوە. لە ساڵی 1934 دا مارکیوز بڕوای وابوو بزوتنەوەی کرێکاری وەك نوێنەری خواستە راستەقینەکان لە بەردەم مەترسیدایە، پاش ئەمەش لە ساڵی 1938دا رایگەیاند کە کرێکاران ناتوانن خواستی راستەقینە و درۆینە لەیەك جیابکەنەوە و دواجار لە ساڵی 1941 بڕوای وابوو عەقڵ هەڵگری خواستە راستەقینەکانەو قوتابخانەی هیگڵی قوتابخانەیەکی شۆڕشگێڕە چونکە لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە کە ئەوەی لە روانگەی مرۆڤەکانەوە هەقیقیو عەقڵانیە، دەبێ بەهۆی رێکخستنی کۆمەڵایەتیەوە بێتەدی.

مارکیوز پاش کۆچکردنی بۆ ئەمریکا بە زمانێکی دی ئەندێشەکانی خۆی دەربڕی. نەبوونی بزوتنەوەی کرێکارییو بڵاوبوونەوەی دەروونشیکاری فرۆیدی لەو وڵاتەدا، مارکیوزی بەرەو ئەوە برد تا ئەمجارە خواستە راستەقینەکان بەهۆی چەکی ئیروس و یۆتۆپیای ئیرۆسی ئازادکراوەوە، دەربڕێ. ئەو بەزمانی فرۆید دەیگوت، خواستە راستەقینەکان خواستە ناهوشیاریەکانی پرۆلیتاریان و هەر لەبەر ئەم هۆیەش ئەم چینە شۆڕش ناکات. ئەو بەربەستانەی لە بەردەم هوشیاری راستەقینەی کرێکاراندا هەیە، لە هەلومەرجی هەبووەوە سەرچاوە دەگرن. مارکیوز بە دوورو درێژی ئەم هەلومەرجەی لە کتێبی "مرۆڤی تاك رەهەند"دا لەژێر ناونیشانی "دەسەڵاتی عەقڵانیەتی ئامێری"دا روونکردۆتەوەو گوتی دەسەڵاتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا بەهۆی زانست و تەکنەلۆژیاوە بۆتە هۆی پەیدابوونی فۆرمێکی تازە لە دەسەڵات بەسەر مرۆڤدا.

لەم پرۆسەیەدا وەبەرهێنانی [استثمار] مرۆڤ و سروشت بە شێوەیەکی روو لەزیاد زانستیو عەقڵانی بووەو مرۆڤ وەك ئامێرێك سوودی لێوەردەگیرێ. ئەو شتانەی مرۆڤ دروستیکردووە، بوون بە فەرمانڕەوای مرۆڤ. عەقڵانیەتی ئامێری، هێزێکە لە دەستێوەردان و کۆنترۆڵی مرۆڤ چۆتە دەرێو رەوتی عەقڵانیەتی ئامێری بەدەر لەوەی چ فۆرمێکی دیاری سیستەمی سیاسی یان ئابوری بالادەستە، دەسەڵات پەیدا دەکات. کەوابوو کۆمەڵگای نوێ

خۆی له خۆیدا کۆمەڵگایەکی ئامێریەو ماهیەتی بەهۆی سیستەمی سیاسی یان ئابووریەوە دیاری ناکرێت. بەم شێوەیە بەگشتی فرانکفۆرتیەکان لە چارەنووسی مرۆڤ لەسەردەمی دەسەلاتی عەقلانیەت ئامێریدا، نیگەران بوون. بە بڕوای ئەوان ئەستەمە هێزێك بدۆزرێتەوە کە توانای رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئەم دەسەلاتەدا هەبێ(18).

وەك بینیمان عەقلانیەت (بەمانا فیبەریەکەی) هاورێ لەگەڵ رەوتی بەکالاّبوون و بەشتبووندا (بەمانا مارکسیەکەی)بە تایبەتمەندیە سەرەکیەکانی بیرکردنەوەی رەخنەگرانەی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەژمێرێت..

## پەراوێزەکان:


1- T. Bottomore, The Frankfurt School (Laondon: Tavisttock 1984), PP. 15-27.

2- T. Adorno and M. Horkheimer, Dialectic of Enligtenment, (N.Y: Herder & Herder, 1972).

3- See R. Nisbet, The Sociolgical Tradition. Heineman, London, 1966.

4- A. Ayer (ed) Logical Rositivism, (Glenee: Ill, 1959), Introduction.

5- H. Marcuse, Reason and Revolution: Hegel and the Rise of Social theory, (oxford u.p,1941), PP.343-5.

6- M. Horkheimer, Critical (Theory: Selected Essays (N.y: Herder & Herder, 1927). PP. 160-92.

7- A. Honneth, "Communication and Reconeiliation: Habermas Critique of Adorno", Telos, spring 1927, No. 39. PP.45-61.

8- Horkheimer , op. Cit, PP. 208-210.

9- The Authortarin personality, (N. Y: Harper& Row, 1950).

10- Honneth, op. Cit.

11- Bottommore, op. Cit, PP. 31-32.

12- "Lukacs" in McInnes, The western Marxists.

13- Bottomore, op. Cit, PP. 29-30.

14- Dilectic of Enligtenment. PP. 120-160.

15- Bottomore, op. Cit, PP. 41-42.

16- Dilectic of Enlightenment, Passim.

17- R. Berman, "Adorno, Marxism and Art", Telos, Winter 1977-78, No. 34. PP. 157-166.

18- "Marcuse" in McInnes, op. Cit.


*لێرەدا ئەم دەستەواژەیەمان بۆ نەکراوە بە کوردی

## سەرچاوە:


بەشێکە لە فەسڵی کتێبێکی دکتۆر حسین بشیریة بەم ناونیشانەی خوارەوە:

دولت عقل- ده گفتار در فلسفەو جامعە شناسی سیاسی -دكتور حسين بشيريه- مؤسسه نشر علوم نوين چاپ اول 1374 فصل چهارم ص 93-111.


❑

# بنەما فەلسەفیەکانی تیۆرەی رەخنەیی

■ محەمەد نورەدین ئەفایە

• و. لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

ئایا دەبێ مرۆڤ لەسەر ئاستی میتۆدو بایەخە تایبەتیەکانی خۆی.. چ مامەڵەیەك لەگەڵ دەقە جیاوازو جۆراوجۆرو پەرت و بڵاوەکانی بیریارانی ئەو تیۆرەدا بکا کە بە "تیۆری رەخنەیی" ناوی دەرکردووە؟.. ئایا ئەو تیۆرە رەخنەییە تیۆرێکی فەلسەفیە، یان قوتابخانەیەکی فیکریە کە لە رێگای ئاکارو تایبەتمەندیەکانیەوە لایەنگرانی خۆی کۆکردۆتەوە.. یان ئاراستەیەکی فیکریە کە دامەزرێنەرانی هەوڵیانداوە رەوتێکی فەلسەفی پێك بێنن خاوەنی میتۆدو چەمکی تایبەتی خۆی بێت؟ یاخود مەسەلەکە پەیوەندیدارە بە هەستیاریەکی فیکریەوە کە هەموو لایەنگیریی‌و رەوتگەریەکی دۆگمایی (النسقیه الدوغمائیه) رەتدەکاتەوە؟ دواجار ئایا پێگەی یۆرگن هابرماس لە خەملینی ئەم تیۆرە رەخنەییەدا چیە؟

دەکرێ چەندین پرسیاری لەم جۆرە سەبارەت بە تیۆری رەخنەیی بخەینەڕوو، بەڵام ئەوەی بەلامانەوە گرنگە.. وەستانە لەسەر ئەو بنەما فیکریی‌و خەمە فەلسەفیانەی کە مۆرکێکی تایبەت بە فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی دەبەخشن.. جا چ لەسەر ئاستی فەلسەفەو زانستە کۆمەڵایەتیەکان بێ، یا لەسەر ئاستی ئەقڵ و مۆدێرنە، یا تاك و کۆنترۆڵ و.. هتد.. بێ، دواتر دەربارەی ئاستەکانی کاریگەریی ئەم خەمە فەلسەفیانە لەسەر گەشەی فیکریی‌و تایبەتی یۆرگن هابرماس قسە دەکەین، کە بە بڕوای هەندێ لێکۆڵیار درێژبوونەوەی "قوتابخانەی فرانکفۆرت"ە[1]، یان نوێنەری ئێستای تیۆری رەخنەییە[2]. هەندێکیش بڕوایان وایە کە فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی نوێنەرایەتی دوو نەوە دەکەن: یەکەمیان (نەوەی دامەزرێنەران) لە بۆلۆك و هۆرکاریمەرەوە تا

ماركیۆز، ئەوەی دووەمیش كە هابرماس دیارترین نوێنەریەتی[3]. بەڵام هەندێكیان لە باسكردنی مێژووی تیۆری رەخنەییدا هابرماس تێكەڵی بیریارانی ئەو مێژووە ناكەن، بەڵكو بڕوایان وایە كە ئەو خۆی بۆ خۆی پێگەیەكی تایبەتی هەیەو، لەگەڵ پێشەنگانی ئەو تیۆرەدا یەكناگرێتەوە[4].

بەهەر حاڵ هەرچەندە هەندێك لەم بۆچوونانە هابرماس بە یەكێك لە پێكهێنەرانی تیۆری رەخنەیی لە قەڵەم دەدەن و، هەندێكی تریشیان سوورن لەسەر دوورخستنەوەی هابرماس لەو تیۆرە.. بەڵام ئێمە لەلای خۆمانەوە هەوڵدەدەین لەسەر گرنگترین ئەو مەسەلە فەلسەفیانە بوەستین كە نوێنەرانی تیۆری رەخنەییان سەرقاڵ كردووەو، كاریگەریان لەسەر گەشەی تایبەتی هابرماس بەجێهێشتووە.. بەم پێیە ئایا هابرماس لەو چەمك و شێوازانە دووركەوتۆتەوە كە پێشەنگانی تیۆری رەخنەیی پەیڕەویان كردووە.. یان بۆخۆی چەند چەمكێكی تازەی داڕشتووەو، پشت ئەستوورە بە میتۆدێكی نوێ؟.. لێرەوە ئێمە وای بەباش دەزانین لەم قۆناغەی باسەكەماندا تەنها سەبارەت بە تیۆری رەخنەیی بدوێین و، لە دەرفەتێكی تردا سەبارەت بە هابرماس و پرۆژە فەلسەفیەكەی قسەو باس بكەین.

### *1- پرسیارەكانی تیۆرەی رەخنەیی:*

ئەگەر وادابنێین تیۆرەی رەخنەیی خەمڵینی بیركردنەوەی قوتابخانەیەك یا رەوتێكە، یا بریتیە لە هێڵێك كە لە سەرەتادا خاوەنەكانی بە رەخنە دەستیان پێكردووەو، لە كۆتاییدا پابەندبوونی خۆیان، بەشێوەیەك لە شێوەكان، سەبارەت بەو كردووە.. ئەوا ئێمە تێبینیشەیان بۆ دەكەین كە زۆربەی ئەو لێكۆڵیارو بیریارانەی لەسەر ئەم تیۆرە دەژمێردرێن "هەوێنێكی تیۆری" كۆیان دەكاتەوە، كە هۆركاریمەرو ئادۆرنۆ لە لایەك و، ماركیۆز لەلایەكی ترەوە، كاریان كردووە بۆ دامەزراندن و پێكهێنانی توخمەكانی. هەروەكو (میگڵ ئابنسۆر)یش بۆی دەچێ دەكرێ بڵێین ئەم تیۆرە سێ وێستگەی بینیوە: **وێستگەی یەكەم گفتوگۆكانی كۆتایی ساڵی 1929**ی نێوان (بنیامین و ئادۆرنۆ)یە؛ **وێستگەی دووەم** كەلە ساڵی **1937**دایە بریتیە لە دەرچوونی "تیۆری تەقلیدیو تیۆری رەخنەیی- هۆركاریمەر" و، "فەلسەفەو تیۆری رەخنەیی -ماركیۆز"؛ **وێستگەی سێیەمیش** ئەو ماریكاریە فیكریە دەگمەنەو، ئەو پێككەیشتنە یەكلاییی كەرەوەیەی نێوان هۆركاریمەرو ئادۆرنۆیە كاتێ چەند كتێبێكی هاوبەشیان پێكەوەو، چەند كتێبێكیشیان بەجیا دەركرد[5]. ئەم دوو بیریارە لەگەڵ هەربرت ماركیۆزدا "هەوێنی تیۆری" و، بناغەی فیكریی تیۆر ی رەخنەیی پێك دێنن، گومانیش لەوەدانیە كە چەند بیریارو فەیلەسووفێكی وەك كارل كۆرش، جۆرج لۆكاش، والتەر بنیامین و، ئەرنست بلوخ، كاریگەریەكی زۆریان لەسەر خەملاندن و پێكهێنانی رەگەزە تیۆریەكانی ئەم هەوێنە جێهێشتوە بە مەبەستی نوێنەرایەتیكردنی هێزێكی رەخنەیی بەرامبەر بارودۆخی ئەڵمانیاو گۆڕانكاریەكانی فیكرو سیاسەت لە كۆمەڵگای مۆدێرندا. هەربۆیە هۆركاریمەر لە پێشەكی كتێبی (خەیاڵدانی دیالیكتیكی)ی مارتان جای-دا نووسیویەتی: مەسەلەكە پەیوەندی بە "كەسانێكەوە هەبوو كە بایەخێكی هاوبەشیان بە تیۆری رەخنەیی دەدا، هەرچەندە پشت ئەستوور بوون بە توانای زانكۆیی جۆراو جۆر، بەڵام ئەوەی یەكی

دەخستن: هەموویان لە گۆشەنیگایەکی رەخنەییەوە دەیانڕوانیە کۆمەڵگا"[(6)].

بەدیهێنانی رووبەرێکی رەخنەیی بەرامبەر ئەوەی کە هەیە.. یەکەمین خەسڵەتی بیریارانی ئەم تیۆرەیە، بەڵام داخۆ چ رەخنەیەك؟ چونکە فەلسەفەی ئەڵمانی بە گشتی ، هەر لە (کانت)ەوە تا (نیچە) رەخنەی کردۆتە توخمێکی بنەڕەتیی روانینی فەلسەفی، بۆیە دەپرسین ئایا چەمکی رەخنە لای تیۆری رەخنەیی درێژبوونەوەی ئەو کەلەپوورە فەلسەفیە ئەڵمانیەیە؟ یان دەلالەتێکی جیاوازی هەیەو پەیوەندی بەو ئاراستە رەخنەییانەوە نیە کە فەیلەسووفەکان بە درێژایی مێژووی فەلسەفەی ئەڵمانی مۆدێرن دایانڕشتووە؟

رەنگە تیۆری رەخنەیی لە بنەڕەتدا لە روانینی رەخنەیی بیریارانی دیکەو، دەقە فەلسەفیەکانی پێشووترەوە سەرچاوەی گرتبێ. ئەم بۆچوونەش بەسەر زۆر فەیلەسووف و بیریاردا جێبەجێ دەبێ، چونکە هەر رووبەرێکی رەخنەیی، دەلالەت و مەبەستی هەرچیەك بێت، بەدی نایەت گەر درێژبوونەوەی ئاستێکی رابردوو نەبێت و گفتوگۆ لەگەڵ ئێستادا نەکا. بەڵام ئەوەی تیۆری رەخنەیی لە تیۆرەکانی تر جیادەکاتەوە ئەو شێوازە تایبەتەی بیریارەکانیەتی سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی مۆدێرنەو گەڕانی بەردەوام بە شوێن ئاسۆکانی پرسیاردا، بۆیە رەخنە لای ئەوان ئامرازێکی بەرپەرچدانەوەی هەموو جۆرە جەمسەرگیریەکەو، لە رێگای رەخنەوە لە چالاکی فیکری بەردەوامدان، بۆ ئەوەی خۆیان بگلێننە هەر جۆر ئینتیمایەکی سیاسی راستەوخۆ، یان هەر جۆرە فەرمانێك قبووڵ بکەن کە چالاکیە فیکریەکانیان لە قالب بداو، پرسیارەکانیان لە ئاستێکدا ڕاگرێ، لێرەوە بیرکردنەوەی ئەقڵانی دوور لە هەر جۆرە فەلسەفەیەکی شوناس و وردبوونەوەی میتافیزیکی، بایەخێکی تایبەتی لای بیریارانی تیۆری رەخنەیی هەیە، کە بڕوایان وایە دەبێ لە رێگای رەهەندە رەخنەییەکانی ئەقڵەوە حوکم بەسەر واقیعدا بدرێ، بۆ ئەوەی عەقڵ وەك نمونەیەکی باڵاو دابڕاو لە مێژوو تەماشای بکرێ. "ئەوەی بەلای تیۆری رەخنەییەوە گەوهەریە ئەو روانینە رەخنەئامێزەیەتی بەرامبەر هەر شێوازێکی دابڕاو و سنووردار بۆ تێگەیشتن لە خودی تیۆرەکە، یان شێوازێك کە چەمکێکی تەسکی بۆ ئەقڵانیەت هەبێو، ئەرکێکی داخراو و ئایدیۆلۆجیایەکی ئەوتۆی هەبێ رێ لە ئازادی مرۆیی بگرێ، چەمکی تیۆری رەخنەیی چەمکێکی ناتەواوە گەر جیاوازی لە نێوان رەخنەو تیۆردا نەکا"[(7)].

بەڵام ئایا ئەم شێوازە تایبەتەی بیریارانی تیۆری رەخنەیی چیە؟ بۆچی مل بۆ هیچ لایەنگیریەکی سیاسی نادەن، لە کاتێکدا رەخنەیان کردۆتە ئاراستەیەکی گەوهەری ئەندێشەکەیان؟

لە لایەکی ترەوە، رەنگە فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی، بەتایبەتی هۆرکایمەرو، ئادۆرنۆو، مارکیوز لە رێگەی رەخنەوە بیریان لە مەسەلەی گۆڕان کردبێتەوە، گۆڕانێك نا کە وەك مارکسیزم دەڵێ لە ململانێی چینایەتیەوە سەرچاوە دەگرێ، بەڵکو زادەی ئەندێشەی خودی مرۆڤایەتیەو پشت ئەستوورە بە فۆرمێکی تازەی تیۆری سۆسیۆلۆژی. هەربۆیە بیریارانی تیۆری رەخنەیی بڕوایان وایە بەیەکداچوونی پسپۆڕیە جیاجیاکان مەرجێکی پێویستی روانینی فەلسەفیە، بۆ ئەوەی فەلسەفە پرسیارەکانی خۆی دابڕێژێ دەبێ بۆچوونی ئابووری ناس و

مێژوونووس و دەروونناسەکان و خاوەن پسپۆڕییەکانی تر لە پرسیارەکانیدا کۆبکاتەوە. هەر ئەمەش بوو هانیدان چەندین بایەخی جیاوازیان هەبێ‌و، چەندین بابەتی جۆراوجۆر لە چەندین کایەی پسپۆڕی جیاوازدا پێکەوە گرێ بدەن. رەخنە لە دەسەڵات و خێزان، رەخنە لە چەمکی ئازادی بۆرژوازی، رەخنە لەفاشیزم، ئاشکراکردنی میکانیزمی کۆنترۆڵ لە کەلتوورداو، رەخنە لە دەوڵەتی مۆدێرن و دەزگا سیاسیە تۆتالیتاریەکان.. هتد.. هەروەها خوێندنەوەی رەخنەیی ناوەرۆکی مێژووی فەلسەفی، بەتایبەتی فەلسەفەی ئەڵمانی‌و، شیتەڵکردنی پێکهاتەکانی هەستیاری ئیستاتیکی‌و.. هتد.. ئەمانە هەمووی وای لە فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی کرد بگەنە چەندین ئەنجامگیریی لەچەندین کایەی مەعریفی جیاوازدا. کەواتە چۆن مامەڵەیان لەگەڵ فەلسەفەدا کردووە؟ چۆن بایەخی فەلسەفەیان لە سەردەمی ئێستادا هەڵسەنگاندووە؟ چۆن روانیویانەتە ئەقڵ و رەخنەو رۆشنگەری؟ چۆن روانیویانەتە کارلێکی نێوان تاکەکەس و ئەو کەلتوورەی زادەی مۆدێرنەیە؟ مامەڵەی تاکەکەسیان لە چ ئاستێکدا بینیوە لەگەڵ دەوڵەتێکدا کە بەرجەستەکەری ئەقڵانیەتە؟

### *2- فەلسەفەو رەخنە:*

ئایا فەلسەفە جۆرێکە لە مەعریفە؟ ئەگەر وابێ سروشتی ئەو مەعریفەیە چۆنە؟ ئایا دەکرێ توێژینەوەیەکی ورد سەبارەت بە جیاوازی نێوان مەعریفەی فەلسەفی‌و مەعریفەی زانستی پێشکەش بکەین؟ ئایا چ جۆرە پەیوەندیەك لەنێوان ئەندێشەی فەلسەفی‌و زانستە ئەزموونگەریەکاندا هەیە؟

چەندین پرسیاری لەم جۆرە رووبەڕووی فەلسەفە دەبێتەوە، بە تایبەتی لەو رۆژەوەی کە زانستە ئەزموونگەریی‌و مرۆییەکان لە ئەندێشەی فەلسەفی جیابوونەتەوە، فەلسەفە رووبەڕووی چەندین جۆر لێپرسینەوە بۆتەوە لەلایەن زانستە ئەزموونگەری و مرۆییەکان و ئاین و سیاسەتەوە. چونکە سروشتی چەمکە ئەبستراکتەکانی فەلسەفە و پیاچوونەوەی بەردەوامی بەو شتانەدا کە هەن و مەئلوفن و ئارەزووی بەردەوامی بۆ پرسیار.. چەندین گومانی لای‌ئەو سیستمی تێگەیشتن و دەسەڵاتە رەمزیەی مەعریفە وروژاندووە کە پرسیارەکانی فەلسەفە ماندووی کردووە، بەتایبەتی ئەو کاتەی کە مەعریفەی دەسەڵات یان دەسەڵاتی مەعریفە پێویستی بە شێوەیەك لە سیستم و دیسپلین، یان شێوەیەك لە هەماهەنگی‌و رێکەوتن هەیە.

یەکێك لەو گرفتانەی رووبەڕووی فەلسەفە دەبێتەوە ئەوەیە کە تا ئێستا فەلسەفە بابەتێکی دیاریکراوی نیە، لە کاتێکدا تەواوی زانستە ئەزموونگەری‌و مرۆییەکان، خاوەنی بابەتی تایبەت بە خۆیانن. ئەو قسەیەی کە دەڵێ فەلسەفە پرسیارکردنە لە مرۆڤ و کۆمەڵگاو سروشت و مێژوو، قسەیەکە جێگای سەرنجە.. چونکە لێکۆڵینەوە دەربارەی مرۆڤ کایەیەکی زانستی تایبەتەو، بەهەمان شێوە کۆمەڵگاو سروشت و مێژوو هەریەکەیان کایەی زانستی تایبەت بەخۆیان هەیە. کەواتە ئەرکی فەلسەفە چیە؟ ئایا تەنها پرسیارکردن بەسە بۆ ئەوەی بچێتە پاڵ ئەندێشەیەك و ببێتە ئەندێشەیەکی فەلسەفی؟ یان فەلسەفە مەرجی خۆی هەیە بۆ پرسیارکردن و، پێوەری تایبەت بەخۆی هەیە؟ دواتر ئایا لەم سەردەمەدا فەلسەفە تەنها پەیوەندیدارە بە خودو بابەتی هوشیاریەوە.. یان

بەهۆی کرانەوە مەعریفیەکانەوە ئێستا تەوزیفی چەمك **Concept** و بابەتە ژیانیەکانی جیهان **Mondevecn** دەکا.

ئێمە نامانەوێ بچینە ناو ئەو بابەتە گرفتنامێزەی فەلسەفەوە، کە بە بڕوای هەندێ کەس "فەلسەفە ئاستێکی زۆری بابەتە دەلالیەکانی خۆی لە دەستداوە"(8) و، سەردەمی میتافیزیك بەسەر چووە، ئێستا درەختەکەی دیکارت بووە بە جەنگەڵێك لە زانست کە هێندە بە ئاسانی ناتوانی بیبڕیت و بەناوی فەلسەفەوە شارەزای ڕێگاکانی بیت.. بەڵام ئێمە بە کورتی دەمانەوێ ئاماژە بەوە بدەین کە مەعریفەی زانستی خوازیاری تێگەیشتنی واقعێکی سنووردارەو، پشت ئەستوورە بەو نموونانەی کە پابەندی پێوەری دیارو ئاشکران و مەرجی تایبەت بە خۆیان تێدایە، واتە بابەتە زانستیەکان لە شێوازی جوولەیەکی دیسپلین کراودا خۆیان نمایش دەکەن کە خاوەنی چەمك و بابەتی دیاریکراون لە پێناو دۆزینەوەی حەقیقەتی زیاتری ئەزموونی ژیانی ئێمە.. لێرەوە (مەعریفەی زانستی) ئەو بابەتانە بە بەرجەستەیی نیشان دەدا کەلە ژیاندا هەن و، پشت ئەستوورن بەو کردارو نموونانەی کە دەکرێ لەکاتی پێویستدا لێیان بپرسیتەوەو، بەسەریاندا بچیتەوە.

بەڵام فەلسەفە ئەم بانگەشەیە بۆ خۆی ناکا، چونکە ئەو ناتوانێ پشت ببەستێ بە نموونە بەرچاوەکان بۆ ڕاڤەکردنی حەقیقەتە سنووردارەکان، بەڵام لە توانایدایە مانای ئەو حەقیقەتانە لە سیستمێکی گشتیدا ڕێك بخا، یان ئاستە پەرت و سنووردارەکان پێکەوە گرێ بداو، لە ئاستێکی مەعریفی ڕێکوپێکدا کۆیان بکاتەوە. فەلسەفە زانست نیە چونکە بابەتێکی دیاریکراوی نیە. هەروەکو (هیگل)یش دەڵێ لەبەرئەوەی فەلسەفە کوڕی زەمانی خۆیەتی... هەوڵدەدا وردەکاریی چرکەکەی کۆبکاتەوە بە هەمان ئەو ئەندازەیەی کە پەیوەستە بە دەقەکانەوە، بۆیە ئەوەی فەلسەفە لە کایەکانی تر جیادەکاتەوە جۆری پرسیارکردنەکەیەتی، توانای داهێنانی چەمکەکانە، یان بەلانی کەمەوە توانای بەکارهێنانی داهێنەرانەی ئەو چەمکانەیە.

فەلسەفە زانستە پایەدارو دادگا باڵاکەی جاران نیە، نە دەزگایەك پێکدێنێو نە سیستمێکی یاسادانان، چونکە مەعریفە لە دەرەوەی جوغزی ئەو دەخەملێو، ئێستا فەلسەفە تەنها کردەیەکی ئەقڵیە کە دەگەڕێو رەخنەدەگرێو داخرانی دەقە فەلسەفیەکان دەکاتەوە. بۆیە چالاکی فەلسەفە بریتیە لە وردبوونەوە.. ئەم چالاکیەش، تەنانەت لە ئاستی پۆزەتیڤگەریشدا، دەگەڕێتەوە بۆ (خود)ێك بیردەکاتەوە، بەرەو تێگەیشتن لە خود وەك ئاستێکی پەتیو دامەزرێنەرو پایەخواز. بەمجۆرە مەعریفە دەتوانێ بیر لەخۆی بکاتەوەو، دواتریش مەعریفەکان یەکبگرن و مانایان هەبێ"(9).

فەلسەفە توانای پرسیارکردنی هەیە بەرامبەر پێکهاتەکانی فیکرو، لۆژیکی مێژوو و جومگەکانی دەسەڵات، کەڵك لە ئەنجامی زانستە ئەزموونگەریو مرۆییەکان وەردەگرێو دەکەوێتە کارلێکەوە لە گەڵیاندا، فەلسەفە پێویستی بە بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی جۆرێك لە هارمۆنیو هێلگەری هەیە بۆ سەلماندنی تێزەکانی.. بۆیە ناتوانێ هیچ دەقێکی گشتگیر بەرهەم بێنێ گەر نەچێتە نێو داخرانێکی هێلگەرییەوە.. هەر فەلسەفەیەك مل نەدا بۆ ئەم شێوازی ئیشکردنەو، تواناکانی بەکارنەهێنێ بۆ لە خۆگرتن و ئیحتوا، ئەوا دەبێتە فەلسەفەیەکی هەمەئاست و، رەخنە

و نێگەتیڤ دەکاتە ئاسۆیەکی گەوهەری تێفکرین و، دەقێکی هەمەلایەن و هەمە بابەت بەرهەم دێنێ کە لەسەر تەنها حەقیقەتێك و مەرجەعێکی رەها ناگیرسێتەوە.

ماکس هۆرکایمەر دەڵێ: "مامۆستای فەلسەفەمان فێری کردووین.. مرۆڤ بۆ ئەوەی ببێتە فەیلەسووف پێویستە شارەزایی لە زانستە سروشتیەکاندا هەبێو، شتێك لە هونەرو مۆسیقاو دانان بزانێ"، بەڵام هۆرکایمەر بڕوای وایە ناکرێ پێناسەیەك بۆ فەلسەفە دابنێین، چونکە "پێناسەی فەلسەفە لەگەڵ هەر نمایشێکی دیارو ئاشکرای فەلسەفە تەریب دەردەچێ"[11]، هەر بۆیە فەلسەفە ئامرازێك یا پلان دانانێکی ئەندازەیی نیە، هێندەی هۆکارێکە بۆ دەستنیشان کردنی ئەو هێڵی بەرەو پێشچوونەی کە پێداویستیە لۆژیکیو واقعیەکان دەیکێشن. دواتر "ڕێگایەك لە بەردەماندا نیە بۆ پێناسەکردن"[12]، چونکە فەلسەفە بریتیە لە خستنەگەڕی توانایەکی هوشیار بۆ ڕێکخستنی تەواوی زانیاریو ئەندێشەکانمان لە ستراکچەرێکی زمانەوانیدا، لە ڕێگایەوە -وەك هۆرکایمەر دەڵێ- شتەکان وەکو حەقیقەتی خۆیان ناودەنێین، لێرەوە دەبێ رەخنە لە میتافیزیك بگرین، چونکە میتافیزیك ئیدعای ئەوە دەکا کە لە توانایدا هەیە لە بوون و ئەندێشە بگا لە کایەیەکی گشتگیرداو، دەتوانێ دوور لە ئینسان مانایەك بۆ جیهان بدۆزێتەوە، لە کاتێکدا هۆرکایمەر بڕوای وایە "دروستکردنی هەر پلیکانەیەکی ناوەکیی دوور لە رەوتی مێژوو لە لایەن هەر مەزەبێکەوە بێ.. هیچ نیە، جگە لە داخران بەڕووی جیهانداو پێکەوە گونجانێکی ساختە"[13].

فەلسەفە بەو ئەندازەیەی پێویستی بەوە هەیە لە زانستەکانی تر هەڵگرێو کەڵك لە دەربڕینە ئیستاتیکیە جۆراوجۆرەکان وەرگرێ، بەهەمان ئەندازە دەبێ رەخنە لە هەر ئاراستەیەکی میتافیزیکی بگرێ کە فیکر لە رەوتی خۆی دادەبڕێو، بوونەوەر لە جیهانی خۆی دادەماڵێ. رەخنە لە میتافیزیك تەنها ئەرکی فەلسەفە نیە، چونکە "زانست خۆی رەخنەگرتنە لە میتافیزیك"[14] تەنانەت هێربرت مارکیوز تا ئەو شوێنە دەڕوا کە بڕوای وایە "چالاکی فەلسەفی ئەو چالاکیە مرۆییەیە کە فەلسەفە لە هەناویدا دەخولقێ.. چونکە چالاکی فەلسەفی، بەمانا راستەقینەکەی، جۆرێکە لە بوونی مرۆیی، چونکە بوون لە هەموو ئاستەکانیدا دەخرێتە نێو گۆشەی پرسیارکردنەوە بەرامبەر خودی بوون"[15].. هەر بۆیە فەلسەفە تەنها چەند وێناکردنێکی خەیاڵیو وەهمیی نیە، بەڵکو "هێزێکی مێژوویی راستەقینەیە"[16]، مۆرکە (ئایدیۆلۆجی)یەکەی فەلسەفەش ئەو مانایە رەت ناکاتەوە کە دەیکاتە فاکتەرێکی مێژوویی، چونکە فەلسەفە "دەربڕینی هەڵوێستێکی بنەڕەتیە بەرامبەر بوون و بوونەوەر، کە تیایدا ئاستێکی مێژوویی و کۆمەلایەتی بە ئاشکرایی تەعبیر لەخۆی دەکا، تەعبیرێکی قووڵ وەك لە بوارەکانی ژیانی عەمەلیدا بەرجەستە دەبێ.."[17].

بەگژاچوونەوەی میتافیزیك، گرێدانی چالاکیی مرۆیی بە فەلسەفەوە، بەشداریکردن لە بزاوتی مێژوویيداو، هەڵوێست وەرگرتنێکی رەخنەئامێز بەرامبەر جیهان. هانی بیریارانی تیۆری رەخنەییدا کە روانین گرێبدەن بە کارەوەو، فیکر بە مێژووەوە. رەنگە هەوێنی ئەم هەڵوێستە فیکریەیان لە مارکسیزمەوە وەرگرتبێ بە تایبەتی ئەو تێزەی کە بڕوای وایە دوای ئەوەی کۆمەڵگای سەرمایەداری لە پەیوەندیە چینایەتیەکانیەوە

دەچێتە دۆخێکی بێ چین... ئیتر فەلسەفە لە مێژوودا بەرجەستە دەبێ. بەڵام نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە بیریارانی تیۆری رەخنەیی بڕوایان وایە ئەو گۆڕانکاریی و دژبوونانەی کۆمەڵگا کە مۆدێرنەو پێوەرە ئەقڵانییەکان دایان مەزراندوون لەگەڵ توێژینەوەکانی مارکس و پێشبینییەکانیدا یەك نایەنەوە[18].. تیۆری رەخنەیی هەرچەندە لە سەرەتادا چەند توخمێکی هەڵسەنگاندنی مارکسیزمی وەرگرت، بەڵام دواتر لە مارکسیزم جیابۆوە بەتایبەتی دوای ئەوەی هەندێ لە پێشەنگانی ئەو تیۆرە بینیان کە مارکسیزم سیستمێکی هێندە تۆتالیتاری هەیە کە ئازادی لە قاڵب دەداو، رەهەندی رەخنەیی ئەندێشە دەخنکێنێ.

هەروەها بیریارانی ئەم تیۆرە، فەلسەفەیان وەك ئاستێکی پەیوەندیدار بە چارەنووسی توێژێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوەوە تەماشا نەکردووە، بەڵکو جەختیان لە سەر رۆڵی تاکەکەس کردووە لە بەجێهێنانی فەلسەفەدا، چونکە خودی تاکەکەسە کە مانا بە فەلسەفە دەبەخشێ، بۆلەوەی دەلالەتی فەلسەفە لە ئاستی تاکەکاندا گیر بخوا، بەو مانایەی فەلسەفە ریشەی لە بوونی هەموو تاکێکدا هەیە، هەموو تاکێکیش بۆی هەیە مانایەك بە فەلسەفە ببەخشێ.

بەو پێیەی رەخنە بنەمایەکی گەوهەریی تیۆری رەخنەییە... خۆبەدوورگرتن لەهەر ئیرادەیەکی گشتگیرو هەر ئاراستەیەکی رەوتگیر ناکارێکی ئەو تیۆرەیە، هەروەها بەو پێیەی رێبازێکی کراوەو دیالیکتیکیو لۆژیکێکی مادیی هەیە.. لە ململانێدایە لەگەڵ ئایدیالیزمی ئەڵمانیدا.. ئیتر بە تەعبیرە (کانت)یەکەی بێت یان مەرجەعیەتە هیگڵیەکەی بێت.

راستە بۆچوونی هەندێ لە بیریارانی تیۆری رەخنەیی بەو ئاراستەیەیە کە هەوڵ دەدا ئاشتبوونەوەیەك لە نێوان فەلسەفەی کانت و ماتریالیزمی دیالیکتیکدا ئەنجام بدا، بە تایبەتی -هەروەکو مارکیۆز دەڵێ- لەسەر ئاستی رەهەندە باڵاخوازەکانی ئەو دوو فەلسەفەیە[19]، بەڵام ئاراستەی گشتی فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی وەك دابڕانێك لەگەڵ کەلەپووری فەلسەفی ئایدیالی ئەڵمانیدا، خۆی نمایش دەکا. هەر بۆیە هەندێك لێکۆڵیار وای بۆ دەچن کە تیۆری رەخنەیی، شێوە دابڕانێکی تیۆری ئەپستمۆلۆژیی لەگەڵ "ستراکچەری باوی زانستدا" هەیەو شێوە دابڕانێکی فەلسەفیشی لەگەڵ "پاشخان و ئامانجەکانی ئایدیالیزمی ئەڵمانیدا" هەیە، وەك ئەوەی ئەم تیۆرە بیەوێ ئەرکی کرانەوە بەسەر هەموو "بوونێکی سەربەخۆدا بگرێتە ئەستۆ، بوونێك لەڕووی تیۆرییەوە تەنها پێویستی بەخۆی هەبێ"[20]. هەمان ئەم رەخنەیە بەسەر ئاراستەی ئەقڵانیدا جێبەجێ دەبێ، ئەو ئاراستەیەی کە هەروەکو هۆرکایمەر دەڵێ پێویستی بە "پەیوەندیەکی پراکتیکی مرۆیی بەردەوام و سەربەخۆ هەیە لە چەمك و واقعدا"[21].

تیۆری رەخنەیی کەلێنێك ناخاتە نێوان سۆسیۆلۆژیاو زانستە کۆمەڵایەتیەکان و فەلسەفە بەگشتی، بەڕادەیەك بڕوای وایە تیۆری کۆمەڵگا لە فەلسەفەوە سەرچاوەی گرتووە. بۆیە دەبینین هەندێکیان بەشێوازێکی سۆسیۆلۆژی فەلسەفە پراکتیك دەکەن و، بە شێوازێکی فەلسەفیش دەربارەی فەلسەفە دەنووسن. واتە لە تیۆرە رەخنەییەکەیاندا سنوورەکانی نێوان فەلسەفەو زانستە مرۆییەکانیان بەزاندووە. ئەم یاخی بوونەش لە سنووری کایە مەعریفیەکان

بەرچـەکردارێکی لای بیریـارە پۆزەتیڤیـەکان ورووژاندووە، بۆیە چەندین نووسینی بیریـارانی تیۆری ڕەخنەییمان بەرچاو دەکەوێ کە چوونەتە گفتوگۆی قووڵەوە لەگەڵ پۆزەتیڤیزمدا، ئەو فەلسەفەیەی کە هۆرکایمەر دەربارەی دەڵێ: "ئەفلاتوون ویستوویەتی فەیلەسووفەکان ببنە سەردار، تەکنۆکراتەکانیش دەیانەوێ ئەندازیارەکان ئەنجومەنی بەڕێوەبەرانی کۆمەڵگا پێک بێنن.. پۆزەتیڤیزم تەکنۆکراتی فەلسەفیە"[22].

ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان پۆزەتیڤیەکان و بیریارانی تیۆری ڕەخنەیی تەنها لە سنووری بوارە مەعریفیەکان و پێگەی زانست لە کۆمەڵگای مۆدێرندا نەوەستاوە.. بەڵکو ڕووبەڕووبوونەوەکە ڕەنگدانەوەی جیاوازیەکی گەوهەری بوو لە هەڵسەنگاندنی واقع و کۆمەڵگاو مۆدێرنەدا، هەروەها ڕەنگدانەوەی ئەو دووریەی نێوان لۆژیکی زانستە کۆمەڵایەتیەکان و توێژینەوە ئەزموونگەریەکان و، هەڵسەنگاندنە دژەکانی فەلسەفە بوو.

بۆ ئەوەی نەچینە وردەکاریی ئەو جیاوازیەی پۆزەتیڤیەکان لە بیریارانی تیۆری ڕەخنەیی جیادەکاتەوە، تەنها ئاماژە بەو وتەیەی تیۆدۆر ئادۆرنۆ دەدەین کە لە پێشەکی کتێبێکدا جەختی لەسەر دەکا، ئەو کتێبەی کە هەموو وتوێژەکانی ئەو کۆڕەی لەخۆگرتووە کە لە کۆتایی شەستەکاندا سازدراو، دیارترین فەیلەسووف و زاناو توێژەرە ئەپستمۆلۆژیەکانی ئەڵمانیا بەشداریان تێداکرد، لە نێویاندا: کارل پۆپەرو، هانس ئەلبێر کە نوێنەرایەتی پۆزەتیڤیزمیان دەکرد. لەو کۆڕەدا، ئادۆرنۆ نووسیویەتی: ئەوەی یەکلایی کەرەوە بێت، لە پەیوەندیی ڕاستەوخۆدا لەگەڵ پراکتیکدا دەرناکەوێ، بەڵکو لەو پێگەیەدا دەردەکەوێ کە لە ژیانی فیکریی و واقیعدا بە زانستی دەبەخشین. هەر جیاوازیەک سەبارەت بەم خاڵە پەیوەندی بە وێنای زانستەوە نیە، چونکە ئەم جۆرە جیاوازیانە پێگەی خۆیان هەیە بەرامبەر پرسیارە لۆژیکیی و ئەپستمۆلۆژیەکان، هەروەها لە تێگەیشتنی دژبوون و دژنەبوون، گەوهەر و دەرکەوت، سەرنج و ڕاڤەکردن. دیالیکتیك بەسەرسەختیەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا دەکا، چونکە بڕوای وایە دەبێ بیر لەو شتانەش بکەینەوە کە نەیاریان نیە، واتە بیرکردنەوە بەرامبەر دەسەڵاتی پیشەسازیی زانست کە مل نادا بۆ پرسیار[23].

پرسیاری فەلسەفە لای بیریارانی تیۆری ڕەخنەیی جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ پرسیاری زانستە مرۆییەکانی دیکەدا نیە، چونکە فەلسەفەکەیان فەلسەفەیەکی ڕەخنەییە، و هەوڵدەدا تیۆرەکان لە کۆمەڵگادا دابڕێژێ و، لە کارلێکدایە لەگەڵ دەسکەوتی زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا، بێ ئەوەی تەسلیمی تەواوی ئەنجامەکانیان ببێ. تیۆری ڕەخنەیی گومانی لە ڕاستگۆیی ئەو سۆسیۆلۆژیا دەسەڵاتدارە هەیەو، بڕوای وایە دەستەوسانە لە پێشکەشکردنی وێنایەکی گشتگیر... وێنایەک کەلە شیتەڵە ئەزموونگەریەو لۆژیکیەکان و ئەنجامگیریەکان دەربازی بووبێ.

ئادۆرنۆ بڕوای وایە ناکرێ لە کۆمەڵگا بەگشتی تێبگەین، ئەگەر لە دژە ڕەهاکەی کۆمەڵگا نەگەین کە بریتیە لە تاک، لە بەرامبەریشدا تاك لە ڕێگای ئەو ئاستە گشتگیرەوە دەستنیشان دەکرێ کە ڕۆدەچێتە ناخیەوە. دواتر فەلسەفەیەک کە ئاراستەیەکی پۆزەتیڤیزمی هەبێت ناتوانێ لە توخمەکانی پەشێوی نێوان تاك و کۆمەڵی سەردەمی مۆدێرنە بگا.. تەنها

فەلسەفەیەکی نێگەتیڤ Negative دەتوانێ ئەو ئەرکە ئەنجام بدا، فەلسەفەیەك کە زادەی شکستی کەلتووری مۆدێرن و، گلۆربوونەوەی ئەقڵە بەرەو بەربەریەتێکی نوێ.

تیۆری رەخنەیی لە درێژەی پرسیارو شێوازی دادگایی کردنەکانیدا بۆ پۆزەتیڤیزم و ئەنجامەکانی مۆدێرنە، بە بەردەوامی وتوێژی لەگەڵ ناوەرۆکی فەلسەفەی ئەڵمانیدا کردووە، بەڵام لەنێو فەیلەسووفەکاندا کانت و هیگڵ زۆرترین رەخنەی بیریارانی ئەو تیۆرەیان ئاراستە کراوە. هەرچەندە لە توێژینەوەکانیاندا باسیان لە فەیلەسووفەکانی تریش کردووە، بەڵام رەوتی فەلسەفی کانت و هیگڵ فراوانترین ئاسۆی ئەندێشەو بیرکردنەوەی لە بەردەمیاندا کردۆتەوە. ئەو قسەیەی کە باس لە تێپەڕاندنی فەلسەفە دەکا -جا بە دارشتنە هیگڵیەکەی بێ یان مارکسیەکەی- هەموو بەهایەکی لە دەستداوە، چونکە "چرکەی جێبەجێبوونی ونبووە"[24]، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ئادۆرنۆ بڕوای وایە کاتێ فەلسەفە نەیتوانی پابەندبێ بەو پەیمانەوە کە دابووی سەبارەت بە گۆڕینی جیهان و ئاوێتەبوون لەگەڵ واقعدا، ناچارە "بەبێ هیچ نەرمی نیشاندانێك رەخنە لەخۆی بگرێ"[25]، بەڵکو دەبێ لە میانەی بیرکردنەوەی لەخودی خۆی بپرسێ: چ رێوشوێنێك بگرێتە بەر بۆ ئەوەی بەزیندوویی بمێنێتەوە، دوای ئەوەی لەسەر دەستی فەلسەفەی هیگڵی تووشی نوشست هات".

رەنگە هەمان مەسەلە (کانت)یش بگرێتەوە کاتێ رەخنەی لە ئەقڵانیەت گرت و، دەربارەی ئەگەری دامەزراندنی میتافیزك پرسیاری کرد. گەر دیالیکتیکی هیگڵیی هەوڵێك بوو بێت بۆ گۆڕینی چەمکە فەلسەفیەکان و، سەلماندنی ئاستێکی باڵای ناکۆکیەکانیان.. ئەوا دەبێ جەخت بکرێتەوە لەسەر هێشتنەوەی پەیوەندیی لەگەڵ دیالیکتیکدا، ئەو دیالیکتیکەی "کە دەبێ بنیات بنرێ دوای ئەوەی هەوڵی دامەزراندنی ئەو پەیوندیە نوشستی هێنا"[26]. بە بڕوای ئادۆرنۆ ئازادیی فەلسەفە لە پرۆسەی بیرکردنەوەیدا شتێك نیە جگە لە توانا شکاندنی بەسەر تەعبیرکردن لە دژە ئازادیی خۆی، چونکە گەر ئەو چرکەی دەربڕینە خۆی وەك شتێکی زیادە نمایش کا ئەوا دەبێتە جیهانبینی. "کاتێ فەلسەفە پاشگەز دەبێتەوە لە دەربڕین و ئەرکی نمایشکردن، ئەوا لەلایەن زانستەوە دەبرێ بۆخۆی"[27]، چونکە ئەوەی بیری لێدەکرێتەوە نابێتە ئامانج گەر لە شێوازی دەربڕین و زماندا خۆی نمایش نەکا، ئەو شتەیشی کە بە کەمتەرخەمیی قسەی لێوە دەکرێ، بەشێوەیەکی خراپ بیری لێدەکرێتەوە، چونکە تەنها بە دەربڕین "شتەکان بەوردیی دەوترێن"[28].

کرداری بیرکردنەوە Lepenser، لە دۆخە سەرەتاییەکەیداو، پێش ئەوەی ناوەرۆکێکی تایبەت وەرگرێ، خۆی لە خۆیدا بەرپەرچدانەوەی هەر جۆرە خۆسەپاندنێکە، بەتایبەتی لە سەردەمێکدا کە ئایدیۆلۆجیا فیکر بە ئاراستەیەکدا دەبا کە پابەند بێ بە پێوەرە پۆزەتیڤیەکانەوە.. لە کاتێکدا بە بڕوای ئادۆرنۆ شێوازەکانی بیرکردنەوە بەزاندنی توخمەکانی هەنووکەو، دەرەنجامەکانیەتی.

فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی، جگە لەوەی بەشێوەیەکی مەبدەئی نەیاری هەموو رەوتێکی پۆزەتیڤیزمین.. لە هەمان کاتدا کێشە فەلسەفیەکانیان، بە تایبەتی لای ئادۆرنۆ، لە نێوان هەردوو هێڵی فەلسەفیی کانت و هیگڵدا لە هاتوچۆدایە.. هەرچەندە کەوتوونەتە وتووێژەوە

لەگەڵ هەموو فەیلەسووفەکانی ئەڵمانیا، بەڵام کانت و هێگڵ خاوەنی گرنگترین دەقی فەلسەفین، کە تیۆری رەخنەیی لە رێگایەوە رەخنەی ئەزموون و پراکتیزە کردووە. راستە مارکسیزم وەك بابەتێکی سەرەکیی بیرکردنەوەی رەخنەیی لای بیریارانی تیۆری رەخنەیی سەری هەڵدا.. یا ئەوانەی کە ئادۆرنۆ، بە گاڵتەپێکردنەوە، بە فەرمانبەرانی ماتریایزمی دیالیکتیك Les fonctionnaires du diamat ناویان دەبا، جگە لەوان رەخنە لە نوێنەرانی ئاراستەی بوونخوازی دەگرێ، بۆ ئەوەی گورێکی تازە بدا بە ئەندێشەی فەلسەفی وەك رەتکردنەوەی چەمك و رەوت و زەمەن و ئەقڵو مۆدێرنە، بەرەو دارشتنی بیرۆکەی دیالیکتیکی نێگەتیڤ کە رەخنەگرتنێکی زاتیو ریشەییە لە ئەقڵانیەت.

ئادۆرنۆ ئارەزوویەکی زۆری هەیە بۆ ئەوەی رەوتێك لەبەر یەك هەڵوەشێنێ کە پێش ئەوەی توخمە دیالیکتیکیەکانی بخەملێ بەسەر خۆیدا دابخرێتەوە، بۆیە بە بروای ئەو پێویستە "ئەو وەهمی خودگەریە تێکبشکێ کە پشت ئەستوور بەهێزی خود دامەزراوە"[29]. بواری وەگەرخستنی وزەی رەخنەیی لە خودی رەوتەکەدایە، لە نێوان خودی باڵاخوازو ئەو خودگەریەدا کە شانازی بە بابەتیبوونی خۆیەوە دەکا.

تیۆری رەخنەیی لە بۆچوونێکی سەرەکیەوە، سەرچاوە دەگرێ، کە پێی وایە تیۆرێك بتوانێ ئیدعای خاوەندارێتی حەقیقەت بکا، هەمان بۆچوون بەسەر خۆیشیدا جێبەجێ دەکاو، بروا وایە دەربازبوون لە هەر جۆرە داخرانێك پێویستی بە خستنەوەگەری تیۆری دیالیکتیکی کۆمەڵگا هەیە، بەڵام دەبێ ئەو تیۆرە خۆی لە هەر هەڵوێستێکی غرورئامێزی ئەزۆك بەدوور بگرێ بۆ ئەوەی فەلسەفە بتوانێ گورو تین بدا بە ئازادی تا ئەو شوێنەی ئومێد بردەکا.

لە گۆشەنیگای تیۆری رەخنەییەوە یەکەمین ئەرکی فەلسەفە گەرانە بەدوای ئازادیدا، لێرەوە بیریارانی ئەو تیۆرە هەوڵیاندا ئەرکێکی تری فەلسەفەو ئاستێکی تری رەهەندەکانی پراکتیك بکەن و، لە دوو دەزگای دابماڵن کە هەمیشە هەوڵی مل پێکەچکردنی فەلسەفە دەدا، ئەو دوو دەزگایەش: دەوڵەت و حزبە. ئەم خەونی سەربەخۆییە فەلسەفەی (شۆبنهاوەرو نیچە)مان دێنێتەوە یادو، لەم ئاستەدا لەسەر هەمان رێرەوی ئەوان دەرۆن، چونکە فەیلەسووفە گەورەکانی سەدەی بیستەم، وەك لۆکاچ و هایدگەر، تەسلیمی ئیرادەی دەوڵەت بوون.. هەر بۆیە فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی بریاریان دا "پەیمانگایەکی توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکان" بە بودجەیەکی تایبەت پێکبێنن، بۆ ئەوەی لەوە بگەن کە بوونێکی سەربەخۆ لە دەرەوەی هەموو ئیرادەیەکی گشتگیرەوە هەیە، جا ئیرادەی دەوڵەت بێ یان حزب، بەتایبەتی حزب کە هەموو تیۆرەیەك لە چەند دەزگایەکی بیروکراسیدا لە قالب دەداو، هەموو جۆرە پرسیارو هەستێکی رەخنەیی رەتدەکاتەوە.. هۆکاری ئەم نەیاریەی دەسەڵات لە لایەن بیریارانی تیۆری رەخنەییەوە لەو بروایەوە سەرچاوەی گرتووە کە قبولّ کردنی هەر فۆرمێکی سیاسەت و دەسەڵات، جگە لە فۆرمێکی دەسەڵاتئامێزی فیکر هیچ شتێکی تری لێ سەوز نابێ.

بۆیە هەر فەیلەسووفێك، لەو فەیلەسووفانەی پەیوەندیان لەگەڵ تیۆری رەخنەییدا هەیە، فەلسەفەی بە شێوازێکی تایبەت و پشتئەستوور بە سەرچاوە فیکریو فەلسەفیەکانی خۆی

پراکتیك کردووه، بەلام دواجار هەموویان لەیەك بۆچووندا بەیەك دەگەن ئەویش بریتیە لەوەی فەلسەفە کایەیەکە بۆ بیرکردنەوە بەشێوەیەکی نێگەتیڤانەو، بۆ پراکتیزەکردنی دژە دەسەلات کە دەستەبەری توانەوەو بەیەکداچوونی خواستی مەعریفەو خواستی ئازادیە.

لە فەلسەفەی (هیگڵ)یشدا ئازادیو دەولەت شوناس دەگۆڕنەوە، بەلام فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی بە هەموو جۆرێ دژی ئەوەن دەولەت فیکر لە خۆبگرێ، هەروەها دژی ئەو پرسیارە فەلسەفیەی (هیگڵ)ن سەبارەت بە یەکانگیربوونی دوورخایەنی فەلسەفەو دەولەت... هەر بۆیە بڕوایان وایە کە چالاکیی فەلسەفیی لە شکستی فەلسەفەی هیگڵەوە شەرعیەت وەردەگرێ، واتە ئەم تیۆرە "رەخنە لە دیالیکتیکی هیگڵیو دیالیکتیکی مارکسی دەگرێو، وەك دوو شێوازی دیالیکتیکی پۆزەتیڤ تەماشایان دەکا، هەروەها بە بەراورد لەگەڵ فەلسەفەی باودا هەولدەدا پرۆسەی وەرچەرخانێکی راستەقینە بێنێتە ئاراوە کە ئیتر دیالیکتیك بەرهەمهێنی تێزی پۆزەتیڤ نەبێو، پەیوەندیی بە دژە هاوتاکانیەوە هەبێ، بۆ ئەوەی تێزی نێگەتیڤیش جەخت کردنێکی تازەو، دۆخێکی تازەی لێنەکەوێتەوە"[30].

ئامانجی فەلسەفە لای بیریارانی تیۆری رەخنەیی داگیرکردنی وردەکاریەکانی شوناس نیەو، خۆی لە فەلسەفەی خودو هوشیاریی بەدوور دەگرێو، ناخوازێ رەوتێکی تایبەت دامەزرێنێ، بۆیە هەولیان دا هەردوو رەوتی کانت و هیگڵ لە بنەوە هەلتەکێنن.. هەروەها ئەم فەلسەفەیە پەنا بۆ دەسەلات نابا، چونکە دەسەلات ئازادی لە فیکر دەسێنێتەوەو خۆی لە رەخنە دەدزێتەوە. هەروەها دەسەلات نایەوێ لەگەڵ واقعدا ئاشتبێتەوە، چونکە ئاراستەی پۆزەتیڤیزم کە پەنا بۆ هەموو جۆرە دەسەلاتخوازیەك دەبا لە واقعەوە سەرچاوە دەگرێو، بەهۆی ئەویشەوە مەبەستەکانی جێبەجێ دەکا. فەلسەفە بیرکردنەوەیەکی نێگەتیڤانەیە شەرعیەت لە هەنووکەی پرسیارو، شکستی دیالەکتیك -بەمانا هیگڵیو مارکسیەکەی- وەردەگرێ... سوودێکی زۆر لە زانستە کۆمەلایەتیەکان وەردەگرێ بۆ داڕشتنی دەقێکی هەمەلایەن و گشتی، خەبات بۆ ئازادی دەکا بە رەهەندە جەستەییو سیاسیو کۆمەلایەتیو فیکریەکانیەوە، ئازادیەك تاك پراکتیکی بکاو، پشت ببەستێ بە ئەقلێك هەمیشە بە پێکهاتەکانی خۆیدا بچێتەوەو، هەمیشە رەخنە لە ئەقلانیەت و مۆدێرنەیی خۆی بگرێت.

### 3-دیالیکتیکی ئەقلانیەت: رەخنە لە ئەقلی رۆشنگەری:

*"کاری ئێمە پەیوەندی بە -رەخنە لە فەلسەفە- وە هەیە، هەر لەبەر ئەو رەخنەیەشە نامانەوێ قوربانی بە فەلسەفە بدەین"*[31]، ئەمە یەکێکە لە راگەیاندنەکانی بیریارانی تیۆری رەخنەیی. یەکێك لە ماناکانی رەخنە لە فەلسەفە لای ئەوان ئەوە دەگەیەنێ کە خۆیان بەدوور بگرن لە هەر ئیرادەیەکی گشتگیرو هەر ئاراستەیەك کە عەقڵ دەکاتە تەنها کۆلەکەی خۆی، هەروەها رەخنەگرتن لەو ئاراستە پۆزەتیڤیزمە کە تەنها مامەلە لەگەڵ پێشهاتە واقعیەکاندا دەکا.. هەریەك لە هۆرکایمەرو ئادۆرنۆو ماركیوز، لە لێکۆلینەوە جیاوازەکانیاندا، فەلسەفەی (هیگڵ)یان کردووە

به تەوەری رەخنەگرتن لە فەلسەفە. هەرچەندە لەو رەخنەگرتنانەدا دەگەڕێنەوە بۆ کانت و زۆر باس لەو ئاکامانە ناکەن کە مارکسیزم پێی گەیشتووە، بەڵام هێزی رەخنەگرتنیان لەو ئاستەدا لە بەتاڵکردنەوەی ئەو قسەیەی هیگڵەوە سەرچاوە دەگرێ کە دەڵێ: مەعریفە بریتیە لە خودناسین بۆ خودێکی بێکۆتایی، یان ئەو بۆچوونەی کە پێی وایە شوناسێك لە نێوان خودو بابەتدا هەیە لەسەر ئەولەویەتی خودی رەها دامەزراوە.. بەڵام ئەوان بڕوایان وایە کە بیرکردنەوەیەك نیە هێندە رەهابێ، بەڵکو هەموو بیرکردنەوەیەك تایبەتمەندەو، هی چەند مرۆڤێکی دیاریکراوە لەکات و شوێنێکی دیاریکراودا و پابەندی چەند مەرجێکی کۆمەڵایەتیو ئابوورییە کە هەمیشە لە گۆڕاندایە، هەروەها بڕوایان وایە هیچ بوونەوەرێك نیە رەهابێت، بەڵکو ئەوەی هەیە "بوونێکی هەمەلایەنە".

هەندێ لە توێژەران دەڵێن ئەم هەڵوێستەی بیریارانی تیۆری رەخنەیی ئەو رەخنەیەمان دێنێتەوە یاد کە چەپە هیگڵیەکان ئاراستەی هیگڵی مامۆستای خۆیان کرد، بەتایبەتی کاتێ پێیان لەسەر ئەوە داگرت کە دەبێ فەلسەفەو توێژینەوەی کۆمەڵایەتی پێکەوە کۆبکرێنەوە، ئەوەیان دووپاتکردەوە کە دەبێ فیکرو زەمەن و شتەکان پێکەوە لە روانگەیەکی دیالیکتیکیەوە تەماشابکرێن و، هیچ گۆڕانێکیش لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا بەدینایەت ئەگەر پراکتیزە نەکرێ(32).

هەر بۆیە ئەقڵ لای بیریارانی ئەم تیۆرە "ئەلگەیەکی رەخنەییە" کە وێنای خۆیانی لەسەر دادەمەزرێنن، چونکە نائەقڵانیەتی کۆمەڵگای ئێستا بەهۆی ئەگەری نێگەتیڤی کۆمەڵگایەکی گۆڕاوی ئەقڵانیەوە هەمیشە جێگای پرسیارە.

هەرچەندە ئەوان بەشێوەیەکی مەبدەئی پابەندن بە ئەقڵەوە، بەڵام تەسلیمی بەرهەمەکانی ئەقڵ نابن.. بەڵکو رەخنەگرتن لەو ئەقڵەی دەزگا مۆدێرنەکانی ئابووریو سیاسەت و کۆمەڵناسی و کەلتووری دامەزراندووە، ئاستێکی گەورەیی بۆچوونی ئەوانە بەرامبەر فەلسەفەی مۆدێرن و، دەرکەوتەکانی ئەقڵانیەت و مۆدێرنە؛ هۆرکایمەر دەڵێ:

*"گەر بمانەوێ بڵێین بە رۆشنگەری و پێشکەوتنی کەلتوور.. مرۆڤ لە بۆچوونی خورافی هێزە شەرەنگێزەکان رزگار دەکەین و، لە شەیتانەکان و حیکایەتە یۆتۆپیو قەدەرە کوێرەکان دەیانپارێزین.. بە کورتی گەر بڵێین بەو شێوەیە لە ترس رزگاری دەکەین.. ئەوا دەبێ لە هەمان کاتدا ئیدانەی ئەو شتە بکەین کە بەکۆی دەنگ ناوی نراوە ئەقڵ.. ئەمەش گەورەترین خزمەتە کە ئەقڵ بتوانێ پێشکەشی بکا"*(33).

ئازادکردنی مرۆڤ لە سیحرو، رەخنەگرتن لە ئەقڵ لە رێگەی ئەقڵەوە.. داخوازیەکی رۆشنگەریەکان بوو، چونکە فەلسەفەی رۆشنگەری ئەقڵی کردە ئامرازێکی گەوهەری بۆ پراکتیزەکردنی رەخنەو، بۆ دەربازکردنی مرۆڤی ئەورووپی لەو دۆخە نێگەتیڤەی کە تێیدا بوو، هەروەها هانیدا بۆ ئەوەی ئازادی پراکتیزە بکاو، تەعبیر لە دەستپێشخەری ئیرادەی خۆی بۆ مەعریفە بکا.

سەدەی هەژدەیەمی ئەورووپا بە "سەدەی رەخنە" ناسرا(34). ئەو رەخنەیە پەیوەندی بە بزاوتێکی ئاینیو فەلسەفی هەمەلایەنەوە هەبوو

له ئینگلتەراو فەرەنسا دەستی پێکرد لە ڕێگای "تێکشکاندنی ئەو فۆرمە بەدەی مەعریفەی فەلسەفی، کە لە شێوەی ڕەوتێکی میتافیزیکیدا بوو"[35]، هەروەها لە ڕێگای بەرزکردنەوەی دروشمی دژایەتی کردنی لاهوت و خورافە کە بیرکردنەوەو ئەقڵی مرۆڤی ئەورووپی لە قاڵب دابوو، ئەم فەلسەفەیە داوای کرد ئازادی بدرێ بە ئەقڵ و، بە شێوەیەکی گشتی ڕەخنە لە دیاردەو دەزگاو چەمکەکان بگیرێو هەموویان لەژێر سەنگی مەحەکی ئەقڵدا بن... تاوەکو ئەورووپا لە تاریکیو دۆگماو ستەم و ئەفسانە بێتە دەرێ، بەرەو ڕووناکی ئەقڵ و ئازادیو پێشکەوتن.

فەلسەفەی ڕۆشنگەری تەنها بەوەوە نەوەستا باوەڕ بە توانای ئەقڵ بێنێ لە بەزاندنی ئەو سنوورانەی کە میتافیزیك و دەزگای کەنیسە سەپاندبوویان، بە شێوەیەکی ڕەمەکیش ئەرکی ڕەخنەی نەدا بە ئەقڵ. هەروەها "بزاوتی قووڵ و هەوڵی سەرەکی فەلسەفەی ڕۆشنگەری بەوەوە نەوەستا هاوشانی ژیان بڕواو، لە ئاوێنەی بیرکردنەوەوە لێی وردبێتەوە.. بەڵکو بە پێچەوانەوە بڕوای بە ڕەسانەیەتی فیکر هەبوو، فیکرێك کە سنووری ئەرکەکانی دوورە لە ڕاڤەکردن و لێدوان.. ڕۆشنگەری بڕوای وابوو ئەو فیکرە توانای ڕێکخستنی ژیانی هەیە"[36].

مێژووی فەلسەفە ئەوە ئاشکرا دەکا کە فەلسەفەی ڕۆشنگەریی فەرەنسا بەشێوەیەکی بەرفراوان کاریگەری بەسەر ئاراستەی تیۆریی هەندێ لە گەورە فەیلەسووفەکانی ئەڵمانیاوە بەجێهێشتووە. چونکە کانت پرۆژە فەلسەفیو تیۆریەکەی -بە فەلسەفەی ترانسنتالی و فەلسەفەی مێژووشەوە- لە سەر چەمکی ڕەخنە بنیات نا، بەڵام بە بڕوای هیگڵ ڕەخنە فۆرمێکی دیالیکتیکی نێگەتیف دەپۆشێو هەمیشە ئەوە دەبەزێنێ کە هەیە.

کانت دەڵێ "دەبێ هەموو شتێك لە مەحەکی ڕەخنە بدرێ"[37]، یەکەمین تایبەتمەندی کەکانت بە ڕەخنەی دەبەخشێ ئەوەیە کە ڕەخنە لە شێوەی دادگایەکدا وێنادەکا بۆ ڕێکخستنی مەرجە مەعریفیەکان و، لە ڕێگای چەند پێوەرێکی پرۆسە مەعریفیەکانەوە بڕیار لەسەر سنوورەکانی دەدا، دواتریش دەبێتە دەسەڵاتێکی یاسادانەر کە بەرهەمەکانی ئەقڵ لە بەردەمیدا دادگایی دەکرێ، هەندێ جار مافەکانی دەسەلمێنێو، هەندێ جاریش ئیدانەی بانگەشە ماتریالیەکانی دەکا.

کانت گۆڕانێکی بنەڕەتیی لە شێوازەکانی بیرکردنەوەدا ئەنجام دا، کاتێ چەمکی ڕەخنەی پێوە لکاندو، بەوەش "شۆڕشێکی کۆپێرنیکی" لە بواری فەلسەفەدا بەرپاکرد. بەڵام هیگڵ توانی هەموو ئاستە ئیجابیەکانی فەلسەفەی پێش خۆی پێکەوە گرێ بدا.. لە (کانت)ەوە ڕەخنەگەری و بنەمای مەعریفەی وەك چالاکیەکی داهێنەرانە وەرگرت.. لە (فیختە)یشەوە ستراکچەری دیالیکتیك و بایەخی نێگەتیڤگەری لە پرۆسەی بزاوتی مەعریفەدا وەرگرت.. لە (شیلینگ)یشەوە بابەتیبوونی مێژوویی مەعریفەو، ئارەزووی دەستنیشانکردن و، ڕەتکردنەوەی "شت وەك خودێکی تەنها"ی وەرگرت.

ئەقڵ لای هیگڵ فیکرێکی دیالیکتیکییە، واتە "سڕینەوەی ڕەهای جیهانی بڕوای هاوبەش"، ئەرکی سەرەکی مێژوو گەڕانە بەدوای ئەقڵ لەناو ئەقڵدا، چونکە دەوڵەت بەرجەستەبوونێکی باڵای ئەقڵی مرۆییە. تەنانەت هیگڵ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە "دەبێ ئەقڵ حوکمڕانی جیهان بکا چونکە وەك ئەناکساگۆراس و بیریارەکانی ڕۆشنگەریی دوای ئەو دەڵێن: ئەقڵ سەرداری جیهانە.. لەم میانەیەدا هیگڵ ئەم وێنایەی بۆ

ئەقڵ بەستۆتەوە بە شۆڕشی فەرەنساوە کە بە بڕوای ئەو وەرچەرخانێك بوو لە ژیانی فیکریو عەمەلیی مرۆڤدا، لە رەخنە نەگرتن و ملکەچبوونەوە بۆ واقع بەرەو پشت بەستن بە ئەقڵ.

شۆڕشی فەرەنسی، لە دیدی ئەودا، یەکەمین چالاکیی ئەقڵی عەمەلیی بەرجەستەکرد کە لەسەر پێوەرەکانی ئەقڵ و ئازادی دامەزرابوو، هەروەها چەند بەهایەکی نێگەتیڤی بەچەند ناوەرۆکێکی رەخنەییەوە بەرهەم هێنا کە دواجار تەواوی میللەتێکی بەرەو دۆزینەوەی حەقیقەت هان دا. دەوڵەت لای هیگل خەملێنی فیعلی ئازادیو ئەقڵە. یان خەملێنی فەلسەفەیە، یان گەر بمانەوێ رۆح خۆیەتی"[38]، چونکە هیچ چینێك نیە بەرژەوەندیو ئەقڵانیەتی پێکەوە لەخۆی بارکردبێ، بەڵام دەوڵەت نوێنەرایەتی ئەو دیسپلینە هوشیارو ئەقڵانیە دەکا کە هەموو دژە کۆمەڵایەتیەکانی کۆکردۆتەوەو، پێگەیەکی هەیە لە سەروو شەڕی ململانێ تایبەتیەکانەوە.

فیکرێك لە رێگای رەخنەوە بانگەشە بۆ ئازادی بکا چۆن ئەنجامە فەلسەفیەکانی هیگل قبووڵ دەکا؟ ئایا فەلسەفەی سەدەی هەژدەیەم، بەو پێیەی فەلسەفەی رۆشنگەری و ئەقڵانیەت بوو، بەشداری لە ئازادکردنی مرۆڤی خۆرئاواییدا کرد؟ یا بە پێچەوانەوە هۆکاری تازەی بۆ بە کۆیلەکردنی دروست کرد؟

ئێمە سەرنجی ئەوەمان دا کە بیریارانی تیوری رەخنەیی نایانەوێ قوربانی بە فەلسەفە بدەن لە بەردەم هێرشی پۆزەتیڤگەرەکاندا، بەڵکو بڕوایان بەرەخنەگرتن لە فەلسەفەو لێپرسینەوەی چەمکەکانی هەبوو، دەسبەرداری پرسیار نەبوون لە بەردەم رەوتی وەڵامە ئامادەکراوەکاندا، هەر بۆیە رەخنەیان لە پۆزەتیڤیزم گرت و، هەوڵیان دا پێکهاتەکانی رەوتی فەلسەفی، بەتایبەتی هیگلی، لەبەریەك هەڵوەشێننەوە.

بیرکردنەوە لە مەسەلەی ئەقڵ و ئەقڵانیەت لای فەیلەسووفەکانی تیوری رەخنەیی لە تێبینیەکی سەرەکیەوە دەست پێدەکا ئەویش: ئامانجی رۆشنگەری کە بریتی بوو لە ئازادکردنی مرۆڤ، هەڵگەڕایەوە بۆ دژی ئەو ئامانجە، سەرلەنوێ کۆیلایەتی کۆنی مرۆڤی هێنایەوە کایە.. ئەو کۆیلایەتیەی کە پێشتر سەر بە سروشت بوو، بەڵام ئەمڕۆ سەر بە کۆمەڵگایە.. پەیوەندیی هێزەکان هەروەکو خۆیان مانەوە، کە لەسەر مل پێ کەچکردن و جیاوازیو وەلانانی ئازادی دامەزراوە.

ئەنجامەکانی رۆشنگەری لە سەردەمی ئێستادا –هەروەکو هۆرکایمەر دەڵێ– بووەتە هۆی (ئەقڵگیران) کە ئەوە ناونیشانی یەکێك لە کتێبەکانیشیەتی، یان بووەتە هۆی ئەوەی لە بیرکردنەوەی نێگەتیڤانە پاشەکشێ بکا. رۆشنگەری کە ئیدعای دەربازکردنی مرۆڤی دەکرد لە کۆیلایەتی ترس و ئەفسانەو، ئەقڵی وەك ئامرازێکی یەکلاییکەرەوە دەهێنایە ئاراوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ سروشت و مێژوو و پەیوەندیو شتەکاندا.. دواجار تەسلیمی جۆرێکی تر لە ئەفسانە بوو. چونکە شکستی گەورەی بزاوتی رۆشنگەری تەنها لەوەدا نیە کە نەیتوانیوە ئەو مەرجە کۆمەڵایەتیانە بێنێتە ئاراوە کە پەیڤ و شتەکان تەباو یەکانگیر دەکا، بەڵکو لەوەدایە کە بە شێوەیەکی میتۆدیی (نێگەتیڤگەریی) لە زمان و ئەقڵ داماڵیوە.

ئەو دەمەی فیکریش دەسەڵاتی دەربڕینی نێگەتیڤ و رەخنە لە دەستدەدا، ئەوا دەسەوسان دەمێنێتەوە لەبەردەم تەرجەمەکردنی ئیرادەی ئازادکردنی چەوساوەکان

و، ناتوانێ مرۆڤەکان لە فۆرمە جۆراوجۆرەکانی کۆیلایەتی رزگار بکا. لەجیاتی ئەوەی زمان دەلالەتەکان ئاشکرا بکاو توخمە ئێگەتیڤەکان بتەقێنێتەوە، بووەتە تەنها ئامرازێکی هێزە کۆنترۆلکەرەکان، مامەڵەی ئەقڵیش لەگەڵ شتەکاندا وەك "مامەڵەی دیکتاتۆرێکە لەگەڵ خەڵکیدا: ئەو دەیانناسێ کاتێ دەیەوێ یاریان پێبکا"[39].

ئەم تێبینیەی فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەییدا مێژوویەکی رەخنەئامێزی دیالیکتیکی بۆ ئەقڵی رۆشنگەری سازیکەن[40]، چونکە هەموو بەرهەمەکانی ئەقڵ، تیۆری بێت یان فەلسەفی یان عەمەلی، مێژووی خۆی هەیە.. دواتر خودی ئەقڵ مێژوویەکی تایبەتی هەیە کاتێ بەسەر خۆیدا دابەش دەبێ: (ئەقڵێکی بابەتی) کە سیستمی جیهان بە شێوەیەکی مەبەستگەریانە دەستنیشان دەکاو، حەقیقەتێکی تایبەت بە جیهان و مرۆڤ و پەیوەندیەکان دەبەخشێ، دووەمیان (ئەقڵێکی زاتی)یە کە لە رێنیسانسەوە خزمەتی خواستەکانی (خود) دەکا، بەو پێیە تاك هەوڵدەدا پارێزگاری خودی خۆی بکاو، ئەقڵیش مەرجەکانی ئەو خۆپاراستنەو، توانای وەدی هێنانی ئامانجەکانی بۆ دابین دەکا.

بەم شێوەیە لۆژیکی قازانج و لۆژیکی (ئەو شتەی کە دەکرێ بەکاری بێنین) پەرە دەستێنێو، چەمکەکان ناوەرۆکی چڕی خۆیان لەدەست دەدەن و، دەبنە چەند توخمێك لەناو زنجیرەیەك پرۆسەی رەمزیدا. لە ئەنجامدا ئەقڵ رۆڵی خۆی وەك ئامرازێکی مەعریفی لە دەستدەداو، دەبێتە تەنها ئامرازێك کە ملکەچی دۆخی هاوسەنگیو سیستمە. ئیتر ئەقڵ دەخزێتە نێو رەوتی بەرهەمهێنان و فیکریش ملکەچی پێوەرەکانی پیشەسازی دەبێ، واتە تێگەیشتن دەبێتە کارایی‌و، زمانیش دەبێ بە دروشم: "هەموو فیکرێك وەك کردار تەماشای دەکرێو، هەموو بیرکردنەوەیەك وەك تێز، هەموو تێزێکیش دەبێ بە فەرمان"[41]..

فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی ئەم حاڵەتە ناودەنێن "ئەقڵانیەتێکی نائەقڵانی"، کە بە بڕوای ئەوان بە شێوەیەکی سەرەکی هەوڵدەدا مرۆڤ کۆنترۆڵی سروشت بکاو سیستمێکی کۆمەڵایەتیو سیاسی دابمەزرێنێ کە دواجار مرۆڤ دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی. بەم شێوەیە مەعریفە دەبێتە دەسەڵاتێك کە ئەوپەڕی کۆیلایەتی بەسەر بوونەوەردا دەسەپێنێو، هیچ دۆستایەتیەکیش بەرامبەر موڵکدارانی ئامرازەکانی کۆنترۆڵ نیشان نادا. ئەم جۆرە مەعریفەیە خاوەنی گەوهەرێکی تەکنیکیە، مەبەستی نیە چەمك و وێنە بخولقێنێو، خۆشنوودیی لە رێگەی مەعریفەوە دابین بکا، هێندەی مەبەستیەتی گورپدا بەسەرمایەو مرۆڤەکان بخاتە ئیشەوە.

ئەم ئەقڵانیەتە تەکنیکیە لە هەمان کاتدا ئەقلانیەتی کۆنترۆڵە، چونکە "بەهەمان ئەو ئەندازەیەی مەعریفەی تەکنیکی گەشە دەکا.. مرۆڤەکان هەست دەکەن ئاسۆکانی بیرکردنەوەیان بەرتەسك دەبێتەوەو چالاکیو سەربەخۆیی زاتییان وەکو تاك کزدەبێ، هەروەها توانای بەرەنگاربوونەوەی تەکنیکی گەمە بەربڵاوە جەماوەریەکان و، توانای فانتازیاو حوکمی سەربەخۆ لە دەستدەدەن. لەگەڵ بەکارهێنانی هۆکارە تەکنیکیەکان بۆ بڵاوکردنەوەی رۆشنگەری پرۆسەی داماڵینی سیفەتە مرۆییەکانی مرۆڤیش دەستی پێکرد. چونکە پێشکەوتن هەڕەشە لە ئامانجێکی مەبدەئی خودی پێشکەوتن دەکا، کە ئەویش

بیرۆکەی مرۆڤە"[42]، ئەقڵ لەگەڵ رۆشنگەریدا بووە "ئەقڵێکی تۆتالیتاری"[43]، ئەو بە ئەقڵانیکردنەی کە ئێستا لە شارستانیەتی خۆرئاوادا قسەی لێدەکرێو پراکتیزە دەکرێ رۆدەچێتە نێو خودی گەوهەری ئەقڵەوە. ئەمەش کێشەی ئەقڵانیەتی مۆدێرنە.

ئەقڵی رۆشنگەری هەروەکو کانت دەڵێ خوازیاری ئەوەبوو مرۆڤ لەو یاساغانە دەرباز کا کە خۆی بەسەر خۆیدا سەپاندبووی، واتە ئازادکردنی مرۆڤ لە ئەفسانەو مەسەلە غەیبیو خورافیەکان و، هاندانی بۆ ئەوەی بچێتە بواری دەسپێشخەریو کاری ئازاد، لە پێناو کامەرانیو دەستەبەرکردنی ئەو مەرجانەی هاریکاری دەکا بۆ خستنەگەڕی وزەکانیو جێبەجێکردنی ئارەزووەکانی. لەم نێوەندەدا ئەقڵ دەبێ بە ئامرازێکی بەکۆیلەکردنی مرۆڤ و دیسپلین کردنی چالاکیەکانیو، کۆنترۆڵکردنی جەستەی لەرووی سیاسیو کۆمەڵایەتیەوە. ئیتر ئەقڵانیەتی ئەقڵ دەبێ بە (نائەقڵانیەتی ئەقڵ) بەربەریەتێکی تازەی لێدەکەوێتەوە کە پشت ئەستوورە بە مەعریفەیەکی تەکنیکیو، دواجاریش دەبێ بە (ئەقڵانیەتێکی سیاسی)[44] کە فەردانیەتی تاک سنووردار دەکاو، هەڵسوکەوت و ئارەزووەکانی دیسپلین دەکا.

دەسەڵات لە سەردەمی مۆدێرنەو ئەقڵانیەتدا پێویستیەکی بەردەوامی بە سیستمی دیسپلین کردنی جومگەکانی کۆمەڵگاو خولقاندنی هاوتایی هەیە. مەعریفەش ئەو ئامرازەیە کە دەسەڵات تەیاردەکا بە توخمەکانی کۆنترۆڵکردنی جەستەو شتەکان.. لێرەوە ئەقڵی زانستی یان ئەقڵی سیاسی دەبێ بە (ئەقڵێکی ئامرازی) **Raison instrumentale** ئەو فیکرەش مەبەستگەر نەبێ دەبێتە فیکرێکی بێبایەخ و بێمانا. ئەقڵی ئامرازی رازی نابێ ئەگەر فیکرێك لەرەوتی ئەو چالاکیە لابدا کە ئەو دەیهێنێتە کایەوە، بەزاندنی ئەم چوارچێوەیەش واتە بەزاندنی واقع. لەکاتێکدا "مەعریفە تەنها جەخت لەسەر واقع دەکا، واقع دەبێ بە خاوەنی دوا قسە.. بیرکردنەوەش کورت دەبێتەوە بۆ تۆتۆلوجیا. میکانیزمی رۆشنبیری ملکەچی ئەو شتە دەبێ کە هەیە.. بەهەمان ئەندازەش و بە شێوەیەکی کوێرانە ئەو پرۆسەیە بەرهەم دێنێتەوە. بەم شێوەیە ئەقڵ دەگا بەو میتۆلۆجیایەی کە هەرگیز نازانێ چۆن خۆی لێدەرباز بکا"[45].

ئەقڵ و دەسەڵات و سیستم و واقع بەشێوەیەکی ئۆرگانی هاوپەیمانی دەبەستن بۆ گەمارۆدانی تاك و کۆمەڵ. ئەم هاوپەیمانیە بە دوو رەوت تەرجەمە کراوە کە لە شێوازدا جیاواز و لە ئامانجدا وەکو یەکن ئەو دوو رەوتەش: پۆزەتیڤیزم و هیگلیزم، هەردووکیان تەعبیر لە فۆرمێکی شێواوی ئەقڵ دەکەن، یەکەمیان بە (ئەقڵی ئامرازی)ی زانست و تەکنەلۆجیا ناودەبرێ، دووەمیشان بە (ئەقڵی بابەتی) ئەقڵانیەت.

هەر بۆیە فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی لەگەڵ پۆزەتیڤیزم و هیگلیزمدا کۆك نین.. بە بڕوای ئەوان تۆتالیتاریەتی ئەقڵ کە بەدەسەڵاتی دەوڵەتی مۆدێرنەوە لکاوە، هەروەها پەیوەندیی ساکارانە لەگەڵ دەرکەوتەکاندا.. تەنانەت ئەگەر دروشمی زانستیشی بەرزکردبێتەوە هاریکاری تاك ناکەن بۆ ئازادبوون و دەربازبوونی لە پاوانخوازیی کەلتووری جەماوەری مۆدێرن، واتە کۆمەڵگای پیشەسازی دیاردەیەکی بەرهەمهێناوە کە مارکیوز ناوی دەنێ "مۆرکی ئەقڵانی نائەقڵانیەت"[46].

ئەنجامی ئەم راڤەکردنە ئەوەیە کە مرۆڤی خۆرھەڵاتی بەھۆی گەشەی کوێرانەی ئەقڵەوە شوناسی خۆی لەدەستداوە. زمانیش تەنھا رۆڵی ئەو ئامرازە دەبینێ کە (دیفاکتۆ) قبووڵ دەکاو رەتی ناکاتەوە. ئەمەش بووەتە ھۆی ئەوەی فیکر ئەو رەھەندەی ناوەوەی خۆی لە دەست بدا کە ھانی دەدا بۆ نەیاربوون. ونبوونی ئەم رەھەندەش کە لە رێگایەوە فیکری رەخنەیی ھێز دەبەخشێ بە ئەقڵ، ھاوتایەکی ئایدیۆلۆجی بۆ ئەو پرۆسە مادیە ھێناوەتە ئاراوە کە کۆمەڵگای پیشەسازی لەسەر دامەزراوە، ئەویش لە رێگای بێدەنگ کردن و لە قاڵبدانی جیاوازی و نارەزاییەکان. چونکە پێشکەوتنی تەکنەلۆجی ھەوڵدەدا ئەقڵ ملکەچی فاکتەکانی ژیان بکاو، تەنھا ئەرکی بەرھەمھێنانەوەی ئەو فاکتانە بگرێتە ئەستۆ.

سەرەرای ئەم رەخنە ریشەییە لە ئەقڵانیەتی رۆشنگەرىو دەرکەوتەکانی مۆدێرنە لە زەمەن و کۆمەڵگادا، سەرەرای ئەو نارەزاییە میتۆدیو فەلسەفیەی کە تیۆری رەخنەیی رووبەرووی پۆزەتیڤیزم و ھیگڵیزم و مارکسیزمی کردۆتەوە - بە تەعبیرە ئۆرسۆزوکسیە سیستمگەریەکەی-.. بەڵام فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی بروایان بە ئەقڵانیەتێکی کراوە ھەیە کە سوود لە خاڵە گونجاوەکانی ئەقڵانیەتی رۆشنگەری وەردەگرێو خاڵە خراپەکانی رەت دەکاتەوە. ئەو ئەقڵەی تیۆری رەخنەیی بانگەشەی بۆ دەکا کورت نابێتەوە بۆ ئامراز؛ بەڵکو ئەقڵێکی تایبەتە کە دەخوازێ حەقیقەتێکی ئەقڵانی بداتەوە بە رێکخستنی کۆمەڵایەتی لە رێگای بە مرۆیی کردنیەوە، ھەروەھا لە رێگای دەستەبەرکردنی چێژو دادو ئازادیەوە. ئەقڵ، لەم دۆخەدا، تەنھا فۆرمێکی بێلایەن نیە بەڵکو چەندین ناوەرۆك و ئەرکی ھەیە.. ھەروەھا بەناوی خۆیەوە ھەندێ رەفتار ئیدانە و دادگایی دەکا.

ریشەی مەسەلەکە پەیوەندیدارە بە سەرلەنوێ تێفکرین لە پرۆژەی ئەقڵانیەت، بۆ لەوەی بخزێتە نێو ماتریالیزم و وەلانانی بەرھەمەکانی زانست. دەبێ ئەقڵانیەت رێژەیی بێت و، دژی ھەر گلۆربوونەوەیەك بێت بەرەو دۆگماو گشتگیری، چونکە خودی ئەقڵ "لەھەر رەوتێکی تر گشتگیر ترە"(47).

فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی پەردەیان لەسەر کارەساتەکانی بە ئەقڵانی کردن لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا ھەڵدایەوە، بەڵام لەسەر زەمینەیەکی کاری ئەقڵانی بوون، چونکە بەبروای ئەوان بە ئەقڵانی کردن بووەتە "ھاوشانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی"، بەڵام بەرلەوەی ئازادیخواز بێ کۆیلەخوازە، چونکە جیھانێکی دروست کردووە کە لەرووی دیسپلینی ئیداریەوە توندوتیژەو، جیاوازیەکان رەتدەکاتەوەو، تایبەتمەندیەکان وەلا دەنێو، ھەموو دەلالەتێك لەتاك دادەماڵێ.

رەخنە لە ئەقلی رۆشنگەریو، پەردەلادان لەسەر دیاردە بەربەریەکانی ئەقڵانیەت و، بەگژاچوونەوەی دەوڵەتی مۆدێرنی لە فۆرمە ستەمگەریەکەیدا.. کارێکی پێویستە بۆ سەرلەنوێ وەگەرخستنەوەی نێگەتیف لە فیکرداو، تازەکردنەوەی ھێزی رەخنە لە فەلسەفەدا. ئەم کارەش، بە بروای بیریارانی تیۆری رەخنەیی، تەنھا کەسێکی رەخنەگر ئەنجامی دەدا کە خاوەنی پاشخانێکی فیکری نێگەتیف بێو، خۆیشی لە ھەژموونی (فەلسەفەی خود) پاراستبێ.

### 4- تاك لە نێوان وەهمی دابڕان و پاوانکردنی کەلتووردا:

ئایا ئەقڵی ڕۆشنگەری هەموو وزەی خۆی خستۆتە گەڕ بۆ دامەزراندنی ئەقڵانیەتێکی ئامرازیی تەکنیکی کە مرۆڤ دەکا بە کۆیلەو چالاکیە جەستەییەکانی سنووردار دەکاو ئارەزووەکانی دیسپلین دەکا؟ ئایا ئەو رەخنەیەی ئاراستەی ئەو ئەقڵە دەکرێ بە شێوازە (کانت) یەکەیەتی کە ئاستەکانی رەخنە دابەش دەکا، بەرهەمە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی ئەقڵ لێکدی جیادەکاتەوە؟ یان رەخنەیەکە چاودێری ئەقڵ دەکاو بە بەردەوامی وریای دەکاتەوەو کەلێن و زیادەڕۆییەکانی دەسنیشان دەکات؟ یان ئایا مەسەلەکە -لای بیریارانی تیۆری رەخنەیی- پەیوەندی بە نوێکردنەوەی ئەقڵی ڕۆشنگەریەوە هەیەو، چەند کەرەستەیەکی نیگەتیڤانەی خستۆتە پاڵ چالاکیە فیکریەکانی تا سەرلەنوێ گورپیدا بەرەخنەو، تاك لەو (خود)ە رزگار بکا کە بە چەندین ئەفسانەی جۆراو جۆری زادەی مۆدێرنە کەلەپچە کراوە؟

لە پرۆسەی رەخنەگرتندا لە کۆمەڵگای مۆدێرن و ئەقڵانیەتی ئەوکۆمەڵگایەدا، فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی لەسەر ئەوە کۆکن کە قەیرانی ئەقڵ، بە ئاشکرا، لە قەیرانی تاکدا بەرجەستە دەبێ، لەبەردەم ئەم دوالیزمە قەیراناویەشدا وەهمەکانی فەلسەفەی تەقلیدی سەبارەت بە خودو ئازادی ریسوا دەبێ.. چونکە فەلسەفە، لە دیکارتەوە، ئەقڵ وەك ئامرازێکی دەستی (خود-من) تەماشا دەکات. بەڵام ئێستا هەروەکو هۆرکایمەر دەڵێ (بە یەزدان کردنی خود) باوی نەماوە، چونکە ئەو ئەقڵەی کە بەدوای کەماڵدا دەگەڕا ئێستا بووە بە نائەقڵانی، یان راستتر بووە بە ئەقڵێکی داماو.

گرفتی ئەم سەردەمە پاراستنی خودە.. لە کاتێکدا خودێك نەماوە پارێزگاریی بکەین، سەبارەت بەم واقعە تازەیە دەبێ پرسیار بکەین دەربارەی پێگەی تاك لە کۆمەڵگای مۆدێرندا، دەربارەی چۆنیەتی پەرتبوونی ئەنتۆلۆژی ئەو (تاك)ەی زادەی بەرهەمەکانی مۆدێرنەو ئەقڵانیەتە.

تیۆری رەخنەیی لە کاتێکدا بایەخ بە رەخنەگرتن لە ئەقڵی ڕۆشنگەریو گشتگیریو پۆزەتیڤیزم و رەوتی هیگڵیو (هەروەها مارکسی) دەدا.. بەهەمان ئەندازە پرسیاری تاك سەرقاڵی کردووە، چونکە قەیرانی تاك بە هەموو ئاراستەیەکدا رووبەڕووی ئەندێشەی بیریارانی ئەم تیۆرە دەبێتەوە بە تایبەتی لە سایەی ئەو بەها کەلتووریە تازانەی کە زادەی مۆدێرنەو سیستمی لیبراڵین.

هەر بۆیە نامۆ نیە دامەزرێنەرە سەرەتاییەکانی تیۆری رەخنەیی، لە ساڵی (1924)ەوە، لە رێگای (پەیمانگای توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکان)ەوە بایەخ بە مەسەلەی خێزان و دەسەڵاتی باوك و پێگەی تاك لە کۆمەڵگای مۆدێرندا دەدەن. چونکە سەرنجیان دا پاشەکشێی رۆڵی باوك و لە بەریەك هەڵوەشانەوەی خێزان، هەرچەندە بووە هۆی دارمانی دەزگای خێزان کە تاکی دەچەوساندەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا هەرەسی بەو دەزگایەش هێنا کە مەرجەکانی دەستنیشانکردنی (التشخیص) Individuation ی دەپاراست، چونکە بە بڕوای بیریارانی تیۆری رەخنەیی (تاك) تەنها توخمێکی مرۆیی نیە کە نیشتەجێی کات و شوێنێکی دیاریکراوە، بەڵکو بریتیە لە "هوشیاربوون بە تایبەتمەندیەکی فەردانی، وەك بوونەوەرێکی مرۆیی کە لە رێگای شوناسێکی تایبەتەوە دەناسرێ"[48].

تاك بوونەوەرێكی دابڕاو لە ریتمی زەمەن و كارلێكەكانی كۆمەڵ نیە، بەڵكو بە پێچەوانەوە "فەردانیەت ئەو كاتە كز دەبێ كە مرۆڤ بڕیار دەدا خۆی بەتەنها هەڵسوكەوت بكا"[49].. تاكی دابڕاو جگە لە وەهمێك هیچی تر نیە، چونكە بەها شەخسیە پیرۆزەكانی وەك سەربەخۆییو ئیرادەی كارو دادوەری هەر بەهای شەخسی نین بەڵكو بەهای كۆمەڵایەتیشن.. هەر بۆیە "تاكێك كە بەتەواوی پێشكەوتوو بێ بەرجەستەكەری كۆمەڵگایەكە كە بە تەواوی گەشەی كردبێ"[50].

ڕەنگە ئەو خەمە سەرەكیەی كە بیریارانی تیۆری رەخنەیی سەبارەت بە تاك سەرقاڵ كردووە، بریتی بێت لە چۆنیەتی رزگاركردنی تایبەتمەندێتی تاك، واتە رزگاركردنی سروشتی ناوەوەی تاك لەو كۆنترۆڵە ئەبستراكتەی چەمك و، لە "ئەبستراكتە ئەفسانەییەكانی وەك: گشتگیری هیگڵی، ماهیەتی هۆسرڵ و، بوونخوازیی هایدگەر، بێ ئەوەی بەشداری بكەن لە تواندنەوەی فەردانیەت لە سۆفیگەریەكی نائەقڵانیدا، كە لەلایەن فاشیزمەوە دەقۆزرێتەوە"[51].

هەر فیكرێك ئاگای لە تایبەتمەندیو جیاوازی تاك نەبێ ناتوانێ لە گەوهەری پەشێوی مرۆڤ بگا، پشتگوێ خستنی ئەم رەهەندی تاك.. هانی فەیلەسووفەكانی تیۆری رەخنەییدا كە ئاستە تایبەتیەكانی تاك لەگەڵ ئاستە گەردوونیەكانیدا پێكەوە گرێ بدەن، هەروەها رەخنەیان لە هەموو ئەو فەلسەفانە گرت كە قوربانی بە تایبەتمەندیەكانی تاك دەدەن لە پێناو گشتگیری رەوتدا- هەروەكو لای هیگڵ دەردەكەوێ-، یان لە پێناو زانستێكی بابەتیدا هەروەكو پۆزەتیڤگەرەكان بانگەشەی بۆ دەكەن.. یان ملكەچ بوون بۆ رەوتی مێژوو وەك ماركسیزم باسی لێوەكا.

تیۆری رەخنەیی بڕوای وایە ئیرادەی رەوتگەری یەكێكە لە پێكهاتەكانی تیۆری تەقلیدی، ئەو تیۆرە كە هەوڵی دەربازبوون دەدا لەهەر جۆرە تۆتالیتاریەكی ئەقڵ و لەبەرهەمە ترسناكەكانی مۆدێرنە، هەوڵدەدا هەموو بانگەشەیەكی رەوتگەری لە بەریەك هەڵوەشێنێ، وەك بانگەشەی كەماڵ و داخران و چنگكەوتنی تەواوی حەقیقەتی رەها. بۆیە هەروەكو باسمان كرد ئەقڵانیەتی ئایدلیزمی رەت دەكاتەوەو، لەبری ئەوەی رۆبچێتە نێو ئەو رووبەرانەی كە جووڵەو ئازادیی تاك تەنگەبەر دەكەن، هەوڵدەدا كەڵك لە بەهای ئازادیخوازیی ئەقڵ وەرگرێ. گشتگیری لای ئەوان وەهم و درۆیە، حەقیقەتیش -وەك بۆچوونی هیگڵ و ماركس- لە پراكتیكی كۆمەڵایەتیدا گیرناخوا.. بەڵكو لە هەناوی ئەو كەلێن و دژواریەی رەوتدایە، كە جگە لە (كەسی رەخنەگر) كە لەژێر گوشارێكی سیستەمی گشتگیریدایە كەسی تر توانای تەقاندنەوەی پرسیارەكانی نیە. ئادۆرنۆ بڕوای وایە بە خولقاندنی رووبەرێكی گونجاو بۆ پراكتیزەكردن، تاك دەتوانێ كردەی بیركردنەوە ئەنجام بدا، ئەو كردەیەی كە فیكری گۆڕان پێویستی پێیەتی. چونكە لەناو ئازارەكانداو لە هەناوی هەستكردندا بە مەترسی لەناوچوون، پزیسكی رەخنە لەدایك دەبێ، نەك لەناو رەوتێكدا كە تەنها وەڵامی ئامادەكراو پێشكەش دەكا.

مرۆڤ، بۆ دەستەبەركردنی مەرجەكانی ژیان و بەردەوامیدان بەبوونی خۆی، هەوڵدەدا، سروشت كۆنترۆڵ بكا. ئەو كۆنترۆڵە لە رێگای

پابەندبوون بەچەند یاسایەکەوە ئەنجام دەدا کە بەسەر خۆیو کەسانی تردا دەیسەپێنێ. لەگەڵ سەپاندنی ئەو یاسایانەدا مرۆڤ تووشی ئەو وەهمە دەبێ کە سەرداری سروشتە، بەڵام لە راستیدا دەبێ بە کۆیلەی. فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی، بەتایبەتی هۆرکایمەر و ئادۆرنۆ لە کتێبێکی هاوبەشیاندا بەناونیشانی (دیالیکتیکی ئەقڵ)، مێژوویەکیان ئامادەکرد دەربارەی ئەسڵی مرۆڤ وەك سەردارێکی نائەقڵانی سروشت. ئاشتبوونەوەی نێوان خودو فاکتی بابەتی، هەروەکو هیگڵ دەیبینێ، وەهمی پیرۆزی ماتریالیزمە.. لەکاتێکدا دیالکتیك، لە گەوهەردا، ئەوپەڕی هوشیاریە بەرامبەر لاهوت.

لە کاتێکدا فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی قەیرانی ئەقڵ دەبەستنەوە بە قەیرانی تاکی کۆمەڵگای مۆدێرنەوە، بەهەمان شێوە بڕوایان وایە بەدبوونی ئەقڵ پەیوەندیەکی ئۆرگانی بە بەدبوونی تاکەوە هەیە. چونکە پاکتاوکردنی تاك لەلایەن فاشیزم و، دواتر لەلایەن کەپیتاڵیزمی گەشەسەندوەوە. وای لە فەیلەسووفەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت کرد -کە هەریەکەشیان گرفتی تایبەتی خۆیان هەبوو[52] ـ بڕوابێنن بەوەی کە دەوڵەتی گشتگیر، زادەی رێکخستنی نائەقڵانیەتی کۆمەڵگای سەرمایەداریە، خراپەی کۆمەڵایەتیش لەگەڵ کۆنترۆڵدا تەماهی دەکا.

کەواتە جیاوازی تاك چۆن لەهەناوی میکانیزمی ئەقڵانیەتی تەکنیکیو لەناو ئەو پەیوەندیە گشتیانەدا دەتوێتەوە کە پێوەرەکانی مۆدێرنە بەرهەمی دێنێ؟ چۆن هەردوو بنەمای فاکت و ئارەزوو لە کۆمەڵگای پێشکەوتووی پیشەسازیدا تەرجەمە دەکرێت؟

هۆرکایمەرو مارکیوز (هەروەها ئەریك فرۆم و ئارنست بلوخ لە چەند ئاستێکی تردا) شیکردنەوەیەکی هەمەلایەنەیان پێشکەش کرد سەبارەت بە کۆمەڵگای پێشکەوتووی پیشەسازیو بنەما ئایدیۆلۆجییەکانی ئەو کۆمەڵگایە، بەو مەبەستەی ئەو میکانیزمە هوشیارو ناهوشیارانە دەستنیشان بکەن کە تاك و کۆمەڵیان جڵەو کردووە، یان ئەو مرۆڤەی کە مارکیۆز ناوی دەنێ مرۆڤێکی (تاك رەهەند)ی بزێو لە کۆمەڵگایەکی داخراودا.

مارکیۆز هەست بەوە دەکا کە هەموو هێزو بەرژەوەندیە نەیارەکان کە کاتی خۆی دژی سەرمایەداری بوون، ئێستا خراونەتە ناو سیستمێکەوە کە هەموو غەریزەو ئارەزووەکان بەشێوەیەکی میتۆدی دیسپلین دەکا. بۆیە ئێستا هەموو توخمە وێرانکەرو ناکۆمەڵایەتیەکانی نائاگایی قابلی ئاراستەکردن و بەکارهێنانن، کە هێزی نێگەتیڤی لای تاك جڵەوکردووەو کردوویەتی بە هۆکاری هارمۆنی گونجان و جەخت کردن. بەڵکو مارکیۆز بڕوای وایە کە بەرهەمهێنانەوەی داپڵۆسین (لەلایەن تاك و چینەکانەوە) بەبێ هیچ بەرەنگاریەك ئەنجام دەدرێ، پراکتیزەکردنی ئەو پرۆسەی (لکاندنە)ش پێویستی بە گوشارێکی ئەوتۆ نیە چونکە "دیموکراسی لە حوکمی رەها بەهێزترە بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەی کۆنترۆڵ"[53].

لێرەوە فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی بڕوایان وایە کە هەرچەندە فیکری نێگەتیڤ پێویستیەکی گرنگی گۆڕانکاریەکانی مۆدێرنەو دۆخی (تاك)ە لە کۆمەڵگای بەئەقڵانی کراودا، بەڵام رووبەڕووی چەندین کێشەی تیۆری سیاسی بۆتەوە. بە بڕوای مارکیۆز کۆمەڵگای پیشەسازی (دیموکراسی) رەخنە لە بنکە راستەقینەکەی خۆی یاساغ دەکا، چونکە "پێشکەوتنی تەکنەلۆجی سیستمێکی گشتگیری خاوەن کۆنترۆڵ و دیسپلین بەهێز دەکا.. ئەو سیستمەش

لای خۆیەوە پێشکەوتن بەڕێوە دەباو، چەند فۆرمێك بۆ ژیان و (دەسەڵات) دروست دەكا كە وا نیشانی دەدا لەگەڵ هێزە ئۆپۆزیسیۆنەكاندا ناكۆك نیە.. بەڵام دواجار ئەو بۆچوونە گەڵاڵە دەكا كە هەموو ناڕەزایی نیشاندانێك بێ هودەییە"[54]. ئیتر فاكتەرەكانی گۆڕانی كۆمەڵایەتی جار لە دوای جار لەناودەچن، ڕەخنە دەچێتە خانەی ئەبستراكتەوە، بەڵكو لەوەش زیاتر "لە كۆمەڵگای پیشەسازیدا كە سیاسەتی تواندنەوەو لكاندن پەیڕەو دەكا وتەزاكانی ڕەخنە دەبنە چەند رستەیەكی وەسفی كە هیواكان دادەڕمێنن"[55].

كۆمەڵگای پیشەسازی پێشكەوتو، چەند فۆرمێكی تازەی چاودێریو دیسپلین كردنی بەرهەم هێناوە، دواتر هەروەكو ماركیوز وێنای دەكا كۆمەڵگایەكی تاك ڕەهەندی خولقاندووە. خۆشگوزەرانیو كاراییو ئەقڵ و ئازادیی نوقسان لە چوارچێوەیەكی دیموكراسیدا خەسڵەتەكانی شارستانیەتی پیشەسازی پێشكەوتووەو گەواهی بۆ پێشكەوتنی تەكنۆلۆجی دەدەن. لە هەمووی ئەقڵانی تر "ڕەتكردنەوەی فەردانیەتە لە ڕێگەی بە ئامێركردنی كردارە كۆمەڵایەتیە پێویستەكانەوە، بەڵام -ئەو ئەقڵانیەتە- لە هەمووی سەختترە"[65].

فەلسەفەی ڕۆشنگەری ئازادیو ئەقڵانیەت و دادوەری پێكەوە گرێداو، بڕوای وابوو كە سیستمی دیموكراسی سیستمێكی گشتیی هەمەڕەگەزە.. بەڵام بە بڕوای ماركیۆز ئەقڵانیەتی كۆمەڵگای پیشەسازی ئازادی دەخاتە پەراوێزەوەو تاك قەمبوور دەكا، دواتر ئازادی، بەمانا لیبراڵیەكەی، كە گوایا بەرجەستەكەری ئیرادەو دەسپێشخەریی تاكە، ئازادیەكی فیعلی نیە لەو كۆمەڵگا سیاسیەیدا كە ئەقڵانیەتی تەكنیكی بنیاتی ناوە. لە سیستمێكدا كە لەسەر دیسپلین و چاودێری دامەزراوە، ئەوەی ناونراوە (سەربەخۆیی تاك) بووە بە جۆرێك لە وەهم و خەیاڵ.

شارستانیەتی كۆمەڵگای پیشەسازی كەلتوورێكی تایبەتی بەرهەمهێناوە كە فۆرمە دیموكراسیەكان دەپۆشێ، تەعبیر لە سیمبولەكانی دەكا لە شێوەی چەند قاڵبێكی جەماوەریدا، بەڵام بە بڕوای ماركیۆز ئەو كەلتوورە لە گەوهەردا ڕەنگدانەوەی خواستی دیموكراسی تاك و ناوەڕۆكی ڕۆشنبیری كۆمەڵ نیە "ئێستا گەر بمانەوێ ئازادیەكی فەردیمان هەبێت دەبێ مانای ئەوە بێت ئەو فیكرە فەردانیە نوێ بكەینەوە كە نوقمی پەیوەندی جەماوەریە"[57].

فەیلەسووفەكانی تیۆری ڕەخنەیی دوای ئەوەی دارمانی بەها فەردیەكانیان لە كۆمەڵگای پیشەسازیی پێشكەوتوودا بینی، هەروەها دوای ئەوەی بینیان (تاك) مافی جیاواز بوونی لە سیستمی فاشیزمدا لە دەستداو، دواتریش مافی بەشداری كردنی لە چۆنیەتی ڕێكخستنی سیستمی سیاسی داخراوی كۆمەڵگای پیشەسازی لەدەستدا.. هەوڵیان دا ئەقڵ بخەنەوە گەڕ بۆ ئەوەی بەها ببەخشێتەوە بە تاك و، فیكری ڕەخنەییش ببوژێنێتەوە. لێرەوە بایەخیان دایەوە بە سەرلەنوێ خوێندنەوەی دەقەكانی فرۆید لەبەر ڕۆشنایی گۆڕانكاریەكانی كۆمەڵگای پیشەسازیدا، پرسیاریان دەربارەی دەلالەتەكانی ئارەزوو كرد.. هەروەها دەربارەی سێكس و ئەو بایەخدانەی لە نائاگاییەوە دەدرێ بە سێكس و، پەیوەندی میكانیزمە تازەكانی ئیغراو هەوەس بە پرۆسەی بەرهەمهێنانەوە.. هەروەها دەربارەی مانا تازەكانی خۆشەویستی پرسیاریان كرد.

مارکیۆز لە پێشەکی کتێبی (ئیرۆس و شارستانی)دا ئاماژە بەوە دەدا کە بە هۆی ئەو دۆخە تازەیەی مرۆڤی مۆدێرنی تیادەژیو بەکارهێنانی وتەزا سایکۆلۆجیەکان بووە بە کارێکی پێویست، چونکە ئێستا بوونەتە وتەزای سیاسیو "سنوورە تەقلیدیەکانی نێوان سایکۆلۆجیاو فەلسەفەی کۆمەڵایەتیو سیاسی سڕاونەتەوە"[58]، ئەو پرۆسە دەروونیانەی کە لە رابردوودا تایبەتیو سەربەخۆ بوون ئێستا بەهۆی رۆڵ و، بوونی گشتی تاکەوە لە دەوڵەتدا، تایبەتمەندیو سەربەخۆییان لە دەستداوە، بۆیە ئەگەر تاک پێویستی بەو هۆکارانە هەبێ کە مەرجەکانی بوونی زاتی بۆ دەستەبەر دەکەن، ئەوا زاراوەکانی سایکۆلۆجیا بووە بە زاراوەی ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانەی رەهەندەکانی دەروون دەسنیشان دەکەن. دواتریش پێویستە ناوەرۆکی سۆسیۆلۆجیو سیاسی بۆ وتەزا دەروونیەکان بدۆزرێنەوە.

لێکدانەوەی چەمکە دەروونیەکان بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە مرۆڤی کۆمەڵگای مۆدێرن و، بەشداریکردن لەو ئەرکەدا کە مارکیۆز ناوی دەنێ (فەلسەفەی شیکردنەوەی دەروونی) نەک (شیکردنەوەی دەروونی) -چونکە فرۆید تیۆرێکی دەربارەی مرۆڤ دارشتووە کە پێگەیەکی بەرزی لە کەلەپووری فەلسەفیدا پێبەخشیوە- ئەو ئەرکە، واتە لێکدانەوەی چەمکە دەروونیەکان، پرۆسەیەکی پێویستە بۆ پاڵپشتی کردنی تیۆری رەخنەیی، لەرووی تیۆریەوە، لە پێناو دۆزینەوەی ئەو میکانیزمە جۆراوجۆرانەی کە جەستەو ئازادی تاک لە کۆمەڵگای مۆدێرندا جڵەو دەکەن.

بنەمای فاکت (واقع) دەسەڵاتی سەپاندووە بەسەر بنەمای ئارەزوودا. ئەقڵیش لەبەردەم ئیرادەی ئائەقڵانیدا پاشەکشێی کردووە. کەواتە چارەنووسی تاک لە چارەنووسی ئەقڵ جیانابێتەوە. کاتێکیش دەسەڵات و مەعریفە تەماهی دەکەن -واتە شوناس دەگۆڕنەوە- مەعریفە دەبێتە تەنها ئامرازێکی کۆنترۆڵکردن.. تاکیش لای خۆیەوە دەبێتە تەنها هۆکارێك بۆ پاراستنی هاوکێشەی سیستم و، دەستەبەرکردنی کاردانەوەی کار.

دیارترین نمونە بۆ ئاامادەیی ئەقڵ و پاشەکشێی تاک و تەماهی نێوان دەسەڵات و مەعریفە لەو شتەدا دەردەکەوێ کە ناوی نراوە "کەلتووری جەماوەری"، شیکردنەوەی میکانیزمەکانی ئەم کەلتوورە ئەو تێبینیەمان لا گەڵاڵە دەکا کە هەموو شتێك قابیلی یاری پێکردن و ئاراستەکردنە بە گوێرەی نەخشەی (تیمەکانی بەرهەمهێنان) کە ئارەزووی مرۆڤەکان دەکەنە کەرەسەیەکی خاوی دەستی پیاوەکانی پروپاگەندە. بۆ نمونە سێکس کە گوایا ئازادە لە راستیدا لەلایەن بەرژەوەندیە گەورەکانەوە بەرێوە دەبرێو، لە بازاڕە گشتیەکانی ئاڵوگۆڕدا ئیستغلال دەکرێ. ئەم رێکخستنەی سێکس لە کۆمەڵگای پیشەسازی پێشکەوتوودا میکانیزمی ئەنتۆلۆژی سێکس دەگۆڕێو، مانای مرۆیی ئارەزوە سێکسیەکان دەشێوێنێ. لە کاتێکدا مۆرکی سێکسی بە بەربڵاوی نیشان دەدرێو، لەمپەرەکانی بەردەوام بەجێهێنانی ئارەزوو هەڵدەگیرێ.. خۆشەویستی بنەما راستەقینەکەی خۆی لە دەست دەدا.

مەسەلەکە لای بیریارانی تیۆری رەخنەیی پەیوەندیی بە پرۆسەی لکاندنی ئارەزووەوە هەیە بە میکانیزمەکانی ئاڵوگۆڕی جەستەیی رەمزی لە کۆمەڵگای پیشەسازی مۆدێرندا. ئارەزوو لێرەدا

تەنها پەیوەندیی بە سێکسەوە نیە، چونکە ئیرۆس کە عەشقی جوانیو فیکر دۆستی دەگەیەنێ، ئێستا سەرچاوەی سەرەکی رەخنەو خەونی گۆڕانە.. ئەمەش پێچەوانەی واقعی حاڵە.

مۆدێرنەی تەکنیکی تەنها بەوەوە نەوەستاوە مەرجە ئەنتۆلۆژیەکانی تاك لەسەر ئاستی ئەقڵ و ئارەزوو و مەیلە جەستەییەکانی دابماڵێ، بەڵکو تەوزیفی دەربڕینەکانی ئەو توخمانەش دەکا تاوەکو زیاتر لە خودی خۆی بترازێو بخزێتە نێو گشتگیریەکی ئابووری کە درێژبوونەوەیەکی جەماوەری هەیە، چونکە ئەو "لەناو پیشەسازیەکی کەلتووریدایە.. کە تاکەکانی تەنها بەهۆی تەکنیك کردنی هۆکارەکانی بەرهەمهێنانەوە نەبوون بە وەهم، بەڵکو تەنانەت رێگە بەبوونیشیان نادرێ گەر لەگەڵ ئاستی گشتگیردا بە تەواوی تەماهی نەکەن"[59].

لێرەوە دەبێ ئەو مۆرکە ئەفسوونیە لە پێشکەوتنی زانستیو مۆدێرنە بسەنرێتەوە، چونکە تەکنەلۆجیا رۆڵێکی ئایدیۆلۆجی کاریگەرو بەهێز دەبینێ. بەهەمان ئەو ئەندازەیەی نوێنەرایەتی جڵەوکردنی شتەکانی سروشت دەکا.. ئەرکێکی ئایدیۆلۆجیش ئەنجام دەدا بۆ جوداکردنەوەی ئەنتۆلۆژیی تاك و (خود)ەکەیو، هەروەها بۆ درێژەدان بە پەیوەندی پەشێوی نێوان تاکەکان. بۆیە فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی ناچار بوون بڵێن: تەماهی تۆرگانی نێوان ئەقڵ و زانست، ئەو ئامرازانە بەرهەم دێنێ کە ئازادی تاك پەرژیندار دەکاو، ئەوەندەی کۆنترۆڵی دەکا بەشداری لە ئازادکردنیدا ناکا.

هەموو شتێك لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا (فۆرمە بازاڕییەکە)ی دەپۆشێ، چونکە هۆکارەکانی پەیوەندی جەماوەری، هەروەکو مارکیۆز دەڵێ، هونەرو سیاسەت و ئاین و فەلسەفەو بازرگانی تێکەڵ دەکاو پێکەوە دەیانگونجێنێ. هیچ شتێك حسابی بۆ ناکرێ جگە لە بەهاکانی ئاڵوگۆڕ، تەنانەت حەقیقەتیش مانا لە دەستدەدا. چونکە "ئەقڵانیەتی دیفاکتۆ لە بەهای ئاڵوگۆڕدا چەق دەبەستێ، هەموو ئەقڵانیەتێکی تر دەبێ لەو ئاستەدا تەنازول بکا"[60]، بەڵکو ئەو شتەی ناوی نراوە "کەلتووری باڵا" واتە **کەلتووری نوخبە** هەرگیز نەبووە بە کەلتوورێکی جەماوەری، چونکە ئەو فاکتە تازەیەی کە مۆدێرنەی تەکنیکیی هێنایە کایەوە گومانی تەنانەت لەو کەلتوورەش هەیە. واقع کەلتوور تێدەپەڕێنێ، ئەو واقعەش توخمەکانی هوشیاریەکی بزێو بەرهەمدێنێ کە بنەماکەی بریتیە لە جۆرێك لە داپڵۆسینی ئاستی ئەنتۆلۆژی تاك.

مۆدێرنەی تەکنیکی بەو پێیەی دەیەوێ ئارەزووە قووڵەکانی تاك لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی بەهای ئاڵوگۆڕ، لەسەر ئاستی بازرگانیو کەلتوور، بخاتە گەڕەوە، هەروەها بەو پێیەی هۆکارەکانی پەیوەندی بووارە تایبەتیەکانی تاکی بەزاندووەو تەعبیرەکانی پاوان کردووە.. ئەم مۆدێرنەیە -واتە مۆدێرنەی تەکنیکی- چەمکێکی دروست کردوە مارکیۆز ناوی دەنێ "هوشیاریەکی بەختەوەر" بە گوێرەی ئەم چەمکە ئەوەی واقعیە ئەقڵیەو، سیستم پێداویتسیەکانی مرۆڤ دابین دەکا.. دواجاریش "پابەندبوونێکی تازە" **nouveau conformisme** سەرهەڵدەدا، کە لە رێگای "رەفتارێکی کۆمەڵایەتی موتوربەکراو بە ئەقڵانیەتی تەکنەلۆجیەوە خۆی نمایش دەکا"[61].

ئەم رووبەرە ژیاریو رەمزیەی کە مۆدێرنەی تەکنیکی بەرهەمی هێناوە، بە بڕوای فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی، بەهیچ شێوەیەك هاریکاری مرۆڤ ناکا بۆ ئازادبوون، چونکە تووشی وەهمی ئازادیو دیموکراسی دەکا لە کاتێکدا میکانیزمەکانی جگە لە (هاوشێوە) هیچی تر بەرهەم ناهێنن. زمانی بواری پەیوەندیی بالادەست هەوڵی یەکخستن و بەرهەمهێنانی فیکری پۆزەتیڤگەری دەدا. بۆیە لە هەموو چەمکێکی رەخنەییو لە هەموو ئەگەرێکی بالاخوازی قەڵس دەبێ. ئەم زمانە تەعبیر لە جۆرە "گوتارێکی داخراو" و جۆرە فیکرێکی تاك رەهەند دەکا کە ئەقلانیەت دەگۆڕێ بۆ دژەکەیو، ئازادیش دەگۆڕێ بۆ زۆرداریەکی تازە. مارکیوز دەڵێ: "دوو دیاردە لە کەرتە هەرە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵگای پیشەسازیدا هەیە: ئەقلانیەت لەلایەکەوە تەعبیر لەخۆی دەکا بە ئاراستەیەکدا بەرەو کەماڵی تەکنیکی.. لەلایەکی تریشەوە هەموو هەوڵێك دەخاتە گەڕ بۆ دیسپلین کردنی ئەم ئاراستەیە لەناو دەزگا پایەدارەکاندا. دژبوونێکی ناوەکی لەم شارستانیەتەدا هەیە، واتە لە توخمی نائەقلانیی ئەقلانیەتی ئەم شارستانیەتەدا"[(62)].

کە حاڵ دەگا بەم ئاستە، کۆنترۆڵ هەموو بوارەکانی بوونی تایبەت و گشتی داگیر دەکا، هەموو توخمێکی نارەزایی دەربڕین و هەموو مەرجێکی بیرکردنەوەی رەخنەیی نێگەتیڤانە ئیحتیوا دەکات. ئەقلانیەتی تەکنەلۆجی "مۆرکی سیاسی خۆی ئاشکرا دەکا لەو کاتەدا کە دەبێتە ئامرازێکی کۆنترۆڵ، ئەمەش دۆخێکی گشتگیری راستەقینەیە کە کۆمەڵگاو سروشتی تێدایە، رۆح و ئەقڵ هەمیشە بەو ئاراستەیەدا ساز دەکرێن کە بەرگری لەم دۆخە بکەن"[(63)].

تیۆری رەخنەیی لەبەردەم ئەم داخزانەدا چی لەدەست دێ؟ ئەی داخۆ فیکری نێگەتیڤگەر چۆن لە رەوتێکدا جموجووڵ دەکا کە یەکێ لە ئەرکەکانی ئیحتیواکردنی هەموو نارەزاییەك و چاودێریکردنی کەناڵەکانی رەخنەیە؟

### 5- لەنێوان لکاندن و ئاسۆی ئیستاتیکیدا:

لەبەر رۆشنایی ئەوەی باسمان کرد دەردەکەوێ فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی لە میانەی پراکتیزەکردنی فەلسەفەو دادگایی کردنیاندا بۆ ئەقلانیەتی رۆشنگەرییو تەعبیرە کەلتووریەکانی مۆدێرنەو، لە چوارچێوەی بایەخدانی سەرەکیاندا بە مەسەلەی تاك و پەیوەندی تاك بە (خود)ی خۆیو بەرامبەرەوە.. ناچاربوون هەریەکەیان بەپێی بایەخ و ئەزموونی تایبەتیان سوود لە توخمە رەخنەییە گرنگەکانی کەلەپووری فەلسەفی ئەڵمانی وەرگرن، هەر لە (کانت)ەوە تا هایدگەر. هەرچەندە هۆرکایمەر دان بەوەدا دەنێ "گرنگترین دوو فەیلەسووف، کە بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوە، کاریگەرییان بەسەر سەرەتاکانی تیۆری رەخنەییەوە بەجێهێشتووە شۆبنهاوەر و مارکس بوون"[(64)].

بەڵام دەقە جیاوازەکانی فەیلەسووفەکانی ئەم تیۆرە دەریدەخەن کە کاریگەری دەقی چەند فەیلەسووف و بیریارێکی تریان بەسەرەوە هەیە. چونکە رەخنەی (ترانسنتالی کانتی) لە دەقەکانی تیۆری رەخنەییدا ئامادەیی هەیە لە کاتێکدا (رەخنەی مارکسی)یشیان ئاخنیوەتە هەناوی ئەو رەخنە **کانت** یەوە. هەر ئەمەبوو وای لەچەند توێژەرێك کرد بڵێن: تیۆری رەخنەیی، لە راستیدا تیۆرێکە کانت و مارکسی کۆکردۆتەوەو پێکەوە گونجاندوونی[(65)].

بەهەرحاڵ سەرەڕای گەشتی بەردەوامی فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی بەنێو دەقە جیاوازەکانی کەلەپووری فەلسەفەی رەخنەیی ئەڵمانیدا.. دواجار توانیویانە لە پرۆسەی ناڕەزاییەکانیاندا بەرامبەر دارمانە جۆراو جۆرەکانی ئەقڵ و تاک لە کۆمەڵگای پیشەسازی پێشکەوتوودا، گورو تین بدەنەوە بە رەخنە. تەنانەت چەمکی ئەقڵی دیالیکتیکیش کە چەمکێکی هیگڵییەو بە ئاراستەی رەوتگەری هیگڵیزم موتوربە کراوە، لای ئادۆرنۆ لە فۆرمە رەخنەییەکەیدا ئەزموون کراوە، چونکە ئەو بڕوای وایە هیگڵ جەختی لەسەر ئەوە کردوە کە ئەقڵ دەتوانێ دژی خودی خۆی بیربکاتەوەو، پێکهاتەی دیسپلینی کردارەکانیشی نەدۆڕێنێ.

ئەگەر رۆنەچینە نێو چۆنیەتی ئامادەیی کەلەپووری فەلسەفی رەخنەیی ئەڵمانیا لە فەلسەفەی نیگەتیڤگەری تیۆری رەخەنەییدا، جا ئەگەر ئەو ئامادەبییە پەیوەندی بە کانتەوە هەبێت، یان شوبنهاوەر، یان مارکس، یان هیگڵییە لاوەکان، یان ماکس ڤیبەر، یان نیچە، یان پەیوەندی بە کۆرش و هایدگەرەوە هەبێت.. ئەوا تێبینی دەکەین تیۆری رەخنەیی لە پرۆسەی رەخنەگرتنیدا لە ئەقڵانیەتی تەکنیکیو پێگەی تاك لە کەلتووری کۆمەڵگای پیشەسازیدا، کەڵکی لە چەند چەمکێکی شیکردنەوەی دەروونی وەرگرتووە بۆ دۆزینەوەی میکانیزمە هوشیارو ناهوشیارەکانی شارستانیەتی مۆدێرن و، بۆ دەستنیشانکردنی بنیاتی دەروونیو فیکری مرۆڤی هاوچەرخ. فەیلەسووفەکانی ئەو تیۆرە، بە تایبەتی مارکیۆز و ئەریك فرۆم، تێگەیشتنی فرۆیدیان بۆ خودو شارستانی لکاندووە بە پرۆسەی رەخنەگرتنیانەوە لە بنەماکانی داپڵۆسینی کەلتووری مۆدێرن، هەروەها سوودیان لە چەمکە فەلسەفیەکانی مارکسیزم وەرگرتووە.

دیالیکتیکی شارستانی -لای ئەوان- بریتیە لە ئاڵوگۆڕێکی پەشێوی نێوان کۆنترۆڵ و ئازادبوون. شارستانیەتی تەکنەلۆجیش هاریکاری تاك ناکا بۆ کرانەوەو ئازادبوون، بەڵکو بەردەوام هەوڵدەدا بۆ کۆنترۆڵکردنی لە رێگای چالاك کردن یان داپڵۆسینی ئارەزووەکانیەوە -بەو شێوەیەی کە دەیخوازێ-. کەسی رەخنەگریش لەبەردەم هەڵبژاردنێکی دیارو ئاشکرادایە، یان دەبێ رۆچێتە نێو میکانیزمەکانی کەلتووری باو و تەنازول لە مرۆڤایەتی خۆی بکا، یان ئەوەتا داوای شارستانیەتێك بکا داپڵۆسینی تیا نەبێت و رێگەی پێبدا ئابووری ئیرۆتیکیو ئازادی خۆی بەکاربێنێو پراکتیکی بکا. لەم دۆخەدا مرۆڤ لەبەردەم هەڵبژاردنی دوو جۆر لە بەهادا نیە، بەڵکو لەبەردەم هەڵبژاردنی بەهاو دژە بەهادایە، واتە لەنێوان ئیرۆسی ئازادبوون و لۆگۆسی کۆنترۆڵدایە.

بێگومان شیکردنەوەی مارکیۆز بۆ ئیرۆس و، جەختکردنی لەسەر بنەمای ئارەزوو.. ناچاری دەکا پەیوەست بێ بە تێگەیشتنێکی پێش وەختەوە بۆ دەستنیشانکردنێکی وردی ئیرۆس و ئارەزوو، چونکە ئەوەی ناوی دەنێ شارستانیەتێکی دوور لە داپڵۆسین تەنها ئەگەرێك کە کاری بۆ چۆنیەتی دامەزراندنی نەکردووە، چونکە بریتیە لە پرۆژەیەك بۆ گۆڕانی کۆمەڵایەتی.

مەسەلەکە پەیوەندی بە یۆتۆپیایەکی تازەوە هەیە، چونکە بەهۆی ئەو پەیوەندیە ناهاوتایەی نێوان شارستانیەتی داپڵۆسین و شارستانیەتی بێ داپڵۆسین و، هەروەها بەهۆی داخرانی ئاسۆکانی رەخنەو، بە حوکمی ئەوەی چینێك کە

دەکرا ئەو ئەرکە ئەنجام بدا لە ئیغرائاتی سیستمدا توایەوە، (تاك)ێکیش کە دەکرا بەردەوامیی بە پراکتیکی خۆی بدا لە گشتگیریەکی کەلتووریدا ونبووە.. کەواتە لەبەردەم ئەم واقعەدا هیچ ڕێگایەك لەبەردەم تیۆری رەخنەییدا نامێنێتەوە جگە لەوە نەبێت رۆچێتە نێو رووبەرەکانی فەنتازیاو، پشت بە کاردانەوەی یۆتۆپیا ببەستێ.

بەم شێوەیە، لە نێوان خۆگونجاندن و ئاسۆکانی یۆتۆپیادا، فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی ئەوەیان هەڵبژارد کە جیهان بە فەنتازیا رەت بکەنەوە، چونکە تەنها رێگایەك بۆ رەت کردنەوە یۆتۆپیایە. بەو پێیەی یۆتۆپیا خەونێکە لە خەونی ئاسایی ناچێت خەونێکە هەموو لەمپەرو سنوورەکان دەبەزێنێ، مرۆڤ دەکا بە سەرداری ئەو مێژووەی کە دەتوانێ بیخولقێنێ، چونکە ئەو دەتوانێ خەون ببینێ. ئەم یۆتۆپیایە دەربڕینی فەنتازیایەکەو، جۆرێکە لە جۆرەکانی ئازادیو ئەندێشە، مرۆڤ لە رێگایەوە دەتوانێ بەرەنگاری ئەو مێژووە ببێتەوە کە مۆدێرنەی تەکنیکی سەپاندوویەتی، دواتر ئەو مرۆڤەی خەون دەبینێ کەسێکە بەسەر هێزی کێشکردنی جیهاندا سەردەکەوێ، بەو یۆتۆپیایە بەسەر ئەو زەرووەرەتە سەختەی مێژوودا سەردەکەوێ کە ئەقڵی رۆشنگەری دروستی کردووە.

مارکیوز دەڵێ: "بەڕێوەبردن و رێکخستنی کۆمەڵگای چینایەتی هەستیاریەکی لە مرۆڤ و ئەقڵی مرۆڤدا دروست کردووە، ئازادی خەیاڵی بەرتەسك و سنووردار کردووە. هێزی خەیاڵ لە نێوان پێداویستیەکانی ئەقڵی ئامرازیو، ئەو ئەزموونە هەستییەدا کە دەسکەوتەکانی ئەقڵ شێواندووینی گیری خواردوە.. هێزی خەیاڵ تووشی داپڵۆسین بووە: رێگە نادرێ پراکتیزە بکرێ -واتە رێگە نادرێ واقع بەشێوەیەکی چالاکانە بگۆڕرێ- مەگەر تەنها لە هەناوی رەوتێکی گشتی داپڵۆسیندا بێ"(66). هەروەها دەڵێ: "ئەمرۆ کە بە شتێك دەڵێین (یۆتۆپی) ئاگاداری ئەوە نین کەئەو شتە لە (دژە شوێن)دا روودەداو مەحاڵە شوێنێکی هەبێ، بەڵکو وامان لێهاتووە مەبەستمان- لە یۆتۆپی- ئەو شتە بێ کە بەهۆی دەسەڵاتی پایەداری کۆمەڵگاکانەوە بەرجەستە نابێ"[67].

کەواتە یۆتۆپیا خەونێکە کرانەوەی رەهەندێکی تازە بۆ واقع دەرەخسێنێ، پراکتیکێکی تازە ئاراستە دەکا چونکە مانایەکی گونجاوی پێدەبەخشێ. خەونی پایەداربوونی ئیرۆسێکی بێگوناهە لە جیهانێکی بێ لەمپەردا پێداویستیو ئارەزووەکان بەبێ رێگرتن و تەنگ پێهەڵچنینێك دابین دەکا. ئەمە گرنگترین ئاکاری کۆمەڵگای دژە داپڵۆسینە، سەروەریو سەربەخۆیی دەبەخشێ بە ئیرۆس لە بەرامبەر ئیمپریالیزمی ئەقڵی تەکنیکیدا.

خەونی تیۆری رەخنەیی لەبەردەم داخرانی سەختی بوارەکانی رەخنەدایە، چونکە هەڵبژاردنی ئاسۆی یۆتۆپی بەڵگەی ئەو لاوازیە راستەقینەیەی رەخنەی ئەوانە کە توانای نیە لەناو مێژوودا کاربکا. لێرەوە لەبەردەم نوشستی کەلتووردا -بە چەمکە ئازادی خوازانەکەی-و، قەیرانی تاکی رەخنەگرو بێ توانایی بیرکردنەوەی -بەپێی وتەزا ئەخلاقیەکانی گۆڕان لە پراکتیکی سیاسیدا-، هیچ دەرەتانێك لەبەردەم تیۆری رەخنەییدا نامێنێتەوە جگە لە چوونە ئامێزی بواری ئیستاتیکی نەبێت. دواتر رەخنە لای ئەوان لە رەفتارێکەوە بۆ دامەزراندنی تیۆرێکی رەخنەیی کۆمەڵگا دەبێتە نارەزاییەك لە فۆرمێکی ئیستاتیکیدا. رەتکردنەوەی هونەرێکە

که کەلتوورو تاك بەرەو گلۆربوونەوەو بەدبوون دەبا، یان راستتر رەتکردنەوەیەکی ریشەییە کە خاوەنی چەند رەهەندێکی ئیستاتیکیە. ئەم رەتکردنەوەیە، یان "ئەم خەون بینینە بە جیهانێکەوە کە مرۆڤ خودی خۆی بناسێ و، لەگەڵ ئەو خودەو جیهاندا ئاشتەوا بێت.. شتێك نیە جگە لە سیمبولی ئازادیو ئازادبوون. لە ڕووی واقعییەوە مەرجێکی مرۆیی ناگەیەنێ.. چونکە جگە لە بەرجەستەبوونی رەمزی ئازادی هیچی تر نیە"[68].

هەرچەندە فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی لەو بڕوایەدان کە ئەقڵ "هەست بە ترسێکی ئەفسوونی دەکا بەرامبەر ئەفسانە"[69]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەنایان بۆ هونەر بردووە وەك جیهانێکی رەمزیی کە یارمەتی ئازادبوون دەدا لە دەسەڵاتی ئەقڵ. لە هونەردا ئەقڵانیەتی نێگەتیڤگەری هەیە، فەنتازیاش ملکەچی سنوورەکانی بنەمای فاکت (واقع) نیە. ئەمەش رەهەندێکی رەخنەیی دەبەخشێ بە رەتکردنەوەی ئیستاتیکی. ئەگەر ئەرکی فەلسەفە ئەرکێکی رەخنەیی بێت.. ئەوا هونەر پراکتیکێکی رەخنەییەو، ناڕەزایی نیشاندانە بەرامبەر ئەوەی کە هەیەو، بەزاندنی هەژموونی ئەقڵە، "فەلسەفە لەگەڵ هونەردا یەك دەگرێ کاتێ تەعبیر لە هێزی پڕ جۆشی زمان دەکەن.. هەروەها فەلسەفە لە رێگای زمانەوە هونەر دەکا بە بوارێك بۆ ئەزموون و یادەوەری"[70].

پەنابردن بۆ ئاسۆی ئیستاتیکی وەك چرکەیەکی نیگەتیڤ بەرامبەر مۆدێرنەی تەکنیکی، پاشەکشێی رەخنە دەگەیەنێ لە ئەرکی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی، هەرچەندە فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی هەوڵیان دا تیۆری تێڕامان "نقریه تأمليه" دابمەزرێنن کە پشتنەستوور بێ بە ئەنجامی زانستە مرۆییەکان و دژی هەر ئاراستەیەکی رەوتگەری بێت، هەرچەندە هەوڵیشیان دا ئەو تیۆرە تیۆری رەخنەگرتن بێ لە کۆمەڵگاو، کۆشش بکا بۆ ئازادیو، پشتنەستوور بێ بەرەخنەیەکی ماتریالیزمیی لە ئەقڵ بۆ دامەزراندنی پەیوەندیەکی نوێ لەگەڵ یۆتۆپیادا.. بەڵام دواجار ئەو تیۆرە تەنها وەك بوارێك مایەوە، بێ دەستنیشانکردنی مەرجەکانی، بوارێك بۆ پرسیارو گومان کە دواتر توخمەکانی فیکری نێگەتیڤگەری -رەتکردنەوە (فكر النفي)[71]ی لێکەوتەوە. فیکرێك کە دژی مەینەتیەکان و، هەموو ئەو سەرچاوانەیە کە مەینەتی بەرهەم دێنێ. تاك تەنها لە رێگای ئیستاتیکاوە تەعبیر لە جیاوازی خۆی دەکاو، بە یۆتۆپیاش خۆی لە دیکتاتۆریەتی ئەقڵ رزگار دەکا. بەڵام ئایا سەردەمی مۆدێرنە رێگا بە جیاوازی ریشەیی و یۆتۆپیای خەون دەدا؟ ئایا ئەقڵی رۆشنگەری هەموو وزەکانی خۆی خستۆتە گەڕ بۆ هاریکاری کردنی مرۆڤ بەرەو ئازادبوون؟ ئایا ئەو پرسیارەی فەیلەسووفەکانی تیۆری رەخنەیی دایانڕشت دوورە لە گۆڕانکاریەکانی مۆدێرنەو رەهەندە ئیجابیەکانی.؟

## پەراوێزەکان:


BAIANDIER (G): Le detour, Pouvor et – modernite; Paris. Ed. Fayard. P 132.

Assoun (P.L). Raulet (G); Marxisme et – therorie et Theorie critique, Paris. Ed. Payot, 1978. P29.

Jay (M): L'imagination dialectique, – Histodire de lecole de Francfort (1923-1959); Paris, Ed Payot. Ed. Payot, 1977.

Ledmiral (J-R): Jurgen Habermas, ou – le changement de signe de la Theorie critique Revue Projet N 168, 1982.

Abensour (M): La Theorie critique: – une Pensee de lexil, Archives de philosophie 45, P. 1982. P 181.

Horkheimer (M): in Avant- Proposa – Martin jay: Limagination dialectique, op. Cit, P.7.

Bubner (R): Quest ce que la Theorie – Critique?, Archives de Pholosophie, 37, 1972. P. 382.

Desanti (J-T): Le philosophe et les – pouvoirs, Paris, Ed. Calmann- Levy, 1976, P.54

Brunet (P): Margarita philosphica in – greph; Qui peur dela philosophie? Paris, Ed. Flammarion, 1977, P.134.

Horheimer (M): Thorie critiqu e ; – Paris; Ed. Payot. 1978, P.355.

Horkhimer (M): Eclipse de la – Raison, Paris. Ed. Payot. 1974. P.172.

Ibid; P. 183. –

Horkheimer (M): Theorie criti q u e, – op. Cit. P. 259.

Ibid; P, 259. –

Marcuse (H): Philosophie et – Revolution, paris, Ed. Denoel, 1969. P.121.

Ibid, P,L. –

Ibid, P.L. –

Voir, Adorno (T): Marx est-il – depasse? Et Marcuse (H): Reexamen du concept de revoluion, Diogene, N 64, 1968.

Marcuse (H): Philosphie et – revolution, op, cit, P.17.

Ferry (L), Renaut (A); in – Presentation a Horkheimer (M); Theorie citique; op, cit, P.20.

Horkheimer (M); Theorie criti q u e, – op. Cit. P.119.

Horkheimer (M): Eciipse de la – Raison, op. Cit, P.68.

Adorno (T): Presentation a: D e – Vienne a Francfort; La querelle allemande des sciences sociales, Bruxelles Ed. Complexs, 1979. P.58.

Adorno (T): Dialectique nega t i ve, – Paris, Ed. Payot 1978. P.11.

Ibid, P11. –

Ibid, P12. –

Ibid, P22. –

Ibid, P22. –

Ibid, P8. –

Abensour (M): La Theorie crt i q ue: – une pensee d lexil? OP.cit, P.188.

Horkheimer (M): La didlectiqu e de – la Raison, Paris, Ed. Gollimard, 1971, P.10.

Jay (M): Limagiation dialectiq u e, – op. Cit, P.61.

Horkheimer (M): Eclipse de la – raison, op, cit, P.193.

Cassirer (E): La philosophie d e s – lumieres, Paris, Ed, Fayard, 1932. P.275.

Ibid, P.P.33. –

Ibdi, P.34. –

Kant (E): Critique de la Raiso n – pure, Paris, Ed. PUF. 1944; p.6.

Chatelet (F): Lhistoire de la – philosphie, TS, Paris, Ed, Hachette, 1973, P.212.

Horkheimer (M), Adorno (T): L a – dialectique de la Raison, op. Cit, P.27.

40–بەبڕوای فەیلەسووفەکانی تیۆری ڕەخنەیی ڕۆشنگەری تەنها فەیلەسووفەکانی سەدەی هەژدەیەم ناگرێتەوە، چونکە وەسفی ئۆفکلارۆنگ Aufklarung – بەلای ئەوانەوە– هەموو فیکرێکی پێشکەوتووخواز دەگرێتەوە، یا هەموو فیکرێك کۆشش بکا بۆ ئازادبوون و پێشخستنی دەزگاو پەیوەندیەکان.

– Horkheimer (M): Eclipse de la Raison, op. Cit, P. 32.

– Ibid, p.10.

– Horkheimer (M), Adoron (T): L a dialectique de la Raison, op. Cit, P.24.

– Marcuse (H): L Homme unidimensionnel. Paris. Ed de Minuit, 1968. P.22.

– Horkheimer (M), Adorno (T): L a dia lectique de ;a Raison, op. Cit, P. 43.

– Marcuse (H): L Homme....., P . 34.

– Horkheimer (M), Adorno (T): ...> P.42.

– Hokheimer (M): Eclipse de la Raison...,P.137.

– Ibid, P.144.

– Ibid, P.144.

– Zima (P): L Ecola de Francfor t, Paris, Ed. Universitaires, 1974, P.27.

52–بەهۆی سەرکەوتنی فاشیزم و، تێکەڵاوبوونی کرێکاران لەگەڵ سیستمی سەرمایەداریداو، پاشەکشێی بەهای ئەنتۆلۆژی تاکی لیبراڵی.. نوخبەی جوولەکەکانی ئەڵمانیا هەستیان بەکارەساتێکی گەورە کردو، هەندێکیان پەیمانگایەکیان دامەزراند بۆ شیکردنەوەی گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن، (بییێر زیما) لە کتێبی ناوبراودا تێبینی ئەوە دەکا کە فەیلەسووفەکانی تیۆری ڕەخنەیی بایەخیان بەو مەسەلانە دەدا چونکە کەسانێکی لیبراڵی بوون و، جوولەکەش بوون... (ل21).

– Marcuse (H): L Homme unidimensionnel, op. Cit, p.7.

– Ibid, P20.

Ibid, P20.

– Ibid, P27.

– Ibid, P30.

– Marcuse (H): Eros et Civilisat i o n, Paris, Ed de Minuit, 1986. P.9.

– Horkheimer (M), Adorno (T): L a ..., P. L63.

– Marcuse: (H): L Homme.....P. 8 2.

– Ibid, P.10a.

– Ibid, P.P.41-42.

– Ibid, P.43.

– Horkheimer (M): Theorie crtiq u e, op, cit. P.P.7-8.

– Assoun (P-L) Raulet (G): Marxisme....., P.7-8.

66–هوربرت مارکوز، "نحو التحرر ، فيما وراء الانسان ذو البعد الواحد" ترجمة: ادورا الخراط، بيروت: منشورات دار الآداب، 1972، ص40.

67–نفس المرجع، ص10.

شایانی ئامارە پێکردنە کە (دار الآداب) تەرجەمەی ئەم کتێبانەی مارکیۆزی بڵاوکردۆتەوە:

–مرۆڤی تاك ڕەهەند: وەرگێڕانی جورج تەرابیشی.

–ئیرۆس و شارستانیەت: وەرگێڕانی مەتاع سەفەدی.

–فەلسەفەی ڕەتکردنەوە: وەرگێڕانی موجاهید عەبدولمونعیم موجاهید.

– Chirpaz (F): Alienation et uto p i e, Revue Esprit, Janvier 1979.

– Horkheimer (M), Adorno (T): L a diaectigue de Raison, op, cit, P.45.

– Horkheimer (M): Eclipse de la Raison, op, cit, P. 185.

– Abensour (M): La Theorie Cri t i que: une pensee de lexil, op, cit. P.198.

**سەرچاوە:**

*ئەم بابەتە تەرجەمەی فەسڵی یەکەمی ئەم کتێبەیە: الحداثة والتواصل.. الفلسفة النقدية المعاصرة نموذج هابرماس، تأليف: محمد نورالدين أفاية. (ط2؛ بيروت: افريقيا الشرق، 1998)، ص 15– 45.*

❑

# هۆرکهایمەر و قوتابخانەی فرانکفۆرت

■ ئالان تۆرین

● و. لەعەرەبییەوە: بڕوا عەلائەدین

گرنگترین کۆمەڵە رۆشنبیرێك کە بۆ ماوەیەکی زۆرو بەهۆی دوورخستنەوەیانەوە کاریگەرییان زۆر سنووردار بوو، تەنها پاش گەڕانەوەیان لە تاراوگە کاریگەرییان بڵاو بۆوە، گرووپی پەیمانگەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی بوو کە ساڵی **1923** لە فرانکفۆرت دامەزراو هۆرکایمەر لە ساڵی (1931)ەوە تاکو گەڕانەوەی لە پاش جەنگەوە بۆ ئەڵمانیا بەڕێوەبەری بوو. (مارتن جای) و کۆمەڵە کەسێکی تریش مێژووی ئەم پەیمانگەیەو بیروڕای لێکۆڵەرەوە سەرەکیەکانیان نووسیوەتەوە. قوتابخانەی فرانکفۆرت لەو جیابوونەوەیەوە دەست پێدەکات کە لە نێوانی فیکرو پراکیس، کاری سیاسیو فەلسەفەدا هەیە. هۆرکایمەرو هاوەڵەکانی چۆن دەسەڵاتی بەلشەفیزمیان لە یەکێتی سۆڤیەت رەتکردەوە، وەهایش ئەو ریفۆرمیستە سۆشیال دیموکراتەیان رەتکردەوە کە لە کۆماری ڤایمەردا (Weimar) بوون.

لەبەر ئەوەی ئەمانە وەکو لۆکاش دەیویست باوەڕیان بەهیچ بزوێنەرێکی مێژوو نەبوو (نە حیزب و نە پرۆلیتاریا) کەوتنە رەخنەیەکی سەراپاگیر لە کۆمەڵگەی تازەو کلتوورەکەی بەتایبەتی. ئەمانە هێندە لە واقعیە کۆمەڵایەتی و سیاسیەوە دوور بوون، بەڕادەیەك کە خۆیان بەرەچەڵەك یەهوودی بوون و راونرابوون بۆ تاراوگە، بەڵام زۆر بەکەمی دەربارەی کێشەی یەهوودیەکان شتیان دەنووسی، تەنانەت ئەو شیکردنەوە گرنگانەی دەربارەی دژایەتیکردنی رەگەزی سامی بڵاویان کردەوە لە چوارچێوەی ئەو لێکۆڵینەوە بەناوبانگەدا بوو کە دەربارەی کەسایەتی دەسەڵاتخواز نووسیان نەوەك تایبەت بێت بە کێشەی یەهوودیەکان. ئەم لێکۆڵینەوەیەش هێندەی قەرزاری زانستە مرۆڤایەتیە ئەمریکیەکانە، هێندە مۆرکی رەنجی خۆیانی پێوە دیارنیە. رەنجێك کە لە (1944)ەوە دەستی پێکردو لە (1950)دا بڵاوبۆوە.

ئەمانە باوەڕیان وابوو لە جیهانێکدا دەژین کە جیهانی هەرەسهێنانی عەقڵی بابەتیە، واتە هەرەسهێنانی تێڕوانینێکی عەقڵانی بۆ جیهان. دەکرێ بڵێین ئەمانە خەفەتیان بۆ ئەو

سەرمایەداریە کۆنە دەخوارد کە هەڵگری بزووتنەوەی هەرە گەورەی عەقڵانیەت بوو. بەڵام جیهانی سەرمایەداری ئەمڕۆکە جیهانی قەیرانی ئابووری، جیهانی تایلوریزم و لەهەمان کاتدا جیهانی ستالینیزم و نازیەتە، لەتێڕوانینی ئەمانەدا جگە لە جیهانی هێزی پارە کە بەبێ پرەنسیپێکی بالای عەقلانی هەوڵ بۆ بەرژەوەندی مادی دەدات، هیچی دیکە نیەو ئەمەش دەبێتە مایەی روخاندنی ژیانی عەقڵ. تاکگەریی دوژمنی عەقڵە وەك وێنەیەکی جەوهەریی بوون، عەقڵی زاتی هەر لە لۆك و سودگەریەکانیشەوە تەنها سەرقاڵی بەکارهێنانی ئایدیۆلۆژیاکانە لە خزمەتی قازانجدا وەك ئەلتەرناتیڤی بیروڕاکان.

هەروەها سەرکەوتنی تایبەتمەندیەکان و لە پێش هەموویانەوە ناسیۆنالیزم لە جێگەی گەردوونیبوونی سەردەمی رۆشنگەری دادەنێ. ئیدی ئەو پەیوەندیەی نێوان تاك و کۆمەڵگە بزربوو کە عەقڵ زامنی بوو. ئەم دابڕانەش لە سەردەمی سوکراتەوە دەستی پێکردو، پاشتر لە سەردەمی تازەدا بەتایبەتی لەگەڵ کەسایەتی (هاملێت)دا زیادی کرد. بەڵام لەسەدەی بیستەمدا هەموو شتێکی گرتەوە. ئیدی مرۆڤی تازە پەیرەوی بنەما گەردوونیەکانی عەقڵی نەدەکرد.

هۆرکایمەر لە کتێبەکەیدا (رەخنەکردنی عەقڵ ئامێری) دەڵێ: بۆ ماوەیەکی زۆر وشەی عەقڵ بریتی بوو لە چالاکی ناسینی بیروڕاو ئەمرەکان و تێگەیشتنیان، هەر ئەمەش ئامانجی مرۆڤ بوو. بەڵام ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە رۆڵ و کاری سەرەکی عەقڵ بریتیە لە گەڕانی هەر تاکێك بەدوای دۆزینەوەی ئامرازێکی گونجاودا بۆ بەدیهێنانی ئامانجێك لە ساتێکی دیاریکراودا. هۆرکایمەر فیبەر بەوە تاوانبار دەکات کە باوەڕی وایە عەقڵانیەتی وەزیفی بەسەر عەقڵانیەتی بابەتیو سەرکەوتنی عەقڵ ئامێری دەگەیەنێ. (ڤالتەر بنیامین Walter Benjamin)یش کە یەکێکە لە هاوەڵەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت هەمان بڕوای هەیەو پێی وایە دەبێ ئەزموونێکی داهێنەرانە بخەینە جێگەی ژیانی رۆژانە. چونکە کاتێ تاك واز لە عەقڵ دەهێنێ دەبێتە پاشکۆی دەسەڵاتی سیاسیو ئابووری، ئامرازەکانیش دەچنە جێگەی ئامانجەکان، لە کاتێکدا تیۆرەکانی عەقڵی بابەتی ئامانجیان پێکهێنانی سیستەمێك بوو هەموو بوونەوەرەکان بگرێتەوەو رێکیان بخات، چ جای مرۆڤ و ئامانجەکانیشی، وە دەشی پلەی عەقڵانیەت لە ژیانی مرۆڤدا بە پێی پلەی گونجانی ژیان لەگەڵ ئەم گشتگیریەدا دەستنیشان بکرێ (عەقڵ گیران، وەرگێڕانە فەرەنسیەکەی، لا14).

نەهێشتنی ئەفسوون لە جیهانی هاوچەرخدا تەنها بە نەمانی ئەفسانەو شتە پیرۆزەکان نایەتەدی وەك ئەوەی ماکس فیبەر ئەیبینی، چونکە ئەفسانەو شتە پیرۆزەکان لە بنەرەتدا خۆیان بەرهەمی عەقڵن، بەڵکو ئەوەی کە مرۆڤ بە ڕاستی لە دەستی داوە یەکێتی جیهانە. دەبێ مرۆڤ ئەو ئازادیە پۆزەتیڤە بەدوور بزانێ کە هەریەك لە هیگڵ و مارکس لە پێناوی مرۆڤدا خەونیان پێوە دەبینی، نابێ تەنیا بەو ئازادیە نێگەتیڤەشەوە بوەستێ کە لۆك و کانت بەرگرییان لێدەکرد، ئەو ئازادیەی تاکەکان لە کاریگەری دەسەڵات دەپارێزێ.

ئازادی پۆزەتیڤ بریتیە لە توانای رەفتارکردن بە پێی یاسا گەردوونیەکانی عەقڵ، هەروەها بە پێی دەربڕینی هۆرکایمەر لە ساڵی (1942)دا ئازادی پۆزەتیڤ بریتیە لە شاری (polis)ی یۆنانی بەڵام بەبێ کۆیلایەتی.

هۆرکایمەر بە چەند وشەیەك ئیدانەی بزووتنەوەی بەدیهێنانی خودی کرد لە سەردەمە تازەکاندا کە مژدەدەر بوون بۆ هاتنی میشیل فۆکۆ: رێنسانسی خود لە سەر حسابی دان نان بە دەسەڵاتدا وەك پرەنسیپی هەموو پەیوەندیەکان دێت (دیالەکتیکی ملکەچی، لا26–27). هەموو فەلسەفەکانی خود بەرەو ملکەچیمان دەبەن. هیچ شتێکیش لەوە ترسناکتر نیە بانگەشە بۆ تاکگەرییەکی بێپەروای وا بکەیت کۆمەڵگە رێکبخات کە رەوشتی ئەبستراکت بخاتە تەنیشتی توندوتیژیەوە بە پێچەوانەوە، وەك هۆرکایمەر لە (عەقڵ گیران)دا دەڵێ: (تاکی پێشکەوتوو بە شێوەیەکی تەواو، بریتیە لە رێکوپێکی کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو بە شێوەیەکی تەواو) (لا144). مێژووی مۆدێرنیتی مێژووی دابڕانێکی لەسەرخۆو حەتمی نێوان تاك و کۆمەڵگەو سروشتە.

ئۆگەستینیزم بەسەر تۆماویزم و مەسیحیەتدا سەرکەوت و، هەر لەوکاتەوە پشتگیری لە سەرکەوتنی تاکەکەس دەکردو سوودی لەمە وەردەگرت بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵات لە پێناوی بڵاوکردنەوەی رەوشت و لێرەوە بۆ ملکەچ کردنی تاك بۆ کۆمەڵگە. تاکی دابڕاوی ئەم کۆمەڵگەیەش بەهۆی لەبەریەك هەڵوەشانی خێزانەوە، دەکەوێتە ژێر رەحمەتی دەسەڵاتە کۆمەڵایەتیەکانەوە، وەك ئەو بینەری سینەمایەی کە پیشەسازیە کلتووریەکان گەمەی پێدەکەن، بەڵام شانۆ پێویستی بە عەقڵە، لە کاتێکدا سینەما بەڕادەیەکی زۆر خێرا دەڕوات کە بوار بە تێڕامان نادات. بەبڕوای هۆرکایمەر چالاکی عەقڵ بریتیە لە تێگەیشتن لە سیستەمی جیهان نەوەك جووڵەی جیهان. سینەماش ئەو ماوانە رەتدەکاتەوە کە کارە گەورەکان لە شانۆگەری‌و مۆسیقادا دەیخولقێنن و، ئامانجی سەرەکیشی تواندنەوەی تاکە لەناو جەماوەردا. راستە (لیولوینتالLeo Lowenthal) لەو نووسینانەیدا کە ساڵی (1961) بەناوی (ئەدەب و کلتووری میللی و کۆمەڵگە)وە بڵاوی کردنەوە وا دەرکەوت زۆر سەختگیر نیە، چونکە ئەو پێی وابوو لە سینەماو کلتووری جەماوەردا هەستکردن بە شادی هەیە، لە کاتێکدا هەموو فەیلەسووفەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت کلتووری جەماوەر بە ئامرازێك دادەنێن کە لە خزمەتی سەرکوتکردندایە نەوەك بالانمابوون. لێرەوە کلتووری جەماوەری ئامرازێکی دەست بەسەرداگرتنە.

ئەم بیروبۆچوونە تەنها بەرەو رەخنەکردنێکی گشتی مۆدێرنەمان نابات، بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا خۆی وەکو مێژووی وازهێنانێکی لە سەرخۆ لە بۆچوونی گەشبینانەی مارکسیزم نیشان دەدات. پێش ساڵی 1933 هۆرکایمەر وەکو مارکس باوەڕی وابوو کارو بەرهەمهێنان ئیش بۆ سەرکەوتنی عەقڵ دەکەن کە ئەمە خۆی ناکۆکە لەگەڵ قازانجی سەرمایەداریدا. کەواتە مێژووی سیاسی بریتیە لە مێژووی وازهێنان لەو کۆسپە کۆمەڵایەتیانەی دێنە بەردەم سەرکەوتنی عەقڵ، بەڵام دەستەوسانی بزووتنەوە کرێکاریەکان و پاشتر لەناوچوونیان و بەدوای ئەویشدا سەرهەڵدانی ستالینیزم لە جێی نازیزم وەك فاکتەرێك بۆ وێرانکردنی هەردوو بزوێنەرە مێژووییەکە، هەموو ئەمانە وایان لە هۆرکایمەر کرد مەملەکەتی پێویستی بە باشتر بزانێ و واز لە هەر وێنەیەك بهێنێ کە بۆ مەملەکەتی ئازادیی دروستکردبوو.

ئەم وازهێنانە یەکێکە لە خەسڵەتەکانی تیۆرەی رەخنەگرانە کە نکوڵی لەوە دەکات تیۆرەیەکی پۆزەتیف بێت بۆ ئازادی‌و رزگاربوون.

ەحەڵ هۆرکایمەردا ئەو تەوژمە مێژووییە پاکتاوکرا کە متمانەی بەڕەوتی ئازادیو خۆشبەختی هەبوو لەبەرئەوەیش کە هۆرکایمەر نایەوێ دەستبەرداری ئەو ئومێدە بێت کە بە رۆشنگەرییو عەقڵی هەبوو، پێی وایە ئەم عەقڵە کاتێ تاک ئازاد دەکات و وێرانیشی دەکات، چونکە دەیکاتە پاشکۆی پێشکەوتنی تەکنیکی. لێرەوە ئەوکاتەی عەقڵئامێری زاڵ دەبێ خودگەرایی تێکدەشکێ.

رەخنەی هابرمازیش لە هۆرکایمەرو ئادۆرنۆ ئەوەیە کە خۆیان لەناو رەشبینیەکدا زیندانی کردووە بەوەی عەقڵی وەکو ئامێرێك دەبینن. بەڵام تێڕامانە سەرەکیەکانی هۆرکایمەر پەیوەندیان بە سەرکەوتنی تەوژمی تەکنیکیەوە نیە، بەڵکو پەیوەستن بە سەرکەوتنی ئەو دەسەڵاتە تۆتالیتاریەوە کە کۆمەڵگە دادەبەزێنێ بۆ ئاستی وەرشەو سەربازگەیەکی زۆرەملێ، ئەم تەماهیەتی نێوان عەقڵ و تەوژمی تەکنیکی و دەسەڵاتدارێتی رەها پرەنسیپی سەرەکی فیکری هۆرکایمەرەو لە پشت فیکری هەر ئەندامێکی قوتابخانەی فرانکفۆرتیشەوە پەنهانە، سەرەڕای جیاوازیەکانی نێوانیان.

تەنها بەرگریەکی شیاو کە دژی ئەم زاڵبوونەی دەسەڵاتی تەکنیکی هەبێ، لەناو فیکر خۆیدایە. نە رەوشت، نە یاساو نە هونەر لەم لەبەریەکهەڵوەشانە رزگاریان نابێ. تەنها فیکر دەتوانێ لە چەپۆکی دەسەڵات رزگاری ببێت (فیکر بە مانای ئەزموونکردن واتە توانای دروستکردنی گرفت Denken، هەروەها بەمانای ئەزموونکردن واتە دووبارە بەرهەمهێنانەوە لە پرۆسەیەکدا کە مەحکومی دیاردەکانە)، ئەمەش هیچ لەبەردەمی ئەو کەسانەدا ناهێڵێتەوە، کە پشت و پەنای لێهاتوویەکی کلتووریان نیە.

ئێستا با چاو بە هەردوو هێڵی سەرەکی ئەم رەخنەیەدا بخشێنینەوە. بە پێی هێڵی یەکەمیان تەوژمی پیشەسازی لەناو هەناوی خۆیدا کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی هەڵگرتووە، تەنها لە ئاکامی تایلۆریزمەوە نا، بەڵکو لە ئاکامی نازیەت و ستالینیزمیشەوە کە کۆمەڵگە دەگۆڕن بۆ کارگەیەکی گەورەو دیسپلینێك بەسەر هەموو لایەنەکانی ژیانی گشتیدا دەسەپێنن کە لە دیسپلینی کارگەکان دەچێت. زیاد لە جارێکیش ئادۆرنۆ و هۆرکایمەر داخیان بۆ جیهانی بازرگانی کۆن خواردووە کەتێیدا چالاکی ئابووری پشتی بە حسابکردن و پێشبینی کردن (واتە چالاکی عەقڵ) بەستبوو نەوەك کۆنترۆڵکردنی ئەوانی تر. چەندە سەرمایەداری پێشدەکەوێ هێندەش فیکری عەقڵانیو هەست و سۆزو مرۆڤایەتی پاشەکشێ دەکات. نموونەی کۆمەڵگەی تازە ئەوەیە کە مارکیز دوساد لە رۆمانی (جۆلیت)دا پێشکەشی دەکات: ئافرەت -سروشت دەبێتە ملکەچی پیاو- عەقڵ کە لە پێناوی چێژدا خۆشەویستی لە بیرچۆتەوەو جگە لە کۆمەڵێ ئامانجی ئامرازگەری هیچ ئامانجێکی تری نیە.

زۆر سەرم دەسوڕمێ کە دەبینم ئەم بیروڕایانە قبوڵکراون. راستە میتۆدەکانی تایلۆریزم و فۆردیزم بۆ بەرهەمهێنان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەت و فەرەنساو ئەڵمانیای نازیزمدا بەکارهێنراون، هەروەها راستە کۆنترۆڵێکی پیشەییو کۆمەڵایەتیان بەسەر هەموو کرێگرتەکاندا سەپاندووەو لە بەرامبەریا بزووتنەوە کرێکاریەکان سەریان هەڵداوەو بەرگری رەمەکیانەی کرێکارانیان رێکخستووە. بەڵام تەنها ئەمە بەرپرسیار نین لە سیستەمە سیاسیە ستەمگەرەکان (دێسپۆتیزمەکان)، چونکە ئەم

میتۆدانە لەچەند سیستەمێکی جیاوازو هەمەچەشندا بەکارهێنراون.

بیرۆکەی ئەوەی کۆمەڵگە ببێتە کارگەیەکی گەورەو کەسی بەرخۆ ببێتە بابەتی سەرکوتکردن و گەمەپێکردن وەك کرێکارێك، بابەتی کەسێکی ئەخلاقیە و کۆمەڵناسێك ناتوانێ قبوڵی بکات. مەحاڵە ئەم جۆرە رەخنە ئەرستۆکراتیانە لە کۆمەڵگەی جەماوەر قبوڵبکرێ، وەك ئەوەی بڵێی گەیشتنی زۆرینە بە بەرهەمهێنان و فێرکردن و بەرخۆری بەرەو ئاستێکی نزممان ببات و سیستەمە ستەمگەرەکان بخولقێنێ. دەمێکە مێژوونووس و کۆمەڵناسەکان هەڵەی ئەوانەیان سەلماندووە کە نازیزم وا لێکدەدەنەوە گوایە لە رەگوڕیشەوە کۆمەڵگەی جەماوەری پیشەسازی و ئاوەدانی هەڵکێشاوە، لە کاتێکدا بە پێچەوانەوە ئەو بەشانەی پەیوەست بوون بە رەگوڕیشەی کۆمەڵگەی پیشەسازیەوە، بەوپەڕی حەماسەوە پاڵپشتی دیکتاتۆریەتیان کردووە.

دەبێ واز لەو باوەڕە بهێنین کە پیشەسازی بە بەرپرسیار دەزانێ لە ئاژاوەو توندوتیژی لە سەدەی بیستەمدا. دیارە هیچ شتێك رێگر نیە لەبەردەم ئەوەدا کە رەخنەگرتن لە کۆمەڵگەی پیشەسازی هاوشانی بیرۆکەی پێشکەوتنە. بەڵام هەڵەیە وابزانین هەموو رەگەزەکانی کۆمەڵگەی مێژوویی پەیوەستن بە یەکەوە. تەنها تەفسیر بۆ پەرەسەندنی فیکرێکی رەخنەیی رووت، بە تایبەتی ئەو بیرۆکەیەی دەڵی دەبێ کۆمەڵگەی تازەو پیشەسازی هەردوو وەکو یەك پارچە رەت بکرێنەوە، دەگەڕێتەوە بۆ بزربوونی ئەو بزوێنەرە مێژووییانەی توانای گۆڕینی لایەنە گرنگەکانی ئەم کۆمەڵگەیەیان هەیە.

ڤالتەر بنیامین لە لێکۆڵینەوەکەیدا دەربارەی کتێبی (ئارەزووە هەڵبژاردەکان)ی گۆتە دەنووسێ: (بێهیواکان هیوایان بە ئێمە بەخشیوە) [کارەکانی ڤالتەر بنیامین ا، ئەفسانەو توندوتیژی، ل260]. ئەم دەستەواژەیە زۆر ترسناکە: ئایا دەبێ بەوە ڕازی بین کە تاوەکو رۆشنبیران لە جیاتی کرێکارو کۆلۆنیکراو و هەژارە بێ دیفاعەکان بەرگری نەکەن، هیچ کام لەمانە ناتوانن ببنە بکەری مێژوو؟ ئایا بەپێی ئەم قسەیە نەبوو کە رۆشنبیرە شۆڕشگێڕو پێشڕەوەکان خۆیان کردە زمانحاڵی ئەو گەلانەی بەشێوەیەك نامۆبوون کە نەیاندەتوانی تەعبیر لە خۆیان بکەن؟ ئەگەر کرێکاران لە قوربانی زیاتر نەبن ئەوا دیموکراسیەت مەحاڵە؛ کەواتە دەبێ مل بۆ دەسەڵاتی ئەو کەسانە کەچ بکرێ کە پەیامی ژیانیان بریتیە لە تێگەیشتن و دەستێوەردان.

بەم پێیە ئەو دووریەی بە بۆچوونی تایلۆریزم لەنێوان بیرکەرەوەو ئەنجامدەرەکاندا هەیە تەنها یاریەکی منالآنەیە لەچاو ئەو دووریە بێ پایانەی لەنێوان گەل و ئەو کەسانەدا هەیە کە خۆیان بە بیریاری ناو مێژوو دەزانن. بیرۆکەی سەرەکی دووەمی ئەم بیروبۆچوونە رەخنەییە بریتیە لەوەی بانگەشەکردن بۆ خودگەرایی بەرەو ملکەچی تاکمان دەبات لە بەردەم دەسەڵاتدارانی کۆمەڵگەدا، وەك ئەوەی تاك بێ هیچ پشت و پەنایەك لەلایەن خودا یا لۆگۆسەوە جێهێڵرابێت و لەپەرەیەکی بۆش زیاتر نەبێ کە هێزە باڵادەستەکان بەرژەوەندیەکانی خۆیانی تیا تۆمار دەکەن. بەڵام بۆچی ئەو بیرۆکەیە بە دوور بزانین کە تاك دەتوانێ شتێکی جیاواز بێ لەوەی تەنها بەرخۆرێك بێت ولە پێناوی ئازادیو توانای خۆیدا بتوانێ لە پەیوەندیەکی کلتووری و فیکریدا پەیوەندی لەگەڵ تاکێکی تردا ببەستێ؟ من پێم وایە ئەم جۆرە دەربڕینانە زیاتر دەبنە مایەی

کێشە دروستکردن نەوەك کێشەکان چارەسەربکەن. بەلام من پێم قبولْ ناکرێ تاکگەرایی کورتبکرێتەوە بۆ گەمە پێکردن و بەرخۆریەکی نێگەتیڤ.

مرۆڤ زۆر ملکەچی ئەوانە بووە کە بەناوی خوا یا عەقلْ یا مێژووەوە قسەیان کردووە. ئەوانەی داخ بۆ نەمان و بزربوونی ئەو پرەنسیپانە دەخۆن کە لە پشتیی کۆمەلگەوەن، بەچ هەقێ پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە تاك ناتوانێ ببێتە خودێکی داهێنەر بۆ خۆیو شێوە جۆراوجۆرەکانی پەیوەندی لەگەلْ خۆیو ئەوانی تردا بخولقێنێ؟ هۆرکایمەر لەبەر نەمانی متمانەی بە مارکس و هیگلْ تەرمی مێژوو بەڕێ دەکات و جگە لە هاتوهاوار و توندوتیژی هیچی دیکە لە مۆدێرنەدا نابینێ. رووش دەکاتە بوون و عەقلْی بابەتی کە هەردووکیان سیستەمی جیهان دەپارێزن، لە کاتێکدا مۆدێرنیتی بریتیە لە وێرانکردنی بوون ئەویش بە راکێشانی بۆ ناو جوولەیەك کە پێویست نیە. بێگومان ئەم رەشبینیە هەلقولاوی ئەو بێهیواییەیە کە تراژیدیای ئەلمانیای لەسەردەمی ژێردەستی کەسێکی نازی وایلێکردووە ناواقعی بێت. هۆرکایمەر لەم پەرەگرافەدا باسی ئەم بوونە دەکات: سووکایەتی کردنی فرۆید بە مرۆڤ یەکێکە لە دەرکەوتەکانی ئەو خۆشەویستیە بێ ئومێدانەیەی لەوانەیە تەنها فۆرمێکی ئومێدە کە رێگەمان پێدراوە پەنای بۆ ببەین. [لە کتێبی زانستی کۆمەلایەتیو ئاراستە کۆمەلایەتیەکان لە دەروون شیکاریدا)].

تا ئێستاش قوتابخانەی فرانکفۆرت کاریگەریەکی مەزن و گەورەیان هەیە، چونکە ئەو کۆمەلگەیەی بەرهەمهێنان و بەرخۆریی پەیوەندی جەماوەری تیایە تاکەکان کورتدەکەنەوە بۆ نمایشکردنی کۆمەلێ رۆلْ کە ئەوانی تر بۆیان دیاریکردوون. ئەم فۆرمە تازەیەی پاشکۆیەتی تەواو جیاوازە لە پاشکۆیەتی ئەو کۆمەلگە تەقلیدیانەی کاتی خۆی تاکیان ملکەچی رێساو سرووتە قورسەکان دەکرد. بەلام دەبێ دان بەوەدا بنێین کە ئەم فۆرمە تازەیەیان کەمتر ناچارکەرە. وێنەی کۆمەلگەی ئامێری زیاتر خۆی لە بۆچوونە کۆنەکانی زانستدا دەبینێتەوە نەوەك دەربڕینە تازەکانی ئێستای. هۆی سەرەکی رەشبینی هۆرکایمەرو هاوەلەکانی دەگەڕێتەوە بۆ بزربوونی و لادانی بکەرە مێژووییەکان بەتایبەتی لە ماوەیەکی ئەلمانیادا کە بەهیچ جۆرێك ناتوانین باسی بزووتنەوە کرێکاریەکان بکەین.

لەلایەکی تریشەوە رەوا نیە دیکتاتۆرەکانی کرملین ناوبنێین رێبەرەکانی پرۆلیتاریا. بەلام ئایا ئەو وێنەی ئەمانە بۆ کۆمەلگەی دروست دەکەن وێنەی لایەنێکی تاریکی بێبەش نیە لە بکەرو بزووتنەوە کۆمەلایەتیو دیموکراتیەکان؟ ئایا لە جیاتی رەتکردنەوەی ژیاری تەکنیکی باشتر نیە رەخنەکردنی کۆنترۆلی کۆمەلایەتیو رەخنەی سیاسی لە پێناو تێکشکاندنی دیموکراسیەتدا بەرەو مەودایەکی دوورتر ببرێت؟ داخی هۆرکایمەر بۆ ئومێدە گەورەکانی تەوژمی مێژووییانەی هیگلیزم کەمترە لەداخی بۆ سەقامگیربوونی جیهانێکی بۆرژوازی کە لەسەر پرەنسیپی متمانەکردن بە عەقلْ و زانست راگیربووە.

ئەو تیۆرە رەخنەییەی قوتابخانەی فرانکفۆرت دایڕشت و پاشتر وەك پالپشتی تیۆری لەلایەن زۆربەی ئەوانەوە بەکارهێنرا کە رووبەڕووی سەرمایەداری گەورە بوونەوە، بەتایبەتی ئەوەی ئەلمانیەکان ناوی دەنێن سەرمایەداری دوایی **Spat Kapitalismus**، کە

زیاتر هەوڵ دەدات دەسەڵاتی سیاسیو دەسەڵاتی ئابووری بەیەکەوە کۆبکاتەوە، بەڵام لە پشت تێکەڵکردنی رەخنەی کۆمەڵایەتیو رەخنەی رۆشنبیریەوە بەهەڵە تێگەیشتنێکی ترسناك هەیە. ئەتوانین بڵێین تارادەیەکی زۆر لە فیکری هۆرکایمەردا رەخنەی کۆمەڵایەتی ونە، لە کاتێکدا بە ئاشکرا رەخنەی کلتووری لە نووسینەکانی هۆرکایمەرو ئادرۆنۆو کارەکانی (تۆماس مان)ی هاوچەرخیاندا دەبینین. ئەو رۆحی رۆشنگەریە وێران بوو کە تێیدا تاکگەرایی پەیوەست بوو بە عەقڵەوەو، ئازادی پەیوەست بوو بە دۆگمای فیکر نقومکردنی زانستەوە لە ئاژاوەدا. ماکس فیبەریش دوودڵی خۆی بەرامبەر ئامانجەکانی عەلمانیکردن دەربڕی، بەڵام بەر لە هەر شتێك هەر بە تازەگەرو لیبرالی مایەوە.

هۆرکایمەریش متمانەی بەو عەقڵ ئامێریە نەما کە فیبەر پێوەی پابەندبوو، چونکە ئەم لە جیهانێکدا ژیا کە ئاگری جەنگی تیاهەڵگیرسا، لە کاتێکدا فیبەر لە کۆتایی ژیانیدا نەبێ رووداوە گەورەکانی وەکو جەنگی جیهانیو لێکهەڵوەشانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی ئەڵمانی نەبینیبوو. رەشبینی قوتابخانەی فرانکفۆرت لە شتێکەوە هاتووە ئەویش ئەوەیە کە فەیلەسووفە یەهوودیەکانی ئەم قوتابخانەیە زۆر بە قووڵی لە دارمانی ئەو ژیارە تێگەیشتبوون کە یەهوودیەکان بەویستی خۆیان تێکەڵی بووبوون، ئەمەش وای لێکردن رووەو چالاکیە گەردوونیەکان رێ بگرنەبەر، مەبەست: زانست و هونەرو یاساو تێرامانی فەلسەفیە. ئەمڕۆ ئێمە ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرتمان وەکو شایەت بۆ گرنگە نەوەك شیکەرەوەی بارودۆخەکان. سۆزی ئەوان بۆ عەقڵانیەتێکی مام ناوەند (عقلانیە معتدلە) پێمان دەڵێ ئەو جیهانەی دەیانویست پێی بگەن بە راستی دیارنەماو ئیدی ناشێ بنەمایەك هەبێ بۆ یەکێتیەکی دیاریکراو لەنێوان جیهان و مرۆڤ و نێوان سیستەمی سروشت و جوڵەی مێژوودا. لەکاتێکدا کۆمەڵگەی پیشەسازی بە تەکنیك و بەشداری جەماوەرەکەیو سیستەمی پەیوەندیەکانیەوە، وە بەهۆی کۆمەڵێ دژواریی تراژیدیو سەرکەوتنی بێوێنەوە خۆی بونیاد دەنێو لەگەڵ خۆیدا برێکی زۆر گرفت دەهێنێ.

کۆمەڵێ گەورە رۆشنبیری ئەورووپی هەر لەو ئەڵمانیانەوە کە لەسەردەمی هیتلەردا پەنایان بۆ ئەمریکا برد تا فەرەنسیەکانی شەست و حەفتاکان رێگەیەکیان گرتەبەر کە تەواو دوورە لە شارێگەی پیشەسازیەوە، ئەمانە بە بیرۆکەی بزربوونی عەقڵ و بیرۆکەی ئابووریی دەسەڵاتی رەها رووبەرووی مۆدێرنە بوونەوە. هیچ چارەسەرێکی جێی متمانەیان نەدۆزیەوە، لە بری ئەوەی بانگەشە بۆ سیاسەت بکەن، بەدوای ئەزموونی ئیستاتیکیو بانگەشەی ئیستاتیکیدا دەگەران بۆ ئەو هێزە پەراوێز نشینانەی دووربوون لەو بۆگەناوەی مۆدێرنەو شێوەکانی کۆنترۆڵی مۆدێرنە بڵاویان دەکردەوەو کاری تێ نەکردبوون.

نەمانی ئەو رۆحی خەباتەی لە واقعی کۆمەڵایەتیدا بەدیدەکرا، بەتایبەتی پاش سەرکەوتنی ستالینیزم و گۆڕانی زۆر لە بزووتنەوە ئازادیخوازەکان بۆ دەسەڵاتی سەرکوتکەر، وایکرد لە ناوەڕاستی سەدەی بیستدا هێزو برەوێکی تایبەت بەم جۆرە فەلسەفەیە بدات کە فیکر لە کردەی کۆمەڵایەتی جیادەکاتەوە بۆ قەرەبوو کردنەوەی نەمانی ئەو رۆحی خەباتە. چەندە گرفتەکانی کۆلۆنیالیزم و فەرمانڕەوایی تۆتالیتاریزم کێشەکانی کۆمەڵگەی پیشەسازیان بشاردایەتەوە، هێندە دەنگی ئەم

تیۆرە رەخنەییە باوەڕپێکەرتر بوو، هەروەها ڕووبەڕووی ترسنۆکی ئەو کەسانەش دەبۆوە کە بەناوی پرۆلیتاریاو گەلانی چەوساوەوە لەگەڵ دیکتاتۆرە تازەکاندا خۆیان دەگونجاند.

بەلام ئەم دوژمنایەتیە بەرامبەر بە مۆدێرنیزم لەگەڵ خۆیدا شیکردنەوەیەکی واقیعی نەهێنا بۆ کۆمەلگەی تازەو کۆمەڵناسیش بەهۆی ئەم تەوژمە رادیکاڵیە نامەسئولەوە ئیفلیج بوو بەرامبەر لێکۆڵینەوەی لە پراکیسە کۆمەلایەتیەکان. بەدرێژایی دەیان ساڵ وێنەی کۆمەلگەیەکمان پێشکەش کرا کە لۆجیکی دووبارە بەرهەمهێنانەوەی سیستەمێکی کۆمەلایەتی زاڵ بوو بەسەریا، کە لە ناویدا ئەو دەزگایانەی جڵەوی کۆمەلایەتیو رۆشنبیریان کردبوو لەوپەڕی هێزدا بوون. لە سەرەتای ئەم ماوە درێژەی تیۆری رەخنەییدا خۆمان لەبەردەم دیمەنێکی تەواو گۆڕاوی گرفت و گفتوگۆو بزووتنەوە تازەکاندا دەبینین.

لەم جیهانەدا کە گوایە بکەرەکان بزربوون، دەبینین سەرلەنوێ بکەرەکان لە هەموو شوێنێکەوە سەرهەڵدەدەنەوەو بەهەموو یۆتۆپیاو ئایدیۆلۆژیاکانیانەوە، بە تووڕەیی و گفتوگۆکانیانەوە دێنەوە ناو ئەو گۆڕەپانە جەماوەریەی فەیلەسووفانی فرانکفۆرت و بەدوایاندا هابرماز پێیان وابوو ئەو پەنجەرەی ئازادیەی داخست کە لە کۆمەلگەی بۆرژوازیدا بەدەست هاتبوو. بەلام ئەوەتا سەرلەنوێ ئەو پەنجەرەیە دەکرێتەوەو هەرچەندە ئەمە گرفتەکان چارەسەر ناکات و گفتوگۆکانیش بەلادا ناخات، بەلام لە هەمان کاتدا وامان لێدەکات قبوولکردنی تەوژمێکی دژ بە مۆدێرنیزم، کە هاوسۆزی عەقلی بابەتیە، بەکارێکی قورس بزانین.

ئایا ئەم موفارەقەیە چ مانایەك دەگەیەنێ جگە لە ئیدانەکردنی رۆشنبیران خۆیان؟ رۆشنبیرانیش وەکو ئەو پیاوە ئاینیانەی بەناوی خواوە قسەیان دەکرد، بەناوی عەقڵ و مێژووەوە قسەیان دەکرد. بەلام کاتێ گۆڕەپانی جەماوەری جیهانی فراوان بوو، وە سیستەمە تۆتالیتاریەکان چوونە جێی دیسپۆتیزمی کۆن (کە خۆی سیستەمێکی سنووردار بوو). هەروەها لەو کاتەشدا کە بزووتنەوە جەماوەریەکان رێکدەخران و دەنگی کۆبوونەوە جەماوەریەکان دەبیسترا، رۆشنبیران وەکو پیاوانی ئاین کلیلی دەسەلاتە ئۆلیگارشیەکەی خۆیان لە دەست دا. رۆشنبیران بەرهەڵستی بەرهەمهێنان و بەرخۆریو ئەو رۆشنبیریە جەماوەریەکان دەکرد، چونکە هەموو ئەمانە لەوە بێبەشی دەکردن قسەکردن بۆ خۆیان قۆرخ بکەن و، هەر ئەمانەش ئەو خۆ بەدەستەبێژرزانیەی لێ سەندنەوە کە لە سایەیدا گەشەیان بەتێڕامانەکانیان دەداو تێدەکۆشان.

وەك چۆن لە پاش شۆڕشی فەرەنسیەوە ڤۆلتێر شتێکی نامومکین بوو، بەهەمان شێوە لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا تیۆرەی رەخنەیی شتێکی نا مومکینە. چونکە هەر کاتێ پراکیسە کۆمەلایەتیەکان و کایەی کارکردنی بکەرە کۆمەلایەتیەکان فراوان بوو، ئیدی قورسە مرۆڤ لە دەرەوە سەیری کۆمەلگە بکات و لەسەر لقێکی درەختی داهێنان یا عەقلی یان مێژوو دابنیشێ، ئەو درەختەی رەگوڕیشەکەی لە ئاسماندایە نەوەك لە زەوی.

ئەوەی لە سەدەی بیستەمدا رۆشنبیرانی ئەڵمانی و فەرەنسی خۆیانی بۆ پرسەبارو رەشپۆش دەکەن ئەو ئاسمانەیە کە تیایدا لە دایك بوون و بیری دەکەن، ئاسمانێك کە دەیانکاتە کۆمەڵێ مرۆڤی جیاوازی وا کە

جەوهەرێکی بڵندتریان هەیە لەوانی تر چونکە ئەمان لەموتڵەق یا لە بووندا دەژین. لە کاتێکدا مرۆڤە ئاساییەکان بە ئاسانی و خێرایی دەگۆڕین لەگەڵ ڕەوتی شەپۆلە جیاجیاکانی گۆڕاندا. دەبێ گوێ بیستی دەنگی نارەزایی ڕۆشنبیران بین دژی نەمانی ڕۆڵیان وەکو پیاوە ئاینیە عەلمانیەکان، دەشبێت لە هەمان کاتدا ڕەتی بکەینەوە. دەبێ گوێبیستی بین چونکە وەکو نێچە بەر لە هەرکەسێك تێگەیشتووە گەورەترین مەترسی مەترسی سوودگەریە، فەیلەسووفانی فرانکفۆرتیش ڕاست دەکەن کاتێ ئەوەمان بیردەخەنەوە کە ئەمرۆ گەڕانەوە بۆ پێویستیەکانی مرۆڤ، بۆتە زمانی دەسەڵات. لە هەمان کاتدا دەبێ ڕەتیش بکرێنەوە چونکە هیچ شتێك نیە کە پاساو بۆ بیرۆکەی جیهانێکی داخراو بهێنێتەوە کە تێیدا دەسەڵات وەکو گازێکی ژەهراوی‌و بێ هیچ بەرهەڵستیەك بڵاو دەبێتەوە. نەك لەبەرئەوەی ئەوروپا لە سەدەی بیستدا ئۆردوگای گرتووخانەکان و سیستەمە تۆتالیتاریەکانی بەخۆیەوە بینیوەو ئیتر ئەمە مافی ئەوەی بداتێ کۆمەڵگەی بەرخۆریی گەورەو سیستەمە تۆتالیتاریەکان تێکەڵاو بکات.

تیۆرە ڕەخنەییەکان هەر بە سنورداری دەمێننەوە چونکە هیچ مەعریفەیەکی تازەمان نادەنێ دەربارەی کۆمەڵگە تازەکان و فۆرمی دەسەڵاتیان ئەو بەرەنگاریانەی ڕووبەڕووی دیموکراسیەت دەبنەوە. ئەم لاوازیە بە ئاشکرا لە داواکارەکانی هێربەرت مارکۆزدا دەردەکەوێ کە شیکردنەوەی بۆ میتۆدی فرۆیدیزم سەرنجمان ڕادەکێشێ. تێزی سەرەکی مارکۆز لە (مرۆڤی تاك ڕەهەند)دا بریتیە لە: *(وەهایش ئیدی هیچ ناکۆکیەك لە نێوان ژیانی تایبەتی و ژیانی گشتی‌و نێوان پێویستیە کۆمەڵایەتیەکان و پێویستیە تاکە کەسیەکاندا نەما. تەکنەلۆژیا ڕێگە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێ فۆرمی تازەی جڵەوکردن و پێکەوەلکاندنی کۆمەڵایەتی خۆشدەکات، کە لەیەك کاتدا نەرمترەو کاریگەریشی زیاترە).* پاشتر مارکۆز دەڵی ئەم بارودۆخە درێژ دەبێتەوە بۆ کۆمەڵگەی سەرمایەداری‌و کۆمۆنیزم و هەردووکیان پێکەوە کۆدەکاتەوە. کێ ئینکاری ئەوە دەکات کە تەکنەلۆژیا ڕێگە بۆ بڵاوبوونەوەو زۆربوونی وەسیلەکانی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵایەتی خۆشناکات؟ بەڵام بەچ هەقێك لەم تێبینیە گشتی‌و بێنرخەوە بگەینە ئەو پێداگرتنە ناماقووڵەی پێی وایە تەکنەلۆژیا ئەم کۆنترۆڵکردنە دەسەپێنێ‌و بە تێپەڕبوونی کاتیش دەبێتە شتێکی گشتگیرو هیچ شتێك لەدەستی ڕزگاری نابێ؟ بۆ لەگەڵ (ئیدگار مۆران Edgar Morin)دا نەڵێین گەشەکردنی چڕی کۆمەڵایەتی بە پێی پێناسەی هۆرکایمەر هاوشانی گەشەکردنی ئاڵۆزی‌و شێوەکانی جڵەوکردن و لە هەمان کاتدا هاوشانی گەشەکردنی دیارینەکردن و ئازادی شیاوە؟ وێنەی ئەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەسەڵات بەشێوەیەك لق وپۆپی هاویشتووە کە هەموو پراکسیسە کۆمەڵایەتیەکانی گرتۆتەوە، وێنەیە کە دوور لە واقیعی ئەو کۆمەڵگانەی دەوڵەتی بەهێزو بیروکراسیەتە گشتیەکان و دیسپلین و سیستەمی نوێنەرایەتی سیاسی و گرووپ و بەرژەوەندی‌و داخوازی کۆمەڵایەتی‌و دەزگای بەرهەمهێنان و سەنتەری دارایی‌و دەزگای دادوەریان تێدایە.

هیچ شتێك نیە هێندەی وێنەی ئەم کۆمەڵگە یەکگرتووە لە واقیعەوە دووربێ کە تیایدا تەکنەلۆژیایە پەیوەندی دەکات بە دەزگا بەرهەمهێنەرەکان و دەوڵەت و شێوەکانی بەرخۆری‌و تەنانەت هاوڵاتیانیشەوە. ئێمە لە

ئینگلتەرا لە بواری پەرەسەندنی پیشەسازیدا چەند قۆناغێك پێش ئەڵمانیا کەوتبوون، پێویست بوو کۆتایی بهێنرێت بە پەرت و بڵاویی و دابەشبوونی ئەڵمانیا بۆ چەند دەوڵەتۆکەیەکی بچووك، بۆ لابردنی ئەو لەمپەرە گومرگیانەی کە رێ لە پەرەسەندنی پیشەسازیە گەورەکان دەگرن؛ کە خەریك بوو لە ناوچەکانی خۆراوای بروسیا بناغەی دادەنا. یەکخستنی ئەڵمانیا زەرورەتێکی ئابوریی بوو، لە هەمان کاتیشدا پێداویستیەکی سیاسی دیاریکراو بوو: شۆڕشی ساڵی **1848** ویستی شۆڕشێکی دیموکراتی نەتەوەیی بێت بەبێ ئەوەی پێکەوە ناکۆك بن. شۆڕشەکە دەسکردی بۆرژوایەکی لیبراڵ بوو (پیاوانی پیشەسازیی–ڕینانیەکان–، ئوستادانی زانکۆو، پیاوانی یاسا)، لەگەڵ چینی ساوای کرێکاران و بەشێك لە جوتیاران. یەکەمین شت کە ئەو شۆڕشە داوای کرد یەکێتی ئەڵمانیای گەورە بوو کە نەمساش دەگرێتەوە و بوار دەڕەخسێنێت بۆ گەشەپێدانی کۆمەڵگای پیشەسازیی نوێو لەناوبردنی پاشماوەی بونیادە فیوداڵە کۆنینەکان، ئەمەش لە زۆر زووەوە داواکاریی کۆمەڵگای ئەڵمانیاو بەشێکی دیاریکراوی چینی کرێکاران بوو.

نوشوستهێنانی شۆڕشەکە، نوشوستی ئامانجە دوو سەرەکە بوو، واتە نەتەوایەتی و دیموکراسیەت. لە سەرەوەو بەبێ‌شۆڕشگێڕان، ئەڵمانیا لە لایەنی کەسێکەوە یەکخرا کە لە یەك کاتدا هەم سەرپەرشتیارو هەم زیندە بە چاڵکەری شۆڕشەکە بوو، مەبەستمان لە (بسمارك)ە. بسمارك لە سەر حیسابی دیموکراسیەت یەکێتی بەدیهێنا... لەگەڵ سەرکەوتنی بروسیادا کە قەڵای کۆنخوازترین چین بوو (گەورەو موڵکداران و ماقووڵانی گوند)، ئیتر چەمکی سەربازیانەی دەوڵەت بەسەر لیبراڵیزمی دەوڵەتۆکەکانی باشوردا زاڵ بوو، بەڵام شوێنەواری ئەم لیبراڵیزمە هەتا ساڵی **1918** بەسەر ئەنجومەنە نوێنەرایەتیەکانەوە بە ئاشکرا هەر مابوو.

بسمارك دەیگوت یەکێتی بە جەنگ دەکرێت "چونکە بڕیارە مەزنەکان بە وتارو ئاخاوتن بەجێ ناگەیەنرێن، بەڵکو بە ئاسن و خوێن". یەکێتی ئەڵمانیا لە ڕووی دوژمنی دەرەکیدا دامەزراو لە جەنگەکانی **1866–1870**دا بە تەواویی ئەو دوژمنە تێکشکا، هەروەها یەکێتی ئەڵمانیا دژی دوژمنی ناوخۆش بەدیهات، ئەو دوژمنەی کە بسمارك لە خەیاڵی خۆیەوە دایهێناو، پێش هیتلەر کەوت. بەمجۆرە کاسۆلیك و لیبراڵەکان لە لایەنی دامەزراوەی دەوڵەتەوە تووشی چەوساندنەوە بوون.

دوای ساڵی **1848** بۆرژوازیەت بە تەواویی دەسبەرداری جوڵانەوەی شۆڕشگێڕیی بوو، بسمارك لە دەستەڵات دووری خستەوەو بەسەر خۆیدا داخراو خۆی وا پیشان دا کە گوێ ناداتە سیاسەت بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لە ئەنجامدانی کارەکانیدا. بەمجۆرە ئەڵمانیا بێبەش کرا لەو فاکتەرەی کە ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە هەریەکە لە بەریتانیاو فەڕەنسادا، واتە بۆرژوای لیبراڵ کە ناچار دەبێت دەسبەرداری هەندێك لەسەربەستیەکانی ببێت بۆ جەماوەر، کە کاتی خۆی لە بەردەمی فیوداڵەکاندا خۆی داوای کردبوون.

بەمجۆرە جووڵانەوەی کرێکاریی بە هەردوو ڕەوتی لاسالییەکان و مارکسیستەکانەوە بوو بە میراتگری ئەو داخوازیە دیموکراسیانەی کە لە ساڵی **1848** بە دواوە پشت گوێ خرابوون. پێویست بوو بیانخاتە ناو داواکاریە چەشنیەکانی خۆیەوە –کۆمەڵایەتی‌و سیاسی–. لێرەوە ئەم

زاراوە ئاڵۆزە پەیدا بوو "سۆسیالیست–دیموکراس"، لەگەڵ ئەو ناکۆکیانەدا کە لەگەڵ سەرکەوتنی لایەکیان بەسەر لایەکەی تردا دەکەوتەوە.

سەرباری خەونەکانی لاسال بە دامەزراندنی پێرەوی "سۆسیالیزمی دەوڵەت" یاخود موڵکدارێتیەکی هەرەوەزیی کە تێیدا خێزانی شاهانەو کرێکاران دژی بۆرژوای سەرمایەدار یەکدەگرن، بسمارك دوژمنێکی ناوخۆی تازەشی بۆ پەیدابوو کە بریتی بوو لە سۆسیال دیموکرات. جوولانەوەی کرێکاریی لەوپەڕی جۆش و هەڵچووندا زەبری بەرکەوت، لە ساڵی 1878دا بسمارك دوو هەوڵی جیای کوشتنی ئیمپراتۆری کرد بە بیانوو، هەردوو هەوڵەکەی خستە ئەستۆی پارتی سۆسیال دیموکرات و بەهانەی دەسکەوت بۆ سەپاندنی زنجیرەیەك یاسای نائاسایی کە هەر چوار ساڵ جارێك نوێ دەبوونەوە.... هەتاکو ساڵی 1890، بەمەش پرپاگەندەی سۆسیالیزم قەدەغەکراو سەربەستی کۆبوونەوەو سەربەستی هاوپەیمانێتی ڕۆژنامەگەرێتی سۆسیالیزم نەمان.. بە کورتی بسمارك هەموو ئەو شتانەی لە جوولانەوەی کرێکاریی قەدەغەکرد کە دەیتوانی لێیانەوە گوزارشتی سیاسی لەخۆی بکات. لە بەرامبەرداو بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگیەك، بسمارك هەندێ یاسای کۆمەڵایەتی دانا کە لەو سەردەمەدا پێشکەوتووترین یاسا بوون، لەوانە مووچەی پیران و دیاریکردنی سەعاتی کارکردنی ژنان و منداڵان.

### *سەرکوتکردن و ڕێگای ڕادیکالیزم:*

قەدەغەکردنی پارتی سۆسیال دیموکرات لەوەی بۆ ماوەی دوازدە ساڵ هیچ چالاکیەکی سیاسی لە دەرەوەی پەرلەمان نەبێت، چەند ئەنجامێکی لێکەوتەوە: لەلایەکەوە گرووپی پەرلەمانی سۆسیال دیموکرات سەربەخۆیی نیمچە تەواوی هەبوو، ئەمەش کاریگەریی تایبەتی خۆی هەبوو لەسەر ژیانی سۆسیال دیموکرات دوابەدوای ساڵی 1890. چالاکی پەرلەمانی گرنگیەکی زۆری هەبوو بۆ حیزب چونکە پەرلەمان تاکە مینبەر بوو کە لێوەی پارتی سۆسیال دیموکرات دەیتوانی بە ڕاشکاویی و بە ئاشکرا گوزارشت لەخۆی بکات. لە لایەکی تریشەوە قەدەغەکردنی جوولانەوەی کرێکاریی بوو بە هۆی گەشەکردنی ئاڕاستەی ڕادیکاڵ لەسەر ئاستی بنکە، باشترین گوزارشت لەم ڕادیکاڵیەتە تەشەنە کردنی مارکسیزم بوو لە ڕیزەکانی پارتی سۆسیال دیموکراتدا لە ماوەی ئەو دوازدە ساڵەدا. بەڵام ئەگەر مارکسیزم بە ڕەسمی لە حیزبدا سەرکەوتبێت، ئەوا داب و دەستوری "لاسالیزم"زیادی کردو لەناو پارتی سۆسیال دیموکراتدا ڕەگی داکوتا، ئەمەش بە تێکەڵاو بوونی نەزعەی ڕیفۆرمی دژ بە سەرمایەداریی لەگەڵ مەیلی نەتەوایەتیدا. بێگومان سەرەك شۆماشێر باشترین بەرجەستە بوونی ئەو نەریتە لە دوای ساڵی 1945وە.

دوای ئەم ساڵانە، جوولانەوەی کرێکاری شەرعیەتی خۆی وەرگرتەوە، بەڵام لە وەزعێکدا مایەوە کە دەیناڵاند بە هۆی گرژی نێوان خەباتی شۆڕشگێڕانەو ئارەزووی ئینتیما بۆ کۆمەڵگایەکی گشتگیرو گونجان لەگەڵیدا. ترسی قەدەغەکردنێکی ترو قورسایی ئەو دەزگایانەی کە شەرعیەتی خۆیان پاراستووە، بوونە هۆی ئەوەی حیزب و بڵاوکراوە ڕەسمیەکانی حیزب، زۆر بە وریاییەوە گوزارشت لە موعارەزەکردنی ڕژێمی وێلهێلم بکەن و سانسۆر بخەنە سەرخۆیان، ئەم سڵ کردنەوەو خود سانسۆر

کردنە لەوەدا ڕەنگیان دایەوە کە حیزب شێوازە شەرعیەکانی خەباتی پەسەندکرد. دوابەدوای لابردنی یاسا نائاساییەکان ئەنگلز وتی: "دوژمنەکانمان ددانی خۆیان بە شەرعیەتمان دەشکێنن". ئەم ئامۆژگاریەی ئەنگلز بوو بە تاکتیکێك و هەمیشە بەکار دەهێنرا بۆ پاساودانی ستراتیژی وریایی، کە بوو بە شتێکی نیمچە دامەزراوەیی و، کاوتسکی پێی دەوت ململانێی چینایەتی شەرعی.

سەرباری ئەم سڵکردنەوەیە، سۆسیال دیموکراتەکان "ئەوانەی نیشتمانیان نیە" هێشتا هەر لە کۆمەڵی ئەو ماوەیە دوورخرابوونەوە، کە کۆمەڵ ئەو کاتە بەپێی داب و دەستورە بروسیەکان پلە بە پلە ملکەچی دەستەڵات بوو.

لە نێوان سالانی 1900 و 1914دا، ئەڵمانیا هەوڵیدا پێگەیەکی لەنێو هێزە ئیمپریالیستەکاندا هەبێ، ئەمەش لە ڕێی پیشبڕکێی چەکسازیی و هەوڵی داگیرکردنی کۆڵۆنیەکانەوە، هەروەها پێشبڕکێ لەگەڵ ئینگلتەرادا لە وشکانی و لە ناودا، بگرە ئەڵمانیا هەوڵیدا بەسەر هێزە ئیمپریالیستە ئەوروپیەکاندا زاڵ ببێت. لە ساڵی 1914دا ئەڵمانیا نوێترین ئابوریی هەبوو لە ئەوروپادا و، بۆرژوای ئەڵمانی بە تەواویی باڵی کێشا بەسەر ژیانی ئابوریی و کۆمەڵایەتیدا بەبێ ئەوەی پەنجەی گەیشتبێتە دەزگای دەوڵەت.

ئەمە پێشینەیە بوو کە ئینشیقاقی جووڵانەوەی کرێکاریی ئەڵمانیی، لێکەوتەوە. لە ساڵی 1910 بەدواوە، ناکۆکی نێوان لیبرالیزمی ڕیفۆرمیست و سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕ بەهێزێکی تازەترەوە دەست پێدەکات. سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕ لە ناواخنی پارتی سۆسیال دیموکراتدا خۆی خەفە کردبوو، دوای ئەو هێورکردنەوە ڕووکەشەی کە برنشتاین پێی دەوت "قەیرانی دارمان". دووبەرەکی بە ئاشکرا دیار بوو، لە لایەکەوە کەسایەتیەکانی وەك ئێبێرۆشیدمان کۆنترۆڵی حیزبیان کردبوو، لە تەك قۆناغی گەشەسەندندا دەیان سازاند، قۆناغی ڕێنمایی کردنی سەرمایە، بە جەختکردنە سەر مۆرکی تەکنیکیانەی خەبات. لە لایەکی تریشەوە چەپڕەوەکان پایەو پاڵپشتی بەهێزیان دەست کەوت تا بتوانن دژی تاکتیکە کۆنەکان بوەستنەوەو بانگەشەی چالاکیی جەماوەریی بکەن لەوێنەی مانگرتنی سیاسیی و خۆپیشاندانی سەرشەقامەکان و کاروکردەوەی گێرەشێوێنی لەناو کەمپی سەربازان و لەناو لاواندا.

ڕەنگە ئەو ستراتیژە شتێکی ناواقیعی لێ دەربچوایە، ئەگەر هاوشانی گەشەسەندنی ڕادیکاڵیەت نەبوایە لە هەندێك بەشی جوڵانەوەی کرێکاریدا لە پێناوی وەستاندنی مەترسی جەنگ لە ئەورووپاو دژی گرانی گوزەران. لە بەرامبەری ڕادیکاڵیەتی کرێکاریدا ستراتیژی خاوەن کارەکان چەسپاو، سەندیکاو کۆمەڵەکانی خاوەن کاران یەکیان گرت بۆ بەرەنگاربوونەوەی کرێکاران. لەگەڵ ئەوەدا کە دەستکەوتەکانی ئەو سەردەمەی کرێکاران کەم و لاواز بوو، بەڵام ئامادەییان بۆ جەنگ بەس بوو بۆ ترساندنی فەرمانڕەوایان، کە ئەمەش وای کرد جەنگ لەکاتی خۆیدا بێت و حاڵەتەکە ڕزگار بکات.

هەتا ئەو کاتە، هێشتا پارتی سۆسیال دیموکرات کەسی وەدەر نەنابوو چ لەلای ڕاست یان چەپی خۆیەوە. بەڵام دەنگدان بۆ میزانیەتی جەنگ لە 4ی ئابی 1914دا بەهۆی کۆمەڵەی سۆسیال دیموکراتەوە لەناو پەرلەماندا بوو بە بادانەوەیەکی یەکلایی کەرەوەو کۆتایی هێنا بە هاوکاریی نێوان دوو شەپۆلە ناکۆکەکەی ناو

حیزب. پیاوانی کاربەدەستی حیزب پێیان وابوو ئەم دەنگدانە ڕێ دەدات حیزب لە توێی پەیمانی پیرۆزەوە لەگەڵ کۆمەڵگای گشتگیردا خۆی بسازێنێت، بەڵام چەپڕەوەکان بەلایانەوە ڕاچەنینێکی گەورە بوو. ڕۆزا لۆکسمبۆرگ بە گاڵتەجارییەوە دەربارەی ئەمە دەڵێت: "ئەی کرێکارانی جیهان لە ئاشتیدا یەك بگرن و لە جەنگدا یەك بکوژن". جەنگ ڕیزەکانی یەکخست و لە هەموو بەشەکانی کۆمەڵگادا نەتەوایەتی سەرکەوت.

ئەوپەڕی چەپیش، ئەوەی دواتر "کۆمەڵەی سپارتاکۆسیەکان"ی پێکهێنا، دوای ئەوەی بوو بە تاکە هێزی ئۆپۆزیسیۆن دژی هاوکاریی چینایەتی، دەبوو دژایەتی دەستە سەرۆکایەتیەکانی حیزب بکات. ئەوپەڕی چەپ لە مۆکارەکانی گوزارشت بێبەشکرا، یەکسەر دوای بڵاوبوونەوەی بەیاننامەکانی، دەستیان بەسەردا گیرا، بۆیە ناچار بوو بەنهێنی و بە شێوەیەکی نایاسایی بڵاویان بکاتەوە، سەرکردەکانی یەك لە دوای یەك زیندانی کران.. بەمجۆرە پەیوەندیی بە بنکە جەماوەریەکەیەوە نەما کە لە نێوان ساڵانی **1912**–**1924**دا دەستی کەوتبوو.

ساڵی **1917**، کاتێ نوێنەرەکان دەنگیان نەدا بۆ بودجەی جەنگ، ئەفسانەی یەکێتی پارتی کرێکاریی هەرەسی هێنا، کارل لیبکخنت یەکەمین کەس بوو کە لە ساڵی **1914**دا دژی ئەو بودجەیە وەستایەوە. ئەو نوێنەرانە هەموویان لە کۆمەڵەی پەرلەمانی سۆسیال دیموکرات و لە حیزب دەرکران، و پارتی سۆسیالیستی سەربەخۆیان دامەزراند. لەگەڵ ئەوەشدا پاشماوەی ئەو ئەفسانەیە تا ساڵی **1918** هەر مابوو، ئەوەش بە ئاشکرا لە دوودڵی سپارتاکۆسیەکاندا دەبینرا بۆ جیابوونەوەیان لە پارتی سۆسیالیستی سەربەخۆو دامەزراندنی پارتی کۆمۆنیست. دەترسان بە دامەزراندنی پارتێکی تر لە جەماوەر داببڕێن، ئەو ترسەش لەو دووبەرەکیانەدا ڕەنگی دایەوە، کە لەکاتی گفتوگۆکردنی ئەو مەسەلەیەدا لەسەر ئاستی نەتەوایەتی، ڕوویاندا.

ڕاستڕەوی سۆسیالیست دیموکرات (بە زۆرینەی پارتی سۆسیال دیموکرات) بەبێ ویستی خۆی حوکمی گرتە دەست، ساڵی **1918** دوای شکست و ڕاپەڕینی سەربازو دەریاوانەکان ناچارکرا جڵەوی دەوڵەت بگرێتە دەست. لە تەموزی ساڵی **1919**دا نۆسك و شیرمان و ئیبەرت کە هەرسێکیان سۆسیال دیموکرات بوون شۆڕشی سپارتاکۆسیەکانیان لە گۆمی خوێندا گەوزاند. نۆس لە نێو ڕیزی ئەفسەرو دەرەجەدارو سەربازەکاندا، ئەوانەی دوای بەزینی ئەڵمانیا لە جەنگدا تەسریح بوونیان ڕەتکردەوەو بیرۆکەی ڕمانی ئیمپراتۆریەتەکەیان قبووڵ نەکردو بەردەوامبوونی شەڕیان پەسەند کردو، ماقووڵانی گوندو هەندێك پیاوانی پیشەسازیی یارمەتی ماڵییان دان، نۆسك لەمانە هێزی تایبەتی دروستکرد، وایان لێهات مووچەی بەرزیان وەردەگرت و توانایان هەبوو کە سەربازی بە کرێ گیراو سازبدەن، ئەم یەکە سەربازیانە بوون بە چالاکترین ڕەگەز لە دژە شۆڕشدا. بە گورجیو بە تۆقاندن نیزامیان سەپاند، کردەوەی ستەم و زوڵم و زۆر لەگەڵ ئەو هەڵمەتەدا، بێوێنە زیادیان کرد، دژی سەرۆکەکانی چەپ و ئەوپەڕی چەپ. چەندان ڕێکخراوی نەتەوەییو دژە سامی دامەزراند کە پێش جەنگ لە جموجوڵدا بوون (ئەمەش بوو بە هەوێنی پارتی نەتەوەیی سوسیالیست کە هیتلەر دایمەزراند)و دروشمی قەلاچۆکردنی بەلشەفیزم و جوولەکەیان بەرزکردەوە. ئیبەرتیش پاداشتی خۆی وەرگرت

بەوەی بوو بە یەکەمین سەرکۆمار، کە خۆی سەرۆکی پارتی سۆسیال دیموکرات بوو. بەمجۆرە لەسەر دەستی سۆسیال دیموکراتی فەرمانڕەوا شۆڕشی کرێکارانی ئەڵمانیا تێکشکێنراو ئەمەش وای کرد تاڕادەیەکی زۆر لە یادەوەریی مێژوویی ئەڵمانیادا بسڕێتەوە.

داکۆکیکەران لە پارتی سۆسیال دیموکرات هەموو خراپەکاریەکان دەخەنە ئەستۆی پارتی کۆمۆنیست و دەڵێن ئەو لێپرسراوە لە هەرەسهێنانی ڤایمار، بەڵام ڕق و قینی زۆری نێوان هەردوو جەمسەری جووڵانەوەی کرێکاریی، ڕەگی خۆی لەو توندوتیژیەدا دەدۆزێتەوە کە سۆسیال دیموکرات بەکاری هێنا لە لێدانی شۆڕشگێڕاندا، هەروا لەوەشدا کە پارتی کۆمۆنیستی ئەڵمانی هاوکاریی کردنی جەللادەکانی ڕەتکردەوە.

وەلێ بەزینی سپارتاکیزم بووە هۆی دەرکەوتنی چەند یاخیبوونێکی دیکەو ساڵی 1919 پەشێویی زۆری بەخۆیەوە بینی، کۆماری باڤاریا لە نیسانی 1919دا پان و پلیش کرایەوە، خەباتی چینی کرێکاران دژی کودێتاکەی "کاب"ی ڕاستڕەوی توندڕەو بەسازدانی جەماوەرو سوپایەکی سوور کۆتایی هات کە نۆسك هێزەکانی سوپای دەوڵەتی بۆ ناردن، لە 1921دا لە ئەڵمانیای ناوەڕاست یاخیبوونێکی گەورە تەقیەوە. لە ساڵی 1923دا؛ لەبەر ئەوەی هێزە فەرەنسیەکان ڕۆهەریان داگیر کردبوو، هەروەها هەڵاوسان لەو پەڕیدا بوو، لایەنی ڕاستڕەویش خەریکی هێرشە زێدەڕۆکانی بوو، وەزعێکی شۆڕشگێڕانەی بێوێنە خولقا. بەڵام پێکهاتنی خۆبەخۆی حکومەتە شۆڕشگێڕەکان بەهاوکاریی کۆمۆنیستەکان لە هەردوو ناوچەی ساکس و تۆرانج داو پاشان یاخیبوونە کۆمۆنیستەکان لە ئۆکتۆبەری 1923 دژی ڕێنماییەکانی پارتی کۆمۆنیستی ئەڵمانی، ئەم دوانە دوا خۆپیشاندان، یاخود گوزارشت بوون لە "گیانی نۆڤەمبەر" لە ساڵی 1918دا.

گەورەترین یاخیبوون کە ئەوروپا بە خۆیەوە دیویەتی بە سەرکوتکردن و ڕووخانی ورە کۆتایی هات، بەهۆی ئەو تاکتیکە نوێیەوە کە ئینتەرناسیونالی سێیەم خستیەڕوو کە داوا لە پارتە کۆمۆنیستەکان دەکات سەرچڵی نەکەن و هەوڵ بدەن لەسەر ئاستی بنکە، یەك بەرە دروست بکەن.

بەڵام کۆماری ڤایمار کە لە تەپ و تۆزی بەزینی سەربازیدا دامەزرا، بە کۆمەڵێك پەشێویی ئابووریی‌و سیاسیی‌و کۆمەڵایەتی دەستی پێکرد، هەروا دەستی دایە سەرکوتکردن وەك وەڵامێك بۆ ئەو پەشێوییانە. کۆماری ڤایمار دەسەڵاتی خۆی لە ئەڵمانیایەکدا خستەگەڕ کە بەپێی پەیمانی ڤێرسای چەند بەشێکی لێ قرتێنرابوو. بروسیا درابوو بە پۆڵندەو ئەمەش کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر نێوەندە فەرمانڕەوا ئیمپریالیستەکانی ئەڵمانیاو لەسەر هەموو ئەوانەی ئەو نێوەندانە کاریگەرییان هەبوو. کۆماری ڤایمار پێشنیاری کرد کۆمارێکی لیبراڵی و کۆمەڵایەتی دابمەزرێت بەڵام بە پێی مادەی ژمارە 48ی دەستور، لەکاتی پەشێوی‌و نائارامیدا سەرکۆمار دەسەڵاتێکی بێسنووری هەبوو.

هەرچەندە کۆماری ڤایمار دەسەڵاتی گرتە دەست، بەڵام لەماوەی چواردە ساڵدا بیست جار گۆڕا، ئەم ڕژێمە وێنەیەکی لاوازی بۆ خۆی تۆمارکرد. ئەو لاوازیە بەشێوەیەکی بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ بێ کەڵکیی ئەو هاوپەیمانێتیانەی کە لە نێوان پارتی سۆسیال دیموکرات و پارتە بورژوازیەکاندا بەستران. لە کۆتایی 1923دا

پارتی سۆسیال دیموکراتیش دوای ئەوەی میراتی قۆناغی پێش خۆی کەوتە ئەستۆ،ئیتر کۆتایی هات، هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو پارتە دوای شەرعیەتی دەکرد بە هەر نرخێك بێت و لەبەر ئەوەی وەلامی فشارەکانی جەماوەری بە سەرکوتکردنێك دایەوە کە بە سوپاو دادگا بەڕێوە دەچوو. لە هەمان کاتیشدا گرووپەکانی ڕاسترەوی ناسیونالیستی توندڕەو خۆ پیشاندانی بەهێزیان ساز دەکرد. ئەو پارتە بوونی ئەما ئەگەرچی لە قۆناغی یەکەمی پەشێویەکان هەر ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە لە لێپرسراوێتی دابەش کردووە.

### *قەیرانی ئابووریی‌و سەرکەوتنی فاشیزم:*

لەسەر ئاستی ئابووریی‌و کۆمەلایەتی، وردە بۆرژوا گەیشتە حالەتێکی بێوێنە لە هەژاریی و نەداریی، لە سالی 1925دا ژمارەی بێکارەکان گەیشتە ملیۆن و نیوێك، هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو قەیرانە ئابوریەی کە تا ڕادەیەك لەو دابەشکردنەوە کەوتەوە کە بەهۆی پەیمانی ڤێرسایەوە بەسەر ئەلمانیادا سەپێنرا، هەروەها دەشگەڕێتەوە بۆ ئاودیوکردنی سەرمایەو دابەزینی نرخی دراو و هەلاوسان، سەرباری ڕیفۆرمەکانی سالی 1923، هەروەها بۆ ئیفلاسکردنی زۆرێك لە پرۆژە بچووکەکان دوای چربوونەوە و مۆلبوونی سەرمایەو پێوەندبوونی بە بانکەکانی ئەمریکاوە. پاشان قەیرانی گەورەی سالی 1929 کەوتە ڕوو، چونکە بەلای بۆرژوای بچوك و گەورەوە دیموکراسی بریتی بوو لە هاوتای بابەتیانەی پەشێویو لاوازیی حکومەتەکانی کۆماری ڤایمارو سۆسیال دیموکرات (کە ماوەیەکی کەمی سالی 1928 حوکمی گرتە دەست و بایەخدانی خۆی بە نیزام دەربڕی). کارەساتی ئابووریی زەمینەیەکی لەباری خولقاند بۆ هاتنی دەستەلاتێکی بەهێز. گەرچی گەشەکردنی هێزە کرێکارەکان شتێکی ئاشکرا بوو، بەتایبەتی لە نێوان سالانی 1928 بۆ 1932 لە توێی ئەزموونێکی ڕۆشنبیریی بێوێنەی هاوشانی ڕادیکالیزمی تیۆریی، سەرباری تەقینەوە پچڕپچڕەکانی ئەوپەڕی چەپ لە بەرامبەری هەلکشانی نازیەتدا، بەلام گوزارشتی سیاسی ئەو هێزە خولقێنەرە لەژێر قورسایی دەزگاکاندا بوو، بەتایبەتی دەزگاکانی پارتی کۆمۆنیست کە خۆی کردبوو بە بەلشەفیو پیت بەپیتی ئەو ڕاسپاردانەی جێبەجێ دەکرد کە تایبەت بوون بە دژایەتیکردنی "سۆسیالیزم-فاشیزم" لە ڕیزەکانی سۆسیال دیموکراتدا، کە ڕاسپاردەی دەولەتی کۆمۆنیست بوون.

لە 30ی تەموزی 1933دا هێندنبۆرگی سەرکۆمار هیتلەری بانگهێشت کرد بۆ پایەی ڕاوێژکاریی، لە ڕاستیدا هۆی سەرەکیی و جەوهەری لە بانگکردنی هیتلەردا بۆ دەستەلات لەوەوە هاتبوو کە هیندنبۆرگ و لۆدندرۆف باوەڕیان وابوو کە بەزینی ئەلمانیا لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا ناگەڕێتەوە بۆ دۆڕانی هێزە سەربازیەکان، بەلکو دەگەڕێتەوە بۆ چەپ، دوژمنەکەی ناوخۆ، کە لە پشتەوە خەنجەری دا لە سوپا، هیندینبۆرگ و لۆدندرۆف ڕەواجیان دا بەم ئەفسانەیەو هەر لە بنەڕەتەوە بیرۆکەی بەزینی سەربازییان ڕەتکردەوەو لە 11ی نۆڤەمبەری 1918دا ئیمزایان لەسەر ئاگربەست نەکرد. ئەم درۆو دەلەسەیە دەورێکی زۆری بینی لە دژایەتیکردنی سستمی کۆماریدا.

هیتلەر بە خێرایی هەڵبژاردنێکی تازەی رێکخست و مەبەستیشی لەوە پاساودانی بیرۆکەی "رایخی هەزار ساڵە" بوو، دەوڵەتی نوێ، دەوڵەتەکەی هیتلەر ویستی دەوڵەتی یاسا بێت، مەبەستی سەرەکی ئەم رژێمە تێکشکاندنی جووڵانەوەی کرێکاری بوو. ئاگر تێبەربوونەکەی رایشتاخ و مەهزەلەی دادگاییکردنەکەی کە بە دوایدا هات، بەس بوون بۆ ئەوەی وا لە رای گشتی بکەن بە زیندانیکردنی کۆمۆنیستەکان رازی ببێت. بەمجۆرە کۆمۆنیستەکان یەکەمین نیشتەجێی سەربازگەکانی دەسبەسەرکردن بوون. ورده ورده ئەمە بووە چارەنووسی هەرکەسێك کە نارەزا بێت یان گومانی ئەوەی لێبکرێت کە دژی دەوڵەتەکەی فۆهرەرە کە لەسەر یەکێتی پارتی نازیو دەزگای دەوڵەت دامەزرابوو. هەر لەهەمان کاتیشدا ئەو رێکخراوانە لە ناوبران کە گومانی ئەوەیان لێدەکرا توانای بەرەنگاریان هەبێت، نازیەکان دام و دەزگاو بونیادی "جەماوەریی"یان دامەزراند، وەك "بەرەی کار"و "هێزی کامەران"، بەمەش چوونە ناو هەموو شێوازەکانی جووڵانەوەی کرێکاریەوە، بە زاراوەکانی زمانیشەوە بۆ گۆرینی سیماو ئاراستەیان. بەمجۆرە دوانەی (سەرکوتکردن و سانسۆر) سەریان هەڵدا.

ئاسان نیە بتوانین بیخەملێنین کە تا چ رادەیەك جووڵانەوەی کرێکاری چووە ژێر ئالای نازیەتەوە. بێشك چەند فاکتەرێك یاریدەی ئەمەیان دا.. لەوانە نەزعەی فێڵاویانەی نازیەت و نەهێشتنی ورده وردەی بێکاریی. لە سەرەتادا کەس بڕوای نەدەکرد نازیەت لە ماوەی دووردا سەرکەوتوو بێت و، بیردۆزەی "سۆسیال فاشیزم" کە لە بنەرەتدا دژی پارتی سۆسیال دیموکرات ئاراستە کرابوو، هاوکاریی نێوان سۆسیالیستەکان و دیموکراسەکان و کۆمۆنیستەکانی پەکخست. تەنیا لە ساڵی 1935دا، واتە دوو ساڵ دوای گەیشتنی هیتلەر بە دەستەڵات و، دوای هەردوو دروشمی "بەرەی یەکگرتوو" و "بەرەی گەل" کە ئینتەرناسیونالی کۆمۆنیست بەرزی کردنەوە، سەرباری دوودڵیی سۆسیال دیموکراتەکان توانرا رەوتێکی هاوبەش بدۆزرێتەوە کە هەموو لایەنەکانی کۆمەڵە هیجرەت کردووەکان بگرێتەوە. دوای ئەزمونەکانی کۆمەڵە بچکۆلەکان بەدرێژایی کۆماری ڤایمار، پارتی کۆمۆنیستی ئەڵمانی گەیشتە ئەو قەناعەتەی بەرەنگاریکردنی نازیەت لە رووی جەماوەریەوە مەحاڵە.

ج.م. ڤانسانت لە کتێبی "بیردۆزەی رەخنەیی لای قوتابخانەی فرانکفۆرت"دا دەڵێت: *"مارکسیزمی تیۆریی وەك لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، لە ئەڵمانیادا پەرەی سەند، لە دیدی لایەنگرانیدا گوزارشت بوو لە بیردۆزەیەکی زانستی نیمچە کامڵ. بۆیە چاوەرێ دەکرا یاساکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی دابرێژێت، وەك چۆن وا لە فیزیا چاوەرێ دەکرا یاسای جووڵەی مادە دابرێژێت"*. لۆکاش و کۆرش یەکەم کەس بوون ئیدانەی ئەو بۆچوونەیان کرد کە خۆی گێل دەکات لە پەیوەندیی نێوان ئابوریو داواکاریەکانی دادپەروەری و هاوکاریی کۆمەڵایەتیداو زانستی ئابوری جیادەکاتەوە لەو بارودۆخانەی بوون بە هۆی پەیدابوونی.

ئەمەیە ئەو پێشینە مێژووییەی کە پێویستە دەرکەوتنی بیردۆزە ڕەخنەییەکەی لەسەر دابمەزرێنین.

### *عەقڵ و مێژوو و سروشت:*

ئایا مرۆڤ لە هەوڵیدا بۆ کۆنترۆڵکردنی سروشت ڕێگای ڕاستی گرتەبەر؟ لە ڕاستیدا زیاتر گەیشتە کێشمەکێش و دووبەرەکی زیاتر لەوەی گەیشتبێتە سەربەستی.

دوانەی سروشت و مرۆڤ لە هەموو شکڵەکانی گوزارشتکردنیدا ئینحیرافی کرد بۆ جیابوونەوە و دابەشبوون. زەمان هەمیشە جەختی لەو جیاوازیە کردووە کە مرۆڤ لە سروشت جیادەکاتەوەو ئەمرۆش ئەو جیابوونەوەیە بەڕادەیەک ڕەگی لە بووندا دادەکوتێت کە تاک و کۆمەڵگا، دوو لەتبووی دەستی ئەم ململانێتە لە کۆمەڵێک کێشەدا دەژین کە چارەسەریان نیەو بەردەوامیش کێشەکان گەورەتر دەکەنەوە. لە ناوەوەو دەرەوەدا، لە خودو بابەتدا، تاک و کۆمەڵگادا، تایبەت و گشتیدا، عەقڵ و سروشت، لە هەموویاندا کێشمەکێشێک خۆی دەردەخات وەکو بڵێی یاسایەکە هێزی شیکردنەوەو گۆڕان پێی ناوێرن.

ڕەنگە دیارترین شکڵی ئەو کێشەیە، پەیوەندی نێوان تاک و کۆمەڵگا بێت، چونکە تاکەکەس خۆی دەبینێتەوە شێمانەکانی بوونی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کەمتر دەبنەوە، ئەوەتا زمان و هەستیاریی و شێوازی پەیوەندیەکان و بواری خێزانیی تایبەت، واتە هەموو ئەو شتانەی کە تایبەتن بە تاک، کەوتوونەتە بەر چنگی ئەو گشتاندنەی کە کۆی کۆمەڵایەتی بەرهەمی دەهێنێت. تاک بوو بە ژمارەیەک لەناو بارستەیەکی ژمارەییدا، لەگەڵ ئەوەشداو تەنانەت لەناو ملکەچکردندا بۆ سستمێک، هێشتا هەر یادەوەریی شتێکی تایبەت ماوە کە تەرجومەی خۆی لە هەستێکی تەژمدا دەبینێتەوە، بە زوڵم لێکراویی، لە بەرامبەری هێزو جەبەرووتی کۆدا، هۆی ئەمەش لە ڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەم کۆمەڵگایە بە بونیادە ژوورو و خوارووەکانیەوە ئەو کۆمەڵگایە نیە کە تاک پێویستی پێیەتی، بەڵکو ئەم کۆمەڵگایە هەڵوەشاوە بۆ دەستەڵاتێکی فراوانی کوێرو هیچی تر.

بەڵام لە سنووری ئەو دەستەڵاتەدا ناوەستێت کە کۆمەڵگا مومارەسەی دەکات، بەڵکو لە بەرزترین ئاستەکانیشدا هەیە، لەو ئاستانەی کە ئەو دوانەیەی ئاماژەمان بۆ کرد، تێیدا بڵاوبۆتەوە. داخران بەسەر خودداو منێتی "Solipsisme" و ئەو لەزەتە شلوێییەی کە خود هەستی پێدەکات لە دژایەتیکردنی کۆمەڵگاداو بگرە هەندێک جار بەکارهێنانی عەقڵ دژی سروشت، هەموویان مەسەلە گەلێکن، نەزۆکیو پووچییان کەمتر نیە لەوەی زۆر ساویلکانە خۆ بدرێتە دەستی بابەتێتیو تەسلیمی فشاری جەماوەر ببێت و غەریزەی ڕزگاربوون لە کۆت و پێوەندەکان بە مەزن وەربگیرێت. کەواتە، چۆن دەکرێت ڕاڤەی بڵاوبوونەوەی مەیلی کۆنترۆڵ و هەژموون بکرێت؟ چاوگەکەی کوا؟ یەکەمین توندو تیژیی چیە؟ مێژووی کۆمەڵگا لە کۆمەڵگا باشتر ئەمانە ڕوون دەکاتەوە. مێژوو بەو حسێبەی عەقڵێکی کامڵ بووە، لەگەڵ سەروەری کۆنترۆڵدا دەگاتە کەماڵ و ئەمەش دەگاتە موفارەقەیەکی سەیرو سەمەرە، کە بریتیە لەوەی کۆنترۆڵ بریتی نیە لە بڵاوبوونەوەی سەربەستیی

بەڵێن پێدراو، ڕزگاربوون نیە، بەڵکو عەقڵ خۆی کۆنترۆڵە.

## *کاری هونەریی و دەرچوون لە هەژمونی عەقڵ:*

تەنیا کاری هونەریی پارێزگاریی لە شێوازێکی جیا دەکات، خەسڵەتێکی تری هەیە غەیری مەیلی کۆنترۆڵکردن، مەقالێك لەسەر مارسیل برۆست بە قەڵەمی بنیامین ئاماژە دەکات بۆ شێمانەیەکی تری بەکارهێنانی عەقڵ. ڕاستە ئەو بە شێوەیەکی ئاشکرا سەر بە قوتابخانەی فرانکفۆرت نەبوو؛ وەلێ هەر لە ساڵی 1923وە هاوڕێی ئادۆرنۆ بووە. سەرباری ئەو ناکۆکییانەی کە هەرگیز هۆیەکانیان دەرنەکەوتن، بەڵام بنیامین کاریگەریەکی حاشا هەڵنەگری لەسەر قوتابخانەی فرانکفۆرت هەبوو. بۆ نمونە بنیامین پێی وایە بیناو یەکێتیو هێزی کارەکانی برۆست لە قایلکردندا لە توێی کۆشش و تەسەوف و زاهیدیەوە نایەت، بەڵکو جووڵەیەك هەیە کە بەرچاو نیەو خۆنەویستە، بریتیە لەو لایەنەی کە بەجێهێڵراوە بۆ یادەوەریی خۆنەویستانە، لەو لایەنەی لە توێی ئەزموونی پیریو ژانی هیجران و گۆشەگیریەوە دەڕوانێتە بوون و بینای کارەکە دەکات. لەو کاتەشدا جیهانی زمانێکی تایبەت لە دایك دەبێت و وێنەی لەلا دەبێتە چەسپاوترین شێوە. جا، وێنە چیە؟ وێنە چەمکێك نیەو وەسفێکی گشتیی تەژمیش نیە، بەڵکو بریتیە لەو زمانە تایبەتەی کە تەرجومەی ئەو بەیەکدا توانەوە تایبەتە دەکات کە هەمیشە لە نێوانی مرۆڤ و جیهانەکەیدا ڕوودەدات. وێنە، وا لە شت یان ڕووداو یاخود هەر دیمەنێکی سروشتی، دەکات بە مەیدانێك کە تێیدا لێکچوونە ڕۆشن و بریسکەدارەکان بەیەك دەگەن، مەیدانێك کە هیچ شتێك لە بوونی لاوازمان تف ناکاتەوە. لێرەدا جیابوونەوەو گۆشەگیریی کاردەکاتە سستمێکی سەلبیی زەروور بۆ گەیشتن بەو پەیوەندیە هەستیەی نێوان مرۆڤ و جیهان. بارودۆخ چەندە سەخت و گران بێت، ئەوا کاری هونەری تەجاوزی ئەم کێبڕکێ دوژمنکاریەی نێوان مرۆڤ و جیهانی دەرەوە دەکات. ئەمڕۆ، لە خۆرهەڵات یان خۆرئاوا، چەندان سەنگەری سەخت دژ بە کاری هونەری لێدراوە، ئەمەش دەیسەلمێنێت کە تا چ ڕادەیەك کاری هونەریی لە خۆیدا دژی ئەو یاسایانە دەوەستێتەوە کە لە توێیانەوە کۆمەڵگاکان جەخت لە خودی خۆیان دەکەن.

ئەم ئیشکالییەتەی کاری هونەری ماوەیەکی زۆر پێویست بوو تا شکڵێکی ڕوون وەر بگرێت، هەروەها زۆر بە توندیش پێوەست بوو بە ڕووداوەکانەوە، ڕووداوەکانی ئەڵمانیا. بۆیە پێویستمان بە زۆرو ستەمی نازیەکان بوو تاکو بەڕوونی گەردونیەت و شمولیەتی کۆنترۆڵ و ڕەگ و ریشەکەی دەربکەوێت. لە ڕاستیدا تەنوورو سوتاندنگاکانی سەربازگەکانی "ئۆشفیز" جەوهەری سەردەمەکەمان کەشف دەکات. ئادۆرنۆ لە "دیالەکتیکی سەلبی"دا دەڵێت: *"لەگەڵ قەلاچۆکردنی ملیۆنەها کەسدا بە ئیجرائاتێکی ئیداریی، ئەوا مەرگ شکڵێکی تازەی وەرگرت کە لەوە پێش پێمان نەزانیبوو"* ئەم نەهامەتیەش بریتی بوو لە کۆتایی مێژووی عەقڵ.

## *پێویستیی تیۆرەی تازە لە توێی ڕەتکردنەوەی چارەسەری شمولیەوە سەری*

*هەڵدا، کە بۆ ئەو چوارچێوەیە دانرابوو کە سەرچڵیی مرۆیی تێدا دەخولایەوە.*

ئەم تیۆرە گشتیە لە ساتێکدا دەرنەکەوت و کامڵ نەبوو، بەڵکو ساڵانێکی درێژی ویست لەو کارە زۆرو زەوەندانەی کە نوقڵانەیان بۆ لێدەداو ئاماژەیان بۆ دەکرد. ئەم تیۆرە بە هێواشی و بە پێی ڕەزمی بیرکردنەوەیەك کە سەرنج و گریمانە لە ناویدا کەڵەکە ببوون. کاریگەریی یەکەمجاری وەك پرەنسیپێکی سیما ناشاشکرا وابوو. کاتێکیش ڕوون بووەوە، ئومێدی یەکەمی بریتی بوو لە پێداچوونەوەیەکی کورتی ژیانی ئێستاو رابوردوو و تیۆریەکانی پێشووترو شارستانیەتەکان، بە جۆرێکی وەها کە زەحمەت بوو بتوانرێت هەمووی کەشف بکرێت، بەڵکو لەبەر بێدەنگبوونی بەرامبەری ئایندە ببووە مایەی نارەحەتی.

لەم بارودۆخەوە ئاڵۆزیەك کەوتەوە کە هەندێ جار نارەحەتمان دەکات. دەقەکانی "دیالەکتیکی عەقڵ" ڕەمزی ئەو تەجریدەیە جەخت لە چەندان مەسەلە دەکات بەبێ ئەوەی ملکەچ بێت بۆ سانسۆری "دیالەکتیکی سەلبی" –1966–" کە بریتیە لە وەسێتە فەلسەفیەکەی ئادۆرنۆ، بە تەواوی نووسینێك سەرگێژکەرەو هەر بزرگەیەکە –متاهە– بۆ خۆی. بریتیە لە دیالەکتیکێك کە پێویستی بە وریاییەك هەیە کە بتوانێت پێچەبەدەورە بکات و بگەڕێتەوە بۆ خودی خۆیو سەر لەنوێ دەسپێبکاتەوەو گوتارەکەی بە شێوەیەکی ئاوێزەیی بخاتەگەڕ، کە بتوانێت تا ناکۆتا شی ببێتەوە. لە توێی هەموو ئەم دەقانەوە یەك شت دەوترێت. هەموو دەقێك لەگەڵ خۆیدا جووتە، هیچ دەقێك لە گۆڕێ نیە بیەوێت شتێك بسەلمێنێت یان ئەو گشتە دابڕێژێت کە چاوی تێبڕیوە. ئامانجی ئەو شتێکی ترە نەك گشتێتی –الکلیە–.

"گشت بریتیە لە ناحەقیقەت". هەروا "ئەوەی بابەتی بیرکردنەوە بوو، ڕەنگە سەرکوت بکرێت یان لەبیر بچێتەوە یاخود ون ببێت، بەڵام هەمیشە شتێکی هەر لێ دەمێنێتەوە. چونکە کردەوەی بیرکردنەوە ساتێکی شمولی لەخۆیدا هەڵگرتووە. بەمەش ئەوەی ئێمە بە دروستی بیری لێدەکەینەوە، دەشی بابەتی بیرکردنەوەی خەڵکی تریش بێت لەهەر شوێنێکی دیکەدا: ئەم قەناعەتە دوورەپەرێزترین و لاوازترین فیکریش دەگرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئیرادەی دۆزینەوەی بیردۆزێکی بەهێزو تۆکمە دڵی قوتابخانەی فرانکفۆرت داگیر دەکات.. ڕەخنەگرتنی ئەو لە فیکری ڕۆشنگەری هەردەم سڵاوو پێزانینیشی لەگەڵدا بووە بۆ سەدەی هەژدەو بیری ڕەخنەیی لە خۆدەرخستنە هێمن یان خەباتگێڕەکانیدا. ئەگەر ڕێگا گیراوو تراژیدیەکان، ئەوانەی فیکری ڕەخنەیی پەی پێ بردبوون، ناچارمان بکەن کە بگەڕێینەوە بۆ سەر "خودێتی–الذاتیة" بە جێهێڵراو، ئەمە مانای گەڕانەوە نیە بۆ بەرایی. بڕیارێکی لەم چەشنەش لە ئەڵمانیای پێش جەنگدا ئاسان نەبوو. بڕیاری ئاوا مانای وابوو بە دژی شەپۆلەوە مەلە بکەن. بۆ نمونە، لە کۆنگرەی دافوسدا، ساڵی **1929، هایدگەر** تەوقەی لەگەڵ کاسیرەردا نەکرد کە دوایین کەس بوو پەرۆش بێت بۆ سەدەی هەژدەیەم، لەکاتێکدا کە هایدگەر خۆی، داوای گەڕانەوەی دەکرد بۆ فیکرێکی لەوەش کۆنتر. لە فرانکفۆرتدا خەڵکێك هەبوو بانگەشەی بۆ عەقڵ دەکرد، بەڵام گومان هەبوو لەوەی کە ئەگەر پێویست بکات عەقڵ بێتە قسە، ئەوە مانای قسەکردنە لەسەر واقیعی

مێژوویی و ئێستای کۆمەڵگا، نەك ئاخاوتنی عەقڵ لای کانت و تەنانەت هۆسرلیش. لە زانکۆی فرانکفۆرتدا بە کۆمەڵ ئەمەیان ڕوونکردەوە، بەڵام بە شێوازێکی جیا لە شێوازی پێڕەوکراو لەو شوێنە ڕەسمیانەدا کە تایبەتن بە زانین. هابرماس دەربارەی ئادۆرنۆ دەڵێت "نووسەرێك بوو لە نێوانی فەرمانبەرانی ڕێی ونبوو" بێشك شێوەی هەرەوەزیانەی ئەو مۆرکی "کێشەیی"یە دەکات کە ژمارەیەك لە دەقەکان وەریان گرتووە، چونکە زیاتر لە گفتوگۆوە هەڵدەقوڵێن تاکو تێڕامانی گۆشەگیرانە. ئەوە بەرهەمی فیکرێکی هەمەچەشن و چاودێریکەرە.

هەڵبژاردنی عەقڵ هاوشانی پێویستیەکی تریش بوو، زۆربەی ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت جوولەکە بوون. کە ڕیشەیان دەچووەوە سەر نێوەندە لیبراڵیەکان، هی ئەوە بوو زۆربەیان دژی مومارەسەی دینی بوون، بەڵام هوشیاریش بوون بەرامبەر تایبەتمەندێتی ئەسڵ و فەسڵیان. هابرماز لە کتێبی "وێنە گشتیەکاندا" لە چەند لاپەڕەیەکدا باس لە بایەخی ئەم تایبەتمەندێتیە دەکات و بەگژی ئەوانەدا دەچێتەوە کە نکوڵیی لەوە دەکەن جوولەکەکان دەسپێشخەری داهێنەرانەیان هەبێت لە ڕۆشنبیری ئەڵمانیداو بیریان دەخاتەوە کە پەیوەندیەکی ئاڵۆزو فرەلایەن هەیە لە نێوان فەلسەفەی ئەڵمانیو فیکری جوولەکەدا، پاشان سەرنجیان ڕادەکێشێت بۆ ئەو چارەنووسە نامۆیەی تووشی ئەو ڕۆشنبیرانە بوو کە بەو زانینە بارگاوی ببوون و بوون بە قوربانیی ئەوەی کە خۆیان بانگەشەیان بۆ دەکرد، عەقڵ بەشێوەیەکی دووسەرە خەریکی کردنەوەی ڕێگای سەربەستی بوو، ڕێی دەدا ڕەخنە لە جیهانی تەسکی جیتۆ بگیرێت و پاساو بهێنرێتەوە بۆ لە قەڵەمدانی جوولەکەکان وەك بیانی لە توێی هێڵەکانی گەردوونیەت و شمولیەتی فیکردا. لە ڕاستیدا بەتەنیا هەر ڕۆشنبیرەکانی جوولەکە توانیان ئینتیما بکەن بۆ کۆمەڵگای ئەڵمانیو لە گەڵیدا ئاوێتە ببن، گەرچی نرخەکەشی گران بوو، توانای کێشکردن لە عەقلانیەت و کلاسیکیەتی ئەڵمانیدا، لە دوا شیکاردا پشت دەبەستێت بە بیرۆکەیەك کە ناواخنەکەی ئەمەیە -ئەم ڕێگا فیکریە بریتیە لە تاقە وەسیلەیەك بۆ "ژیان لێرە" و ڕزگاربوون لە "عەزابی ئاوێتە بوون". لە بەرامبەری ئەو جوولەکە کرێسەی -فضولی- کە لە دەرەوە هاتووە و دابونەریتەکەی وای ئامادە کردووە کە بیری هەمیشە شیکارکەر بێت و بە بەردەوامی کایەیەکی فراوانی ئەزمون و شێمانەی گوزەرانکردن دوور لە خەوش و شەرمەزاریی بەخشیوە بە عەقڵی نوێ. دیدی نوێی ئەم جولەکەیە کە پێویستی بە پێکالکانی کاریگەرە لەگەڵ بەڵگە نەویستە ڕۆشنبیریەکاندا، زۆری نەبرد کە مۆرکێکی لێهاتووانەی وەرگرت و گەیشتنی تازەشی بۆ مەیدان بە تەواوی ئامادەی دەکرد بۆ ئەوەی ببێتە زانای سۆسیۆلۆژیا. بەمجۆرە میراتێکی تەواو لە دەرەوە هات و چووە ناو ئەم شکڵ و وێنانەوە کە پێشتر بەکار نەهاتبوون و ناویان نرا بیرەکانی عەقڵ. هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆ و بنیامین و بلۆخ هاوبەشن لەم خەونە میسالیەدا، خەونی زانستێك کە وەکو سەربەستی و ڕۆشنگەریی ئیعترافی پێبکرێت، وەك زانستی گەردوونیی شامیل و ماتریال، کە جڵەوی بیرۆکەی عەقڵ بگرێت و ڕامی بکات. ئەوەی سەیرە، ئەم بیریارانە هەتا کۆتایی، سەرباری کارەساتەکەی **1923**و هیجرەت و خۆراوا، هێشتا مەسەلەی جوولەکەکان لە

چارەنووسی گشتی جیانەکردەوە، بەبێ ئەوەی نکولی لە ئەسلّ و فەسلّی خۆیان بکەن، بەبێ ئەوەی دەسبەرداری شۆڕتەکەی ببن، بەبێ ئەوەی چارەسەرێك بۆ گرفتی جوولەکە لیبراڵەکانی ئەڵمانیا بدۆزنەوە.

ئادۆرنۆ، لەگەڵ هۆرکهایمەر و بۆلۆکدا، ساڵی 1948 گەڕانەوە بۆ ئەڵمانیا، بەلام ئەوانیتر لە ئەمریکا مانەوە. بنیامینیش لە ڕۆژی 26ی سێبتەمبەری 1940دا، دوای ئەوەی نەیتوانی لە ڕێگەی ئیسپانیاوە فەڕەنسا بەجێ بهێڵێت، لە شاری "بۆربۆ" خۆی کوشت. لە ئەیلولی 1950دا پەیمانگای لێکۆڵینەوەو کۆمەلایەتیەکان لە فرانکفۆرت دەسبەکار بووەوە.

لە ساڵی 1945دا ئەڵمانەکان نەیاندەتوانی خۆیان قوتار بکەن لەو دابەشکردنەی جیهان کە هاوپەیمانان سازیان کردبوو، چونکە هاوپەیمانەکان ببوون بە گەورەی ئەڵمانیاو ئەرکی ئەوەیان گرتە ئەستۆ کە سەرلەنوێ گەلی ئەڵمانیا پەروەردەیەکی سیاسی بکەنەوە. ئەڵمانەکان سەربەست نەبوون لە ولاتی خۆیاندا ڕەفتار بکەن. سستمی سۆڤێت بەسەر دانیشتوانی بەشی خۆرەلاتدا سەپێنراو بەشی خۆراواش سستمی سەرمایەداریی تێدا پارێزرا، کە تا قورقوڕاگەی لەگەڵ فاشیزمدا ڕۆچووبوو. داگیرکردن و جەنگی ساردو دابەشکرن ئەرك و قورساییەکی زۆریان هەبوو لەسەر چارەنووسی کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ. لە توێی بەیەکدائالۆسکانی ئەم هەموو دراوە نێودەوڵەتیانەو داب و نەریتە نەتەوایەتیەکان کە لە پەشێوییە پچڕپچڕەکان چنرابوو، ئەڵمانیای فیدراڵ لە توێی دوو قۆناغی ڕیفۆرمەوە لە ساڵی سفری بەزینەوە گەیشتە ئەم نمونەیەی کۆمەڵگای پیشەسازیی کە هەندێك ئێرەیی پێدەبەن و هەندێکی تریش لێی دەترسن.

بەمجۆرە یەکێتی دیموکراسی مەسیحی پێشنیاری دژایەتیکردنی کۆمۆنیزم دەکات بە شکڵێکیوا کە زیاتر لە جەنگی خاچ پەرستان دەچوو، لە پاڵ ئاشتیو ڕێکەوتنندا، وای لێهات دژایەتیکردنی کۆمۆنیزم بوو بە بیانوویەك کە نازیە پەشیمانەکان پەنایان بۆ دەبرد لە پۆزش هێنانەوەدا، نازیە پەشیمانەکان بە گەورەو بچوکیانەوە ئاوا عوزر خواهیان بۆ تاوانەکانیان دەهێنایەوە. لەم کەشە نوێیەدا کە دەستەلات و تاکڕەوییو سەرکوتکردنی سێکسی باڵیان کێشاوەو کۆت و پێوەند خراوەتە سەر سەربەستیو باوەڕ، قوتابخانەی فرانکفۆرت بوو بە مامۆستایەك بۆ ئەوپەڕی چەپ لە ئەڵمانیادا، هەر لە سەرەتای شەستەکانەوە.

### *هۆرکهایمەر و تیۆرەی ڕەخنەیی:*

کرۆکی تیۆرەی ڕەخنەیی وەك لە پێش جەنگدا لێی تێدەگەیشتین لە وتارێکە دەرکەوت کە هۆرکهایمەر لە ساڵی 1937دا بلاوی کردەوە. لەم وتارەدا هۆرکایمەر گرفتی تیۆرەی لە قوتابخانە فیکریەکانەوە گواستەوە بۆ ئەو پێکهاتە گشتیەی دروستی دەکا، واتە تەواوی کۆمەڵگا. هۆرکایمەر لە بەرامبەر پروپاگەندەی نەتەوەیی –سۆسیالیستیشدا کە لافی یەکانگیری ڕاستەوخۆی نێوان تاك و گەلی لێدەدا، هەروەها بەرامبەر ڕەوتی ملکەچیو تاعەتی درۆ کە پێی وابوو فیکر خۆی لە خۆیدا چالاکیەکی سەربەخۆیەو زانست پیشەیەکی سەربەخۆیە، هۆرکایمەر یەقینی عەقلانیانەی فیکری مارکسیستەوە –یاخود بەلایەنی کەمەوە وەك

گەڕابوونەوە، مافی ئەوەیان پێدرابوو زۆر پۆست داگیر بکەن کە لە کاتی تردا دەدران بە خەڵکی گەنجتر. لە ئەنجامدا پەیوەندی ستروکتۆری (ترکیبی Structure) بە تەمەنەوە گۆڕا: ئەوانەی کە لە تەمەنی ناوەڕاست دا بوون زیاتر لە گەنجان شوێنی حوکمیان داگیر ئەکرد. بۆ نموونە، ڕێژەی ئەو پارێزەرانەی کە تەمەنیان لە پەنجا ساڵ زیاتر بوو لە ساڵی 1818 کە لە سەدا پانزە بوو، لە ساڵی 1830دا بوو بە لە سەدا پەنجاو پێنج. لە ساڵی 1828، نووسەرێکی خەڵکی جنێڤ، جێمس فازی James Fazy، لە نامیلکەیەکدا هەستی ناڕەزایی گەنجانی دەربڕی: "ژێرۆنتۆکراسی" یاخود استغلال کردنی حیکمەتی پیرەکان لە حکومەتدا، دەیوت: "ئەمانە فەرەنسایان گەیاندووەتە حەوت یان هەشت هەزار لە خەڵك کە مافی ئەوەیان هەیە هەڵبژێررێن و لە کاتێکدا دووچاری تەنگەنەفەسی بوون و بێمێشك و ئیفلیج و بێ توانان"[80] بواری ئەوە هەبوو هەندێ شوێن لە شوێنە تازە پیشەسازیەکاندا بدۆزرێنەوە، بەڵام زۆر خاو تەشەنەیان ئەکرد و تەنها لە بەشی دوایی پاشایەتی لولیو دەستیان بە نەشونما دەکرد.

هەر لەبەرئەوەی کە فەرەنسا سیستمێکی زۆر چاکی پەروەردەی دروست کردبوو، لە ساڵی 1820 گەنجە ڕۆشنبیرەکان کە ژمارەیان زیاتر بوو لە پێویستی وڵاتەکە، بە رەشبینی تەماشای داهاتووی خۆیان دەکرد. فەرەنسای ڕێستۆراسیۆن پڕ بوو لە پزیشك بە بێ نەخۆش و پارێزەر بێ مەعمیل و گەنج کە کاتی خۆیان لە سالۆنەکانی دەسەڵاتدارەکان ئەبردە سەر[81]. ئەم گەنجانە کە کەس پێویستی پێیان نەبوو زۆر ئازاریان دەکێشا نەك تەنها لەبەر هۆی مادی بەڵکو لەبەر نەهامەتی ڕۆحی قووڵیش؛ ئەم بارودۆخە وای لێهات کە پێی دەوترا "نەهامەتی سەدە": خاوەنی هیچ ئایدیۆلۆژیەتێك نەبوون کە بتوانێ دڵیان باتەوە و هیچ قەناعەتێك و پرینسیپێکیشیان نەبوو کە لە سەرپەرشتی وجودیان بکات. هەرچەندە کڵێسا لە پۆزیسیۆنێکی باشدا بوو و ئاینیش هاوپەیمانێکی باشی پاشا بوو، بەڵام ئاین نەیدەتوانی دەسەڵاتی ئەخلاقی جارانی هەبێت و خۆی بگرێتەوە لە ئەنجامی ئەو پاڵەی کە شۆڕش پێوەی نابوو. گەڕانەوەی ڕۆمانتیکی بۆ کاتۆلیکیەت کە لە لایەن شاتۆ بریانەوە chateaubriand پێشخرابوو، نەیدەتوانی کار بکاتە سەر فەنتازیای گەنجان و هیچ سیستمێکی قیەمیش (القیم) نەبوو کە ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە. بە بۆنەی ئەم نەوەیە Alfred de Musset لە نووسراوێکدا بەناوی "ئیعتیرافی منداڵێکی ئەم سەدەیە" تێبینی ئەکرد: "بە داخەوە، بە داخەوە، ئاین خۆی ون کردوە.. نە ئامانجمان هەیەو نە چاوەڕوانی شتێك دەکەین، دوو پارچە تەختەی رەشیشمان نیە کە دەستمانی پێوە بگرین.. ئەوەی کە هەمان بوو ئێستا نیمانە. ئەوەی کە هەیە لە داهاتوودا نامان بێت". نەوەیەکی گەنج بوو کە با نابەختەوەر بوو لەو هەستەی کە ڕێستۆراسیۆن و پادشایی لولیۆ شانازیان پێوە ئەکرد و تینووی ئیمانێکی تازە بوو کە بتوانێ واتایەك بدات بەوەی کە لەوەی ئەکرد بێ واتا بێت و هەستی ناخۆش و بەتاڵی تەنیایی و بێ هیوایی پڕ بکاتەوە.

### 2-4 بەڵێنی زانست

خوێندنگای پۆلیتێکنیك، کە لە ساڵی 1794 دامەزرابوو، لە سەردەمی کۆنت بە باشترین خوێندگای زانستی دەژمێرا لە فەرەنسا و لە بەشی یەکەمی سەدەی چواردەهەم سەنتەرێکی بێهاوتای پێشکەوتنی زانستی ئەورووپا بوو.

خۆی تێیدەگەیشت- وتی: "کاتێك هیتلەر دەستی گرت بەسەر دەستەڵاتدا، زۆرێك هەبوون ئومێدیان وابوو شۆڕش هەڵبگیرسێت. دەشێ ئەم ئومێدە تەنیا خەون و وەهم بووبێت. بەڵام ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەوەیە ئەم خەونە یان ئەم وەهمە، لە ساڵی 1923وە دەستی گرت بەسەر کارەکانمدا. من پێڕەوی مارکسیم لەو لایەنەوە قبووڵکرد کە جەختی دەکرد باشترین کۆمەڵگا بە شۆڕش نەبێت بەدی نایەت". دواتر هۆرکهایمەر چەند گۆڕانکاریەکی لەم شیکردنەوەیەدا کرد، بەڵام ئەو تۆوە لە خۆیدا هەڵدەگرێت کە ڕەسەنایەتیو تایبەتمەندێتی قوتابخانەی فرانکفۆرت پێکدەهێنێت.

گەر بمانەوێت ئەو شیکردنەوەیە بە کورتی بخەینەڕوو، دەڵێین: هۆرکهایمەر لە لایەکەوە ڕەسمی هێڵە پانەکانی ئەو زەروورەتە دەکات کە ئەمڕۆ ئاوقای هەموو تیۆرەیەك بۆ زانین دەبێت کە بیەوێت تیۆرەی کۆمەڵگا بێت و بە هوشیاریەوە دەرکی پێبکات. هەموو تیۆرەیەك لە خودی خۆیدا نیشانەی ئەو شوێنە کۆمەڵایەتیە هەڵدەگرێت کە تێیدا گەشە دەکات. ڕۆح ژیانێکی تایبەت و پوختەی نیە کە ڕێی بدات تەجاوزی بارودۆخی بوون بکات و بگاتە سروشتی شتەکان. "ژیانی کۆمەڵگا بریتیە لە بەرهەمی ئەو کارەی کە سەرجەمی بەشەکانی بەرهەمهێنان دەیبەخشن، هەتا ئەگەر دابەشکردنی کار لە جیهانی سەرمایەداریدا بەشێوەیەکی خراپ بێت، ئەوە ڕێمان پێنادات ئەو بەشانە وا ڕەچاو بکەین کە خۆیان لە خۆیاندا سەربەخۆن. ئەم بەشانە بریتین لە شکڵە نەوعیە تایبەتەکانی ئەو پەیوەندیە دینامیەی کە کۆمەڵگا لەگەڵ سروشتدا دەیبەستێت و، ئەو توانایەی کۆمەڵ سەرفی دەکات لە پێناوی بەردەوامبووندا وەکو خۆی. نە بونیادی بەرهەمهێنانی پیشەسازیی و کشتوکاڵیو نە دابەشبوونی وەزیفەکان بۆ وەزیفەی سەرۆکایەتیو وەزیفەی جێبەجێکردن، هیچیان لە سروشتدا جێگیر نین، بەڵکو وابەستەی تەرزی بەرهەمن وەك لە هەندێك لە شێوەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیدا هەیە. وتەی ئەوەی هەر تیۆرەیەك دەبێتە ئەنجامی ململانێ بەرژەوەندیدارەکان، مانای ئەوەش کە لە بەردەمی ئەو زەروورەتەشدایە کە خەڵکی بەلایەنی کەمەوە بە شێوەیەکی جوزئیی بەشداری دەکەن لە دیاریکردنیدا، ئەوا ئەو فیکرەی بیەوێت عەقڵانی بێت، دەتوانێ، بەڵکو ناچارە، کاربکاتە سەر پێکهاتەی ئەو کۆمەڵگایەی کە نایەکسانی باڵی بەسەردا کێشاوە. ئەم بیردۆزە ڕەخنەییەی کەلە بنەڕەتدا پێوەست نەبێت بە کۆمەڵەی نەتەوەییەوەو سەربەست نیە لە هیچ پەیوەندیەك، ئەم ئیختیارەی پەسەند کرد؛ مارکسیزمیش باشترین ڕوونکردنەوەی تیۆریی پێشکەش دەکات و ڕێگا دەکاتەوە بۆ وەرچەرخانی عەمەلی. ئەو تیۆرە ڕەخنەییەی کە زانایانی کۆمەڵزانی قوتابخانەی فرانکفۆرت چاوەڕێ بوون کە جێگەی فەلسەفەی کۆن بگرێتەوە، هیچ ڕەگ و ڕیشەیەکی نیە جگە لە هەستکردن بە لێپرسراویی لە بەرامبەر چەند ڕووداوێکدا کە شێمانەکەیان زاتیی نەبوو، ڕووداوگەلێکن کە پێویستیان بە ڕاڤەکردنێکی بابەتیانەی زۆر هەیە. ئەمەیە ئەسڵی ئەو بیرۆکە ڕەخنەییەی کە دەڵێت پێویستە فەلسەفەی تەقلیدی میسالی کە گوێ ناداتە مومارەسەی

سیاسی، جێگەکەی خۆی چۆڵ بکات بۆ تیۆرەیەکی تر کە جێی مومارەسەی مێژوویی تێدا دەبێتەوەو لە هەمان کاتیشدا لە توانایدا هەیە پشت بە بنەما مارکسیستەکان ببەستێت، پشت بە ڕەخنەگرتن لە ئابوریی سیاسی ببەستێت، واتە ئەو بوارە دیارەی ژیانی کۆمەڵایەتی و لەوێدا پەیوەندیەکانی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگا گەشە دەکەن".

لە لایەکی تریشەوە هۆرکهایمەر سور دەبێت لەسەر وەزیفەی تایبەت بە تیۆریەکە.. ئەو تیۆریە ڕەخنەییە. بە نیسبەتی ئەو ڕۆشنبیرەوە کە سەربازگەی خۆی هەڵبژاردووە ئەوا پێویستە کارەکەی لە سنوری وەسفدا ڕانەوەستێت. وەزیفەی ئەو خەباتەو خەباتیش زامن نیە کە هەموو جارێ بە سەرکەوتن کۆتایی بێت. ڕۆشنبیر بە ئیشارەت پێدانەوە ڕاناوەستێت بەڵکو دەکەوێتە جووڵاندن و وروژاندن. ئەو ڕێگای گۆڕان دەکاتەوە. بە ڕوونترین شێوە وێنەیەکی دیاریکراوی ئاینده دەکێشێت و، بێشك تیۆریستی لیبراڵ پێی وایە کە ئەو چەشنە تیۆریە "خودییو تاکڕەهەندەو شتێك لە سەرچڵیو سەرکێشی تێدایە". سەرباری ئەوەش ئێمە لێرەدا مەبەستمان لە عەقڵی نوێیە. ئاسۆی دووری ئەو عەقڵە بریتیە لە لابردنی ناکۆکی لە نێوان تاکی سادەو ژیرو هوشیار بە ئامانجەکانیو، لە نێوان ئەو پەیوەندیانەدا کە لە کارەکەدا هەیە، واتە ئەو ئیجرائاتەی کە تەواوی بینای کۆمەڵایەتی لەسەری بینا دەکرێت". بە کورتی مومارەسەی کۆمەڵایەتی-ئابوریی مومارەسەیەکی نامرۆییە. بۆیە پێویستە عەقڵی لیبراڵ لەسەر کێوە هێمنەکانی بێتە خوارێ، بەڵام ئەم هەمیشە پلەیەکی نیسبی سەربەخۆیی زاتیی خۆی دەپارێزێت. کەواتە دەوری ئەو لە وریایی و بێداریدایە. پێویستە پەیوەندیی نێوان نیزام و تیلقائیەت لەلای چینی کرێکاران بپارێزرێت.. وەزیفەی ڕەخنەیی بریتیە لە تاوانبارکردنی مەندیی -جمود- بیرۆکراسیانە، کەواتە، تیۆرەکە ڕەخنەییە. فاکتەرێکە کە لە خودی خۆیدا لە جێبەجێکردنی کاردا سەربەخۆ نیە، بەڵام بە ڕاستی فاکتەرێکی نەوعیە.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەر لەو کاتەوە ڕوون ببۆوە کە ئەو هەلانەی کە مێژوو هەڵیان دەگرێت و تایبەتن بە گۆڕانی کۆمەڵگا، وا دەردەکەون کە دەوریان بە جوڵەیەکی سەلبیانەی تەژم گیرابێت. تیۆریەکە وا دەردەکەوت کە ڕووداوەکان بەجێیان هێشتبێت و تەنیا نغرۆ بوونی بۆ مابێتەوە یاخود سەرلەنوێ خۆی بخاتەوە بەرپرسیار: ئایا ئەمە کارەساتی ئەو ڕۆشنگەریە بوو؟ ڕەنگە وشەی کارەسات زۆر گونجاو نەبێت، بەڵام خۆ سەرەگێژەیەکی سەخت لە گۆڕێ بوو، لە شەپۆلەکانیدا مرۆڤ و یەقینەکانی ڕاپێچ کرد.

نازیەت هەموو هیوایەکی شۆڕشکردنی لەناوبردو لەگەڵ مردنی ئەم هیوایەدا پیاوانی فرانکفۆرت هەڵهاتن و چاکیش دەیانزانی چی دەکەن. خێرا هەڵهاتن. بەڵام ئەوانەی دوودڵ بوون لە نرخی ئەو دوودڵیەدا ژیانیان بەخشی؛ بەڵام لە خۆرەڵاتدا، ستالینیزم هیچ بوارێکی نەهێشتبۆوە بۆ بیرۆکەی ڕەخنەو بەرامبەری بیرۆکەی تیلقائیەتی جەماوەریش هەر هەمان هەڵوێستی هەبوو. ئایا ژیان لە خۆراوا باشتر بوو، بەجۆرێك هەموو تاکێکی جوولەکە یان مارکسیست بتوانێت حەشارگەیەك بدۆزێتەوە؟

ئـــەم ململانێیـــەی کـــە ئـــەم دوو جیهانـــەی داوەشـاندبوو، ئایـا گوزارشـتی لـــە سروشـتی هاوشێوەی هـەردوو سسـتمەکە نـەدەکرد؟ ئایـا ناکۆکیەکی حەشار نەدابوو کە هێشتا کەس بـیری لێ نەکردبۆوە؟

با بگەڕێینـەوە بـۆ لای کەسایەتیەکانمان. لـە ڕاستیدا سێگۆشەی ئـادۆرنۆ -بنیـامین- برێخت، شوێنێکی ئـەندازەیی نایابـە کـە تێیـدا دوودڵـی تیـۆرە ڕەخنەییەکـە ڕوون دەبێتـەوە. بنیـامین بایـەخی دەدا بـە ماتریـالیزمی مێژوویـی (بـە ڕێگایەکی تەواو تایبەت بە خۆی)، بۆیـە چـوو بـۆ مۆسـکۆ، لـــە سـەروو هـەموو شتێکیشـــەوە سەراسـیمەی برێخـت بـوو، وەك شـاعیرێکی مارکسی زۆری بـە دڵ بـوو. لـە دانیمـارك چـەند مـانگێك پێکـەوە مانـەوە. بـەڵام ئـادۆرنۆ لـــە فیکرێکی پەتیدا بە ئەزموونتر بوو و زیـاتر ئاگـای لـە ڕووداوەکـان بـوو، بۆیـە خـۆیو پـەیمانگاش لەگەڵیدا، هاوڕێیەتی برێختیـان پـێ بـاش نـەبوو. چونکە "گەر ئەم شاعیرە عەقڵیشی تەواو بووبێت و زۆریش زرنگ بووبێت" ئـەوا بـەردەوام وەفـادار بووە بۆ کۆمۆنیزم -سەرباری بوونی ستالینیش- هـەمان کوێرایـەتیش چـاوەڕوانی بنیـامین بـوو. پێکهاتەی تیۆرییانەی بنیامین ئامـاژەی بـۆ ئـەوە دەکرد کـە سـۆزی بـۆ سـتالینیەت سروشـتێکی دیکـەی غـەیرە تیۆریـی هەیـە، ئەمـەش مانـای وازهێنانـــە لـــە دیقـــەتی تیـــۆریو هەڵـــهاتن و هەڕەشەکردن لە بەپیتی خولڤێنەرانە. هەرچۆنێك بێت، سـتالینیزم چینـی کرێکـارانی دەخنکـاندو گەمـەی پێدەکـردو بـەوەش پرەنسیپی ململانێی چینایەتی بەرەو ناکۆکییەکی قووڵتر دەبرد. بۆیـە لە پاڵ ڕەخنەکردنی دەوڵـەتی هیگڵیدا پێویست بوو مێژووش ڕەخنە بکرێت. ئەگـەر مـارکس وەك خاڵێکی جەوهەریی مابێتەوە ئـەوا لـە مـەیدانێکی فراوانـــتردا دەخرێتـــەڕوو.. ئەگـــەر هێشـــتا بیردۆزەکـەی مـارکس و ئـەنگلز پێویست بـن بـۆ تێگەیشـتنی دینـامیزمی کۆمەڵایـەتی، ئـەوا چیـتر بەس نیە بۆ شەرح کردنی پەرەسەندنی نـاوخۆیی میللەتان و پەیوەندیی نێوانیان، وەك هۆرکهایمەر لـــە کتێبـــی "تیـــۆرەی تـــەقلیدی و تیـــۆرەی ڕەخنەیی" لە لاپـەڕە(9)دا باسـی لێوە دەکـات. هۆرکهایمـەر ڕوونـی کـردەوە کـە هـــەنگاوێکی گوێزرانـــەوە هەیـــە کـــە هـــەرگیز بـــەرەو دواوە ناگەڕێتەوە.

*ڕۆشنگەریی.. ئەفسانەو ئەرك:*

کـاتێك مێژوونـووس کتێبـــی "دیالـەکتیکی عەقڵ" ئادۆرنۆو هۆرکهایمەر، یان کتێبـی "عـەقڵ گیران"ی هۆرکهایمـەر دەخوێنێتـەوە زەحمەتـە جگـە لـــە چـــەند شـــوێنەوارێکی فەلســـەفەی ڕۆشـنگەریی سـەدەی هـەژدە، شـتێکی تـر بدۆزێتەوە، زەحمەتە جگە لە چەند شوێنەوارێکی فەلسەفەی ڕۆشنگەرایی سەدەی هەژدە، شـتێکی تر بدۆزێتەوە. لە بەرامبەری ئەو گەشبینیەدا کە لـە بـەکارهێنانی عـەقڵدا دەوروژێـت، دەبینـین فەیلەسووفە ئەڵمانیەکانمان ڕەخنە لە خودی ئەو عەقڵە دەگرن و دەگەنە ڕێگایەکی نیمچە داخـراو. هۆرکهایمـەر لـە لاپـەڕە (48)ی "ڕەخنـەکردنی عـەقڵ"دا دەڵێـت: "لەگـەڵ فراوانبوونـی ئـابوری بـازاڕی بـۆرژوا، ئاسـۆی تـاریکی ئەفسـانە بـە ڕۆشـنایی عـەقڵی ڕونـاك بـۆوە، وەلێ تیشـکە ساردەکانی تـۆوی بەربەریەتیان سـەوزکرد". لـە سـەرەتای یـەکێك لـە مەقالـە تورەکـانیدا بـە ناونیشانی "عەقڵ و پاراستنی دەروون"، هـەمان

گریمانەی کارەساتبار دووبارە دەکاتەوەو دەڵێت: *"خەریکە چەمکە بنەڕەتیەکانی شارستانێتی خۆراوا دەڕمێن، کاتی ئەوە هاتووە بپرسین کە تا چ ئاستێك دەشێ داکۆکی لەو چەمکانە بکرێت؟ چەمکی عەقڵ بریتیە لە چەمکی مەرکەزیی"*. کەواتە، ئاواهی فەلسەفەی ڕۆشنگەریی تۆمەتبار دەکات و بێبەزەییانە هەڵی دەوەشێنێت، بەڵام ئەمە مانای وەدەرنانی عەقڵ نیە بەڵکو ئیرادەی ڕزگارکردنی عەقڵە.

لێرەدا فەلسەفەی ڕۆشنگەریی تێکەڵاوی بەکارهێنانی ئەزەلیانەی عەقڵ ناکرێت. بەڵام سەدەی هەژدە تەنها هەر ساتێکە لەم مێژووە، وەلێ لەدوو ساتێکی جەوهەریە.. لە لایەکەوە مانای کۆکردنەوەو وەگەڕخستنی ئەو میراتەی عەقڵە کە سنوورەکانی خۆی بڕیوە بووە. سەدەی هەژدە بریتیە لە دووبارەکردنەوەی ئەو خۆشیە ساویلکەیەیە کە بەرامبەر عەقڵی دۆزەرەوە هەستمان پێدەکرد، بۆیە پاڵ دەنێت بە بەکارهێنانی عەقڵەوە تا ئەو ڕادەیەی باخچەی مرۆڤ دەبێتە موڵکی عەقڵ، واتە ئەو ڕادەیەی کە ئیتر توانا سەرفکردنی مرۆڤ لە بەرهەمهێناناو کاریگەریی مرۆڤ لە سەر سروشت، هەموویان دەبنە موڵکی عەقڵ، لە کاتێکدا ئەو توانا سەرف کراوە پڕێتی لە کارو ناکۆکی. لەگەڵ ئەوەشدا لێرەدا ناکۆکی لە بەردەمی جووڵەی وشك و حیسابکراوی بەرژەوەندیەکاندا دوادەکەوێت، هەروەها لەبەردەمی ڕووکەشێتی مادیەتیشدا دوا دەکەوێت، ئەمەیە سیمایەکەی تری عەقڵ کە خۆی گێلانە دەردەخات زیاتر لەوەی حەقیقەتی خۆی بخاتەڕوو. لە لایەکی تریشەوە کانت چەمکی ڕەخنەی داناو بەمەش ئاگاداری مەترسی بەکارهێنانی یەکلایەنەی عەقڵی، کردووینەتەوە. لە لای کانت بیرۆکەی عەقڵی ڕەخنەیی هێزی دوورخستنەوەو جیاکردنەوەی تێدایە، لەو کاتەدا کە خەریکی کاری خۆیەتی، نەك تەنیا لە توێی شیکردنەوەی عەقڵەوە، بەڵکو لە توێی پەیوەندی نێوان عەقڵ و کۆمەڵگاوە. بەڵام چی مۆڵەتمان دەداتێ کە ڕۆشنگەریی درێژ بکەینەوە بۆ ناو سەراپای عەقڵی خۆراوایی؟ ئەوە، بەیەك وشە بریتیە لە: بەردەوامبوونی کۆنترۆڵ کردنی زیاترو زیاتری کاریگەریی لەسەر دەرەوەو لەسەر هەموو ئەوانەی کە عەقڵ نین، بۆیە لێرەدا عەقڵ دەشوبهێتە هێزێکی غەریزەیی توندو تۆڵ و ڕێك وەك ئەو هێزەی کە بەردەوامی بانگەشەی ئەوەی کردووە کە جیایە لێی واتە.. سروشت.

بە نیسبەتی ئەو نووسەرانەوە، پەیوەندیی نێوان عەقڵ و سروشت بریتیە لە دوانەی بنەڕەتی. بەڕای ئەوان عەقڵی خۆراوا هەر لە لە دایکبوونیەوە هەڕەشەی ناعەقڵ یان پووچی لەسەرە، چونکە هەمیشە ڕوو دەکاتە ملکەچکردنی ئەویتر لە بەردەمی خۆیدا بۆ ئەوەی سەربەخۆیی وەربگرێت و بپەڕێتەوەو جیایی نێوانیان نەهێڵێت. دەڵێین ناعەقڵ irraison چونکە کۆنترۆڵ، تەنانەت کۆنترۆڵی ناهۆشیارانەش، لە ڕاستیدا جگە لەوەی هەوڵدان بێت بۆ دوورخستنەوەی لەهەر توندوتیژییەکی تر. دیالەکتیکی عەقڵ بریتیە لەو کودێتایەی کە ڕوودەدات و بە پێی ئەو، هەتا عەقڵ وردتر ببێتەوە و زیاتر کۆنترۆڵی بابەتەکەی خۆی بکات زیاتر بەسەر خۆیدا دادەخرێت. بە واتایەکی تر ئەگەر ڕزگاربوونێك لە گۆڕێ بێت، پێویستە باجەکەشی بدرێت. لە کۆتاییدا، عەقڵ بە نیسبەتی هەموانەوە، بووەتە تۆڕێکی تۆکمە و پتەو لە حوکمە دیاریکراوەکان، لەو ئەفسانەیە مەندترو ڕەق هەڵاتووتر نیە کە لەسەر ئیقاعی حەتمیەت ڕێك دەخرێت. لە لاپەڕە (39)ی

حەتمیەت ڕێك دەخرێت. لە لاپەڕە (39)ی دیالەکتیکی عەقڵی هۆرکهایمەرو ئادۆرنۆ، ئەمەی خوارەوە دەخوێنینەوە:

*"زمانی زانست بە بێلایەنی خۆی، بواری گوزارشت کردن دەڕەخسێنێت بۆ ئەوەی کە خاوەنی مێژێك نیە. بوونەوەرەکان لە زانستدا ڕەمزە بێلایەنەکانی خۆیان دەدۆزنەوە. ئەم میتافیزیایە لە خودی میتافیزیا میتافیزیایی ترە. عەقڵ تەنیا هەر ڕەمزەکانی لە کارنەخست و هیچی تر بەڵکو میراتگرانی ئەو ڕەمزانەشی لەکارخست، واتە چەمکە گەردوونیەکان. لە میتافیزیا هەر ترسانی پەتی لەلای کۆمەڵی مرۆیی، مایەوە، ئەو ترسەی کە ئەفسانەی لێکەوتەوە"*. باڵادەستبوونی عەقڵ بەسەر بابەتدا هەرگیز تەدارەکێکی تیۆریی نەبووەو بەس، بەڵکو بریتی بووە لە کۆنترۆڵکردن و ڕێکخستنی جیهان لە یەك کاتدا مێژوو لە مێژووی عەقڵ جیانابێتەوە.. مێژوو بریتیە لە نوسخەی فەوریو کرداریی کارەکانی عەقڵ. تەقینەوەی مێژوو بوو کە پاڵی بە بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە نا بۆ پرسیارکردن لە عەقڵ.

ئێمە ناتوانین لە ڕەخنەی قوتابخانەی فرانکفۆرت تێبگەین گەر نەیبەستینەوە بە ڕووداوەکانی ئەڵمانیای نازیو کەللەوشکی سۆڤێت و کۆمەڵگای پیشەسازیەوە. سەرچاوەی فیکری فرانکفۆرت لە قووڵایی جەنگی نوێدایە، جەنگی سەرانسەریی، ئەم ئامرازە تۆقێنەرەی کە ڕەزمەکەی لەسەر غەریزەیەکی بەربەریانەی بێسنوور ڕێك دەخرێت، غەریزەیەك کە بێ سڵکردنەوە دەجۆشێت بۆ کاولکاریی. ئەم وێرانکاریە ناشێ ڕێکەوت بێت یان هەڵەیەکی چاوەڕوان نەکراو بێت، ئەوە بەرهەمی عەقڵێکە کە سەرکێشیو سەرچڵیەکەی دەیبات بۆ سنووری ناعەقڵ. وشەی "وێرانە" دوایین وشەیە لە دەقەکانی فرانکفۆرتدا. لە لاپەڕە (57) دیالەکتیکی عەقڵدا دەخوێنینەوە: *"ئەمڕۆ، لەو ساتەدا کە یۆتۆپیای فرانسیس بیکۆن دێتەدی، واتە کۆنترۆڵکردنی سروشت بەکردار، بەجوانی کرۆکی ناچارکردن و ملکەچکردن دەبینرێت، کە ئەو دەیداتە پاڵ سروشتی جڵەونەکراو، ئەم ناچارکردن و ملکەچکردنە خۆی بریتیە لە کۆنترۆڵ. ئەو زانینە کە بەلای بیکۆنەوە سەرکەوتوویی و مەزنیی مرۆڤ بوو، دەتوانێت دەست بکات بە خاپوورکردنی سەرکەوتوویی و مەزنیی خودی ئەو مرۆڤە"*.

بەلام بە زینی عەقڵ مانای دەسبەرداربوونی نیە. گرفتی ئالۆسکاو لێرەدا بریتیە لە بەکارهێنانی ڕەخنەییانەی عەقڵ. چونکە نرخی تیۆریی چیە، تەقلیدی بێت یان ڕەخنەیی ئەگەر پەکی بکەوێت لە بەردەمی ئەو مێژووەدا کە بەشداریی لە بیناکردنیدا کردووە؟

لە کتێبی "گیرانی عەقڵ-ل183"دا دەخوێنینەوە: *"ئەگەر مەبەست لە ڕۆشنگەریی و پێشکەوتنی فیکر، ڕزگارکردنی مرۆڤ بێت لە باوەڕی پڕو پووچ بە هێزە خراپەکارەکان و شەیتان و هۆری و چارەنووسی کوێرانە، بە کورتی ئەگەر مەبەست ڕزگارکردنی مرۆڤ بێت لە ترس، هەر ترسێك بێت، ئەوکاتە تاوانبارکردنی ئەوەی پێی دەوترێت عەقڵ گەورەترین خزمەتێکە پێشکەشی مرۆڤ بکرێت"*. لێرەدا دوو بابەتی بنەڕەتی دەدۆزینەوە: لە لایەکەوە عەقڵ ترسی ئەفسانەیی ڕیشەکێش کرد، بەوەی خستیە ناو کردەی کۆنترۆڵکردنی سروشتەوە، لە لایەکی تریشەوە پرۆسەی گۆڕینەوەیەك یان ئالوگۆڕێك

ڕوویدا: ئەو یەکێتیەی لە نێوان کۆمەڵگاو کۆنترۆڵدا هاتە دی لە پێناوی جڵەوگیرکردنی سروشتدا بریتیە لە نوسخەی پێچەوانەی باڵادەستی سروشت بەسەر مرۆڤدا یان کەوا درابووە پاڵی. بەمجۆرە دەسکەوتە تەکنیکیەکان و هەموو ئەو پێشکەوتنە ئاشکرایەی بەدی هاتووە، نەیتوانی هاوسەنگیەکی ماقووڵ لەگەڵ بەربەریەت و چەقبەستنی کۆمەڵایەتیو نەهامەتی زۆرینەی خەڵك و، ئەم پەرش و بڵاوبوونەوەیەی کرۆکی مرۆڤ لە عەدەم و بۆشاییدا. بە نیسبەتی عەقڵەوە گرفتەکە بوو بە هەموو دەرەوەی خۆی. بابەتێتیو تەجرید و دابەشبوونی لۆژیکیانە بوو بە تۆڕێك هەڵدەدرا بۆ هەموو فرەیەکی لە ژمارە نەهاتوو، هەتا دیلی دەکرد. ئەنجامی ئەو کارەی کە عەقڵی لۆژیکی ئەنجامیدا زۆر سەرسوڕهێنەر بوو، کە ئەمەش سەرسوڕمانی دروست کرد کە ئەمیشیان پرەنسیپی فەلسەفەیە: دەرەوە خۆی تەسلیم کرد، واتە دەرەوەی عەقڵ، سروشت زۆر جیڕو تۆکمە دەرکەوت. عەقڵ بێماندووبوون و لێزانانەو بەهێزەوە، پرەنسیپێکی شاراوە پاڵی پێوە دەنا، بۆ نزیککردنەوەی ئەو دەرەوەیە. بەڵام لە کۆتاییدا دەرکەوت کە ئەم "نا-سنورداریە" بریتیە لە تەڵەی خەڵەتێنەری عەقڵ، لەلای هۆرکهایمەر، عەقڵی بابەتی لەوەدایە کە سروشت بە نیسبەتی ئەوەوە بریتیە لە سیستمێك کە پێویستە مرۆڤ جێی خۆی لە ناویدا بدۆزێتەوە، بەڵام دروستکەری ئەو سیستمە نیە. ئەم عەقڵە لە دوو لایەن پێکدێت.. لە لایەکەوە عەقڵی بابەتی وا دەرك بەخۆی دەکات کە بونیادی حاڵەتێك بێت لە واقیعدا، نەك بەو حسێبەی ئامرازێك بێت لە دەرەوە بەسەر دەرەوەیەکدا پیادە بکرێت کە تەنیا بە پەیوەندیی ڕوانین و کۆنترۆڵکردن و ڕێکخستن پێوەی دەبەسترێتەوە، لە لایەکی تریشەوە هۆرکهایمەر بە وتەیەکی یەکلایی کەرەوە ئاماژە دەکات بۆ ئەو هەڵوێستەی کە لەم پەیوەندیەوە دەکەوێتەوە، دەڵێت: بونیادی وا "کەس دەرکی پێناکات، ئەو کەسە نەبێت کە ئەرکی فیکری دیالەکتیکی دەخاتە ئەستۆی خۆی، یان ئەو کەسەی توانای ئیرۆسی تێدایە، واتە توانای خۆشەویستی و ڕزگاربوون، لەبەر ئەوەی سستمە کلاسیکیەکانی عەقڵی بابەتی چەقبەستنێك دەشارێتەوە کە دەشێ بگەڕێنرێتەوە بۆ ترسە کۆنەکەو بۆ نابینایی دوژمنکارانەی مرۆڤ، ئەو ناتوانێت خۆبەخۆی هەبێت. ئەوەی عەقڵی بابەتی بەرهەمی دەهێنێت لە واقیعدا بریتیە لە شکۆدارکردنی سستمێکی حەتمی بۆ گەردوون و بەوەش دەبێتە بەرهەمێکی میتۆلۆژییو بەمەش دەبێتە بەرهەمێکی مێن ڕێژکراو بە ناکۆکیەکی مادیانەی بێ چارەسەر، بەڵام ئەگەر ئەو بەرهەمە ڕێزی گرت لە دوانەی عەقڵ و سروشت، ئەوا دەگۆڕێت بۆ سستمی چەقبەستوو کە باس لە ئەزەلیەت دەکات و واقیعی مادی پشتگوێ دەخات. ستەمی کۆمەڵایەتی لە سەدەی نۆزدەدا، واتە لەگەڵ سەرەتای چاخی پیشەسازیدا ببووە لەمپەرێك لە بەردەمی ئەنتۆلۆژیایەکی ڕاستەقینەدا (واتە زانستی بوون)، بۆیە شتێکی حەتمی بوو کە سیفەتی شمولیەت -گەردوونیەت، بە تەواویی وەهمیی بێت، بەڵکو هەر ئەوەش خرایە بەردەمی ئەنتۆلۆژیا" بە بڕوای هۆرکهایمەر ئەمەیە ڕێگای وێڵبوون کە میتافیزیا تیایدا ون بوو، دیارترین نمونەش بۆ ئەمە هیگڵ خۆیەتی. لەلای هیگڵ نەفیکردنەوەی دیالەکتیکیانە تاقە ڕێگایە بۆ فەلسەفە، دەری دەهێنێت لە هەموو ڕەوتێکی زانستیانەو دووری دەخاتەوە لە هەر ئەنتۆلۆژیایەك کە حەزی نەفیکردن نەبێت، بەڵام

ئـەفیکردن لـەلای ئـەو هەمیشـە سـاتێکە لـە قۆناغەکانی چەمکی زانینی ڕەها، لێرەدا عـەقڵی زاتیی لە عەقڵی بابـەتی جیانابێتـەوە، مەگـەر بـە سەرکەوتوویی مـن (ego). ئەمـە بەرهـەڵداکردنی سروشتە، چونکە ئەوە مانـای وایـە لـە دەرەوەی هیچ بەرگریەکی بالادەست لە گۆڕی نیە. کەواتـە، لـەوێدا فەسڵکردنێکی سروشت هەیـەو بـەوەش دەبێتـە شتێك یـان مادەیـەك کـە وەك پاڵپشتێك وایە بۆ هەموو کردەوەکانی عەقڵ. جیاکاریەکـەی دیکـارت لـە نێوانـی فیکرو مـەودا، ئەمـەیان بـە ئەنجامەکان قورس کراوە. ئـەو بـە شێوەیەك لـە شێوەکان بـواری بێلایـەنکردنی دەرەوە دەدات. ئەنجامەکەشی بڵاوبوونەوەی کۆنـترۆڵی زانستیە. بەڵام چوونەوە یـەك وکشانەوەش، کـە هێشتاکە ئەمان دیوە، بایـەخیان لـەوە کـەمتر نیـە. ئەگـەر عـەقڵ -ئـامراز، زامنـی پێشـکەوتنێکی نکوڵـی لێنـەکراوی کـردووە، ئەگـەر مەبەسـت لـەوە ڕێکخسـتنی جیـهان و بڵاوکردنـەوەی تەکنیکـە کاریگـەرەکانـە، ئـەوا گۆڕینـی عـەقڵ بـۆ ئـامرازێك بەکارهێنەرەکەشـی دەدات بـە زەویـدا. نرخـی بالادەستی زانست بریتیـە لـە شێواندنی خـودو، ئەم نرخەش لە نێوان ساردوسـڕیی بۆرژوازییانـەو ڕەتـاندنی زۆرینـەی خـەڵکدا دێت و دەچێت، لـە سـەرکوتکردنی زاتیـەوە بـۆ دژایـەتیکردنی هـەر مرۆڤێك بۆ ئەوەی تر. عەقڵ، کە بۆتە ئـامرازێکی بڕنـدە، بووەتـە زامنـی سـەروەری. بـەڵام ئـەو سـەروەریە کـە بـووە بـە ئامـانجی خـۆی قڵـپ دەبێتـەوە بـۆ ململانێیـەکی گشـتی لـە پێنـاوی دەستەڵاتدا. هۆرکهایمەر لە لاپەڕە (21)ی کتێبی "دیالـەکتیکی عـەقڵ"دا دەڵێـت: *"لـە هـەموو سـەردەمەکاندا ڕۆشنگەریی بـە مانـای گشـتیی فیکـری پێشـکەوتوو، هەمیشـە ئامـانجی ڕزگـارکردنی خەڵکـە لـە تـرس وکردنیانـە بـە سەروەر، وەڵێ ئەمڕۆ زەویی تـەواو ڕۆشـن، لەژێر ڕەمـزی کارەسـاتە سـەرکەوتووەکانی هـەموو شوێنێکدا، دەبریسکێتەوە"*.

گواستنەوە لـە عـەقڵی بابەتیـەوە بۆ عـەقڵی زاتی بە تەواوی دەکەوێتە ناو لۆژیکی عەقڵەوە. هـەروەك هۆرکهایمـەر دەڵێـت "گواسـتنەوەکە ڕووداوێکی سەرپێی نەبوو" گیرانی عەقڵ، ل71- . بەڵکو بەسانایی هەنگاوێکی ترە لەسـەر ڕێگای زانینی سەرچاوەکانی عەقڵ، هەر ئەوەندەی زانی چـۆن سـنوورەکانی خـۆی دیـاریی دەکـات و دەسبەرداری تەماحـە منداڵانـەکانی دەبێت کـە دەیویسـت بگاتـە هـەموو حەقیقـەت، ئیـتر چالاکیـەکانی خـۆی لەسـەر چـەند دراوێکـی دیاریکراو مومارەسـە دەکات. لـە لاپـەڕە (22)ی دیالەکتیکی عەقڵدا دەڵێت: *"تـەکنیك بریتیە لـە جەوهەری ئـەو زانینـە. تـەکنیك تـەنیا بزوێنـەرێك نیە بۆ بڵاوبوونەوەی زانستەکان، بەڵکو بریتیە لە وەرچـەرخانی تـەواوی جیـهانی سروشـتیو کۆمەڵایەتی. ئەو کاردەکاتە بابەت و خودو هەموو تـەرزەکانی پـەیوەندییو کـاروزمـان"*. ئـەو ئیغراکردنـەی کـە مومارەسـەی دەکـات و ئـەو سەرکەوتنەی کە بەدەستی دەهێنێت کار دەکەنە سەر شکڵی زانین. ئەگەر زانـین بـۆ خـودی خۆی پـەرە دەسـێنێت لـە بەرامبـەری مـادەدا بـەو ڕەچـاوەی کـە قـابیلی کارتێکرانـە، ئـەوا چارەنووسی زانـین ئەوەیـە زیاترو زیاتر شکڵیی بێت تا وای لێبێت دەتوانێت بە تـەواویی بینـای بابەتەکەی خۆی بکـات یـاخود سـەرلەنوێ بینـای سروشت بکاتەوە -ئەگەر بگونجێت وا بگوترێت- . تاکو دەبێت بە سستمێك، سستمێکی ناوازە. لە دیالەکتیکدا دەڵێت: *"لۆژیکی شکڵی بریتی بوو لە قوتابخانەی گەورەی یەکخستن* - التوحيد-ل22" لە توێی ئـەم پەرەسەندنەوە ماتماتیك بوو بەو

زانسته ڕووناکه به هەموو شەفافیەت و پوختەیی خۆیەوە لە تۆکمەیی لۆژیکیدا. عەقلّ وای لێهات باوەڕی وا بێت کە لە خورافە دوورە، لەو کاتەدا کە وتی ناسنامەی حەقیقەت و جیهانی ماتماتیکی جووتن: "فیکر وای لێهات خۆی ماتماتیك بوو. بەمەش ماتماتیکی سەربەست بوو، بوو بە ناوبژیوانی ڕەها". بەڵام ئەم گۆڕینەی ناو بە ڕەمز، سروشتی ناوەوەی عەقلّ دەشێوێنێت.

هۆرکهایمەر لە لاپەڕە (201)ی گیرانی عەقڵدا دەڵێت: *"بەم شێوەیە، عەقلّ وا دەرکەوت کە تارماییەکەو لێیەوە نەریتێکی زمانەوانی دەرکەوت"*. لە بەردەمی ئەم خودموختاریە شکڵیەدا لە لۆژیکی ماتماتیکیدا، مرۆڤیش خودموختاریی لە بەرامبەری سروشتدا دەسکەوت، بوویە سەروەرو خاوەن موڵك، بەڵام بووش بە ژمارەیەکی ڕووت، چی لە مرۆڤ دەمێنێتەوە؟ لەلای کانت، سەربەستیەکی کرداریی، بەڵام ئەو سەربەستیە لە شانشینێکی دیکەدا موماسەرە دەکرێت غەیری ئەم شانشینە دیارو بەرچاوە. "من"ێکی ئەزمونی ملکەچ بۆ یاسای دیاردەکان و "من"ێکی باڵای بێسیما هاتنە گۆڕێ، مرۆڤ بوو بەو کامێرایەی لەگەڵ هەر نواندن یان وێنەگرتنێکدایە. مرۆڤ لە سستمەکەی خۆیدا یەکسان بوو بە خوداوەند. ئەمەش مناوەرەیەکی زیرەکانەیە لە لایەنی گوتاریی زاتی عەقڵەوە، کە گاڵتەی دێت لە سۆزی عەقڵی بابەتی بۆ باوەڕە خورافیەکان و بێهۆشانە ئاین بنکۆلّ دەکات. پۆزەتیفیزم "ئەم تەکنۆکراتیزمە فەلسەفیە" بریتیە لە ئەنجامی عەقڵی زاتی. ساویلکەترە لە هەموو شکڵیە کۆنەکانی گەڕانەوە بۆ عەقڵی پۆزەتیف،. چونکە زانست دەبێتە ئەو تەدارەکانەی لە فیزیادا بەکاردەهێنرێن بەبێ بینینی ئەو ناکۆکیە شاراوەیەی لەو جەختکردنەدا هەیە کە دەڵێت زانست بەناوی تایبەتی خۆیەوە قسە دەکات و عەقلّ جگە لە ئامرازێك هیچی تر نیە". ئەمەیە بۆگەنبوونی عەقڵی زاتیو لادانی -ئینحیراف کردنی-: ئەوە لەخۆی دەشارێتەوە کە ئامانج کراوە بە هۆکار. ئیتر تیۆریی دەبێتە ئیجراکردنێکی کرداریيو هیچی تر. ئێمە لە جیهانێکدا دەژین ڕێڕەوی خۆی ون کردووە. ئەوە ونبونێکە بە تەواویی ناکۆکە لەگەڵ ڕزگاربوونە داواکراوەکەدا.

بەڵام هانابردنی عەقلّ بۆ پرەنسیپێکی نهێنی شاراوە کە بە زەرورەت دەبێتە هۆی ئاشکرابوونی بۆگەن و نادروستی ئەو، لێرەدا بەڕوونی دەردەکەوێت کە زانست و ئایدیۆلۆژیا و، ئەندازیاران، فەیلەسووفان لە خزمەتی ئەو کۆنترۆڵەدان کە بە مانایەك لە ماناکان مانای "کرۆك"ی کۆمەڵگایە کە لێوەی ئەم بەکارهێنانەی عەقل تەشەنەی کردووە. ئەم کۆتاییە نەخۆشی ئەم عەقڵە دەردەخات: "جیهان وەك نێچیرێك دەبینێت" بە پێی قسەی هۆرکهایمەر لە کتێبی "گیران دا،ل283" *"ڕەنگە عەقلّ شتێك بێت زیاتر لە سروشت، بەڵام بەومەرجەی بیرۆکەیەکی ئاشکراو بەرهەستی هەبێت لەسەر سروشتی شاراوەی خۆیو حەزیی لە کۆنترۆڵ، ئەو مەیلەی کەوای لێدەکات بە سروشت نامۆ بێت"*. پێش ئەوەی لە ئەسڵی ئەم نەخۆشییە بکۆڵینەوە، پێویستە یەکەمجار ئەو ئەنجامانە بزانین کە بوونەتە هۆی ئەوە.

ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر لە چەمکی خۆیاندا لەمەڕ فەلسەفەی ڕۆشنگەریی لە ئەڵمانیا، وتە جەرینەکەیان لەمەڕ گەڕانەوەی عەقلّ بۆ خورافە پێشکەش دەکەن. ئەو عەقڵەی لێرەدا بابەتی لێکۆڵینەوەیە خاسیەتێك یان بەهرەیەك نیە،

بەڵکو هەڵویستێکە. هەڵویستێکە بێشك كۆششی زانین ڕێنمایی دەکات و بەرهەمی دوو کارتێکەرە کە بریتین لە ترس و ئەوەی ترس بەرهەمی دەهێنێت واتە کۆنترۆڵ. بۆیە ئەوە هەڵویستێکە بە توندیی پێوەندیی بە تەرزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییەوە هەیە کە لەوێدا سیاسەت و ئابووریی و دینەکان و ئاکارەکان تێکەڵاو دەبن، بۆ گەیشتن بەیەك ئامانج. کەواتە چۆن دەتوانین ئەو جووتبوونە یان نیمچە جووتبوونە ڕوون بکەینەوە، لە ناسنامەی عەقڵ و خورافەدا، یان ئەفسانەدا؟

دەقەکە بە تێڕوانینێکی پانۆرامیی دەست پێدەکات دەربارەی حاڵەتی مەسەلەکان و دەروونەکان، تێڕوانینێك کە ئازارو پەژارەی پێوەیە. لەگەڵ کۆتایی هاتنی ڕۆشنگەریدا کامەرانیش بە زانینی سەربەست کۆتایی هات، ئەو زانینەی تەماحی حەقیقەتی هەبوو، بیرۆکەی شاد بوون بەژین خنکا. "لە جێی ڕۆشنگەریی و گەشبینی پێڕەوی ڕەتاندنی کاری ئەوانیترو پێکەوەنانی سەرمایەهات"، لەسەر ئاستی ڕۆشنبیریش بڕواکردنی خێراو دورکەوتنەوە لە گومان و وەلامی سەرپێیی و دەرخستنی ڕۆشنبیریی و ترسان لە ناکۆکیی و چرووکیی و تەوەزەلی لە گەڕان و گۆڕانی زانیاریە جوزئیەکان، تەشەنەیان کرد. یۆتۆپیا بەسەربڕین چوو، یەکێتیی نێوان تێگەیشتن و سروشتی شتەکان نوشوستی هێنا، چونکە مەلسوکەوت لە ئەندێشەی ئەفسانەییەوە نەگۆڕا بۆ گوتاری عەقڵ. عەقڵ ئاسمانی لە ناواخنەکەی بەتاڵ کردەوەو خواوەندەکان یان یەزدانی بێدەگ کرد، بەلام ترسا لە پاشماوەی ئەفسانەکان، لەوانەی لکاون بە جەستەو زمان و مرۆڤ خۆیەوە، کە ملکەچ نین بۆ یاسایەك یان ژمارەیەك، عەقڵ لە بیناکردنی گەردوونێکی گونجاو و سازاو بۆوە. بەلام گەردوونەکەی ئیستاتیکی و دووبارەیە، ڕێك هەروەکو ئەفسانە. هۆرکهایمەر دەڵێت: *"مرۆڤ پێی وایە کاتێك کە شتێکی نەزانراو- مەجهول- لە گۆڕی نەبێت، ئیتر لە ترس ڕزگاری بووە. بەم شێوەیەش ڕێگا خۆش دەکات بۆ داماڵینی سیفەتی ئەفسانەیی لە عەقڵ. عەقڵ بریتیە لە ڕەسەنکردنی تۆقینە ئەفسانەییەکە، هاتنی پۆزەتیفیزم کە دوایین بەرهەمی عەقڵە هیچ شتێکی تر نیە جگە لەوەی کە دەشێ وەك "تابۆ" یەکی گەردونی سەرانسەریی وەسف بکرێت"* پێویستە هەموو شتێك بچێتە ناو بازنەی عەقڵەوە. پێویست ناکات هیچ شتێك لە دەرەوە هەبێت، ئا ئەمەیە سەرچاوەی تۆقینەکە"، چونکە گەردونیەتی چەمکەکان بریتیە لە پاڵپشتی چارەسەرەکان.

بەلام کامەیە ئەو گیانە شاراوەیەی ئەو ئیرادەیەی کە دەکۆشێت بۆ ڕوونکردنەوەو ڕامکردنی هەرچیەك سەر بە سروشت بێت. وا دیارە ئەوە بریتیە لە دڵپیسکردن لە هێزێکی دەرەکی. مرۆڤ خۆی دروست دەکات یاخود پێی وایە کە خۆی دروست دەکات، کاتێك کە وێنەیەك لەو هێزە بۆ خۆی پێکەوە دەنێت. "بەو وێنەیەی کە مرۆڤ لە هێزە نەبینراوەکەوە دروستی دەکات، دەگاتە ناسنامەی من کە ناشێ بە جووتکردن لەگەڵ ناسنامەیەکی دیکەدا ون بکرێت؛ بەلام لێرەدا بە تەواوی خاوەندارێتی "من" دەکرێت بەو حسێبەی دەمامکێکی کەڕوڵاڵەو چوونە ژوورەوەی مەحاڵە". وێنەکە لێرەدا ئەنجامێکی دوو سەرەی هەیە: ناسنامە لە مرۆڤ داگیر دەکات، ئەو ناسنامەیەی کە بە وەرچەرخاندنی بۆ دەمامکێکی نەگۆڕ نەیدۆزیبۆوە. ئەو ناسنامەیە بەشێوەیەکی

وەهمی وێنەی خوداوەند دیاریی دەکات بە نزیکردنەوەی تا ئاستی شکۆدارکردنیو جێگرتنەوەی. لە ڕاستیدا پۆزەتفیزم هەردەم یەك تاقە ئەرکی بەجێ گەیاندووە، کە بریتیە لە وەلانانی هەر شتێك کە نەتوانرێت بپێورێت.

هۆرکهایمەر شتێك ڕێکوپێکی خستە ناو تەزمی عەقڵەوە. پێشکەوتن و پاشکەوتنەکانی ڕوون کردەوەو، لەو پێناوەدا خۆی خستە بەر مەترسیی پێشکەشکردنی گریمانەیەك لەمەڕ ماندەری بەرەو زانین. دەڵێت: *"پێویست ناکات ئارەزوو دایکی فیکر بێت"*.

ئەم قەدەغەکردنە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ ئەو فاکتەرەی کە ئاڕاستەی فیکر دیاریی دەکات، واتە مانەوەو پاراستنی خود. ڕەنگە پێوەستکردنی عەقڵ و نیگەرانی لەمەڕ خود ئەو تەوەرەیە بێت کە لە قوتابخانەی فرانکفۆرتدا، ڕەخنە لە دەوری ڕێکخرا. هەر لە سەرەتاوە پاراستنی خود لەگەڵ پەیوەندیی هێزدا هاوشان بوون. چونکە عەقڵە لە لەدایکبوونیەوە خۆپەرستە، بۆیە دەبێت بە عەقڵی ئەوانەی توانای سەرکردایەتیان هەیە، چونکە دەتوانن جڵەوی خۆیان بگرن. کرژ بوونی جڵەوگیرانەی عەقڵ لەگەڵ پەرەپێدانی خۆیدا زیاد دەکات. ئەگەر ئەو وتە نەستەقەی کە دەڵێت "عەقڵ شمولی و جڵەوگیرەو" مانای مەیل و ئامادەیی عەقڵ بێت بۆ ڕێکخستنی تیۆریی، ئەوا تایبەتیشە بە دارشتەی سیاسیی‌و کۆمەڵایەتی داهێنراوەکانی عەقڵ. لەمەوە دەشێ بڵێین شمولیەتی جڵەوگیر ڕووداوێکی سەرپێیی هەژمونی بۆرژوازی نیە.

ئەوکاتە، دەشتوانین بڵێین ئەو گەردونیەتە شمولیەی کە عەقڵ ڕەواجی پێداو ئەو جیهانەی کە ئەو عەقڵە ڕێکی‌خست لە دوو شکڵی مێژوویی زیاتر نین کە ئارەزووی پاراستنی خود دروستی کردوون. ئاڕاستەکردنی چڕو پڕی کۆمەڵگا بەرەو بەرهەمی کۆمەڵایەتی بازاڕ کە بە پلەی مولکایەتی یاخود توانای بەرهەمهێنان و کورتکردنەوەی سیاسەت بۆ ئیدارەکردنی دەستەڵاتەکان دیاریی دەبێت.. ئەمانە هەموو ئاماژەن بۆ "بەرژەوەندیی"، کە بریتیە لە ناوەکەی تری سەرقاڵ بوون بە خودەوە. دەشی لەم دیدەوە بڵێین مارکس خۆشی کەوتە ناو تۆڕی عەقڵی بۆرژواوە، واتە ئەو شکڵیەتەی کە لەوێدا مارکس قوربانی دەدات بە فیکرەکانی جەوهەر یۆتۆپیا لە خزمەتی کارو لە خزمەتی سیاسەتێکدا کە ڕەنگە لە باشترین حاڵدا بتوانێت دەورەکان هەڵبگێڕێتەوە. ئەم پرەنسیپە تووشی زمانیش هات. پێڕەوی ناویزم -الاسمیة- نمونەیەکی نایابی فیکری بۆرژوایە، کە گوزارشت لە مەیلێك دەکات بۆ دارشتەیەکی کرداریی‌و، زمانیش -ئەو ئامرازەی کە هیچ جێگایەك بۆ نەفی ناهێڵێتەوە. کاتێك عەقڵ پێی وا دەبێت کە نهێنی سروشتی دۆزیوەتەوە ئەوا کامەرانی‌و ژان وەك دوو مەسەلەی وروژێنەری نیگەرانی دێنەڕوو. ئەوەش کە تایبەتە بە دژایەتیکردنی سامیەتەوە، ئەگەر ڕەگ و ڕیشەی دیکەشی هەبێت، ئەوا بە پێچەوانەی بۆچوونی باوەوە، لە سایەی عەقڵی بۆرژوادا گەشە دەکات. لە ڕاستیدا فەلسەفەی سەرکەوتوو جگە لەوەی فەلسەفەیەکی بۆرژوازیی بێت ناتوانێ هیچی تر بێت. هۆرکهایمەر لە نامەیەکدا بۆ "لیوتال"ی هاوڕێی، لە ساڵی 1942دا، بە گاڵتەجاڕیەوە دەڵێت: "ڕۆشنگەری مانای فیکری بۆرژوازیە یاخود فیکر بەشێوەیەکی گشتی، چونکە فیکر تەنیا لە شارەکاندا هەبووە". هەوڵدان بۆ ئەوەی دیالەکتیك بخرێتە ناو فیکرەوە لە دەرخستنی ئەو پەیوەندیە لە

پسان نەهاتووەدایە کە لە نێوان عەقڵ و سروشتدا هەیە، ملکەچکردن بۆ سەروەری عەقڵ بە تەنیا، مانای تەسلیمبوونە بۆ توندوتیژیی، ئەو توندوتیژیەی کە عەقڵ بە دەسبەرداربوونی سروشت دەیەوێ خۆی لێ لابدات.

"بەوەی عەقڵ شتێکی تر بێت جگە لە سروشت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ساتێك بێت لە سروشت، ئەمەیە پێش مێژووی ئەو عەقڵەو بەهۆیەوە بووەتە حاڵەتێك. لێرەدا عەقڵ بەشێکە لە سستمی سروشت، لەو ڕووەوە کە هێزێکی دەرونی لاوەکیەو خزمەتی پاراستنی خود دەکات. بەڵام عەقڵ لە سروشت جیایەو دژێتیو، بەمەش شتێکی جیایە لەو. کاتێك بە شێوەیەکی کاتی زۆر خێرا لەژێر کۆنترۆڵی ئەو دەردەچێت، یەکسەر جووت و ناجووت دەبێت لە گەڵیدا، واتە لە چەمکی خۆیدا دەبێتە دیالەکتیکی، بەڵام هەرچەندە عەقڵ لەو دیالەکتیکەدا بە شێوەیەکی ڕەها دژی سروشت بوەستێتەوەو خۆی بدۆڕێنێ، زیاتر بەرەو سروشت دەکشێتەوە، وەك ئەوەی بڵێی ئەم تەدارەکە شتێك لەو هەوڵەی تێدایە کە بۆ پاراستنی خودی خۆی دەیدات. عەقڵ ناتوانێت ژوور سروشت بێت، لەوکاتەدا نەبێت کە دەبێت بە سەدای سروشت". ئەمەیە پوختەی کورت کە لە دیالەکتیکی سەلبیەوە هەڵی دەهێنجین، کە لەلای هابرماس بیرۆکەی بنەڕەتی دیالەکتیکی ڕۆشنگەریی تێدایە.

لە ڕاستیدا ئەم گەڕانە لە ڕەسەن و نەسەبی عەقڵدا، ئەم گەڕانەی کە ڕووی پەسەند ترین چەکی دەکاتە عەقڵ، واتە ڕەخنە، بە تەواویی گێژمان دەکات. لەگەڵ ئەمەشدا هاوەڵانی ئەم گەڕانە قەت لەو کورتەو پوختانە پەشیمان نابنەوە کە پێیان گەیشتوون، بەڵکو جەخت دەکەن لەسەریان. ڕەخنەگرتنی قوتابخانەی فرانکفۆرت لە وێڵگەردیی عەقڵ، چاکەیەکی هەیە کە نکوڵی لێ ناگرێت، ئەویش بریتیە لەوەی جارێکی تر گرفتی عەقڵ دەخاتەوە ڕوو. جا تێگەیشتن بەبێ کۆنترۆڵ، چیە؟ چۆن تەشکیل بوون ڕوودەدات بەبێ ئەوەی "بەشتبوون" ڕوو بدات؟ ئادۆرنۆو هۆرکهایمەر بە عەقڵ نەبێت، نایانەوێت ڕووبەڕووی نا-عەقڵ ببنەوە.

"باوەڕبوون بە فەلسەفە هاوشانی ڕەتکردنەوەی ترسانە لە کەمبوونەوەی توانای بیرکردنەوەمان". "مەبەست جڵەوگرتنی واقیع نیە، بەڵکو مەبەست ڕەخنەکردنیەتی". بەو حسێبەی کەواقیع بەرهەمێکە لە حاڵەتی دروستبوونی بەردەوامدایەو قابیلی گۆڕانە. ئەم ڕەخنە نوێیە دوو لایەنی تێدایە، خۆی بە ئێستاوە خەریك دەکات بە هەموو لایەنەکانی ناتەواویی و پێشکەوتنیەوەو لە چرپیو بەپیتیشیدا؛ لە لایەکی تریشەوە ڕەخنە تێڕامانێکی زاتیانەی فیکر یان گەڕانەوەیە بۆ خودی فیکر. ئەم گەڕانەوەیە تەنیا ڕوونکردنەوەی ئیجرائاتە فیکریە تایبەتەکان نیەو هیچی تر، بەڵکو بریتیە لە یادەوەری. هۆرکهایمەر دەڵێت: *"پێویستە هەوڵ بدرێت حەقیقەتە ڕێژەییەکان لەژێر دارو پەردووی ئامانجە ساختەکاندا ڕزگار بکرێن"* بەم ڕەفتارە، فەلسەفە دەتوانێت ببێت بە "فاکتەری ڕاستکردنەوەی مێژوو، گەر ئەم دەربڕینە شیاوبێت". "فەلسەفە کورتکراوەیەکی ئاڵۆز یان زانستێکی سیاسیی یان سەرەکی نیە، بەڵکو بریتیە لە بەرەنگاربوونەوەی ملکەچیو هەڵبژاردنی سەربەستیی فیکرییو واقیعیەت"، بەمەش وەزیفەو خۆئامادەکردنی سەرەکی فەلسەفە بریتیە لەوەی هەرگیز تەسلیم نەبێت، ئەو فیکرەی بتوانێت جڵەوی خۆی بگرێت، تەنیا

ئەو هێندە پتەوە کە بتوانێت ئەفسانەکان خاپوور بکات.

*دیالەکتیکی سەلبی:*

لەگەڵ ئەوەدا کە بازاڕ هەڕەشەی لێدەکات، بەڵام کاری هونەری تاکە شتێکە بتوانێت تاکایەتی قوتار بکات. ئایا زانین کۆنترۆڵە؟ ئایا سروشت هەر دژە؟ ئایا ناشێ پەیوەندیەکی تر لە گۆڕێ بێت جیا لە پەیوەندی کێبڕکێی بەردەوام؟ بێشك ئێمە دەتوانین بەکارکردن و بەکارهێنانی سەرچاوەکانی سروشت و وەگەڕخستنی تێگەیشتنی بابەتیانە، سوود لە سروشت وەربگرین.بەڵام ئایا لە توێی ئەم توانا سەرف کراوەوە ژیانی مرۆیی پارێزگاری ناکات لە کێبڕکێی نێوان سروشت و عەقڵ؟

بایەخی زانستی جوانی بەجوانی لە رووبەڕووبوونەوەی ئەم ئیختیارە گرانەدا، روون دەبێتەوە. فرانکفۆرت بە وریاییەوە ئەم لایەنەی رۆشنبیریی روون کردۆتەوە، بەتایبەتی ئادۆرنۆ کاری هونەری سیما ناوازەکان بۆ شتەکان دەهێڵێتەوە، ئەوە تاکایەتیەکە کە سڕینەوەی شیاو نیەو گرنگیش نیە کە لە دەرەوە بناسرێت، چونکە ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی ئەوتاکایەتیە لەناو سستمێکدا دابنرێت. ئەوە تاکایەتیەکە کە مەسافەیەك دروست دەکات لە نێوانمان و شتەکاندا، لە نێوانی دیمەن و وشەکاندا، بەڵام ئەوەی لە ناو ئەو شتانەدا ئاشنا بێت ئەوا سەرلەنوێ ئەو ئاوازی نیگەرانیە دەهێنێتەوە کە بە هەموو ئەو شتانەوەیە کە ئێمە نین. کاری هونەری شتێکی ترە غەیری بینایەکی تۆکمەو مەحکومی حەقیقەتێك. کاری هونەریی لە جیاکردنەوەی ئەوەی خودەو ئەوەی دەرەوەیە، لە دایك دەبێت و بەلایەنی کەمەوە ئامادەبوونێکی چۆنایەتی ئەو دەرەوەیە کەشف دەکات. کاری هونەری کریستاڵەکردنی ئەوەیە کە چەشنیو تایبەتەو ئەمەش لە توێی شکڵەوە دەبێت و بەوەش ئەو لەچارەنووسی هەموو شکڵەکان دەربازی نابێت، بە پتەوکردنی داخرانی بەسەرخۆیدا نەبێت یاخود بەلایەنی کەمەوە بیناکردنی خۆی بەپێی ڕێسا تایبەتەکانی. بەڵام "بازاڕ"یش هەڕەشە لە هونەر دەکات، چونکە دەیکات بە "کلێشەیەك" کە دەشێت لەسەر حیسابی ناواخنە ڕاستەقینەکەی بفرۆشرێت.

چۆن دەشێ گوێڕایەڵی عەقڵ بین و بەهۆیەوە ڕزگارمان. ببێت و مرۆڤایەتیش لە هەموو کۆیلایەتیەك ڕزگار بکەین، هەر لە کۆیلایەتی ڕۆژانەوە، کۆیلایەتی پێداویستیەکان؟ پاشان لە لایەکی تریشەوە چۆن دەکرێ خۆمان لابدەین لەو وێنابوونەی کە بەسەر هەموو ئەو شتانەدا سەپێنراوە کە عەقڵ بەرهەمیان دەهێنێ بەو سستم و سەرکوتکردنەی بەرهەمی دەهێنێت؟ قوتابخانەی فرانکفۆرت ئەم ئیشکالەی خستەڕوو بەڵام بە زاراوەی کەمتر گشتی، وەلێ دروستیشە ئەگەر بڵێین تاکە وەڵامێك کە فرانکفۆرت خستیە ڕوو بریتیە لە ڕەخنە. چونکە لە بنەڕەتا بایەخیدا بە واقیعی عەقڵی شمولیو لێکی هەڵوەشاندو پاشان ڕەتی کردەوە، لە هەر بوارێکدا عەقڵ جیاوازییو تاکایەتی لەناو بردبێت، فرانکفۆرت ئەوەی کەشف کرد کە هەندێ تایبەتبوونی شمولی هەیە پێیان دەوترێت "سستمی فیکرەکان" و ئەو سستمانە جگە لە زانستی توندوتیژیی شتێکی تر نین. بەهەمان شێوە فرانکفۆرت لەگەڵ بیرۆکەی یۆتۆپیاشدا

ـەرم نـەبوو. فیکـری ڕەخنـەیی دامـەزراندنی بۆچوونێکی دیاریکراو سـەبارەت بـە ئـاینده ڕەت دەکاتەوە. ئایندە ئەندێشە ناکرێت، ڕەنگە لێرەو لـەوێ هێڵێکی کـاڵ ببینـین لەسـەر پێشـینەی نمونەیەکی ئیستاتیکی ئاماژەی بۆ بکات.

لە تێڕوانینی کرداریدا، شکۆدارکردنی هـەموو تایبـەتێك و ناوازەیـەك، لـەلای [illegible] قوتابخانـەی فرانکفۆرتییانەوە. بـە تـەواویش دابـەزەکانی ئەم حاڵە هوشیارن. بـەڵام ئەمـە هیچ بەرامەای تیۆریەکە کەم ناکاتەوە. چونکە بوون و لە بەر یـەك شـتن. کەللـەڕەقیو مکومیـی لـە فیگوازەکانیاندا.. تەنیا گوزارشت لە ئیرادەی ژیان و مانەوە دەکات، نەك لە دەرەوەی قەرەباڵـەخی و نـە لـە ژاوەژاوی نـاوداریدا بـەڵکو لـە تایبەتمـەندێتیدا و بۆ خـود بەشـێوەیەکی جیـا لەوەی کە دەرەوە دیاری دەکات، بـەڵام لـەکۆی گشـتیدا بـوون لـە گۆشـەنیگای فیکـری فرانکفۆرتەوە بە تەواویی جیایە لە هـەموو شتێك تەنانەت خودی نوسینیش کە وەسفی ئـەو بوونـە دەکات زیاتر لە ڕاکردوویەکی ڕاونراو دەچێـت کـە چەند هەنگاوێك بەرەو دواوە پێشـدەکەوێت. ئـەم نووسینە فریشـتە خەمبارەکـەی بنیامینمـان بـیر دەخاتەوە کە ئەم جیهانەی کە ڕەشـەبای مێـژوو تێیدا هـەڵدەکات، بـەلای ئـەوەوە سـیپاڵی دڕاوو پاشماوەو قوربانیەکانە.

تۆ بڵێی چارەنووسی فەلسەفە بریتی بێت لەو وشەیەی کە بە ئەنقەست بە جێهێڵراوە بۆ هـەموو ئەو شتانەی ون دەبن؟ ئەمە مـەغزای ئـەو چـەند دێـرە تـەم و مژاویـەی کتێبـی "بچوکـترین ئامۆژگـاریی" ئادۆرنۆیـە. دەڵێـت: "بـە قـەدەر ئـەوەی پێویسـتە لـە بەرامبـەری نـائومێدیدا، لێپرسـراوێتییەکەی قبـووڵ بکرێـت، فەلسـەفە دەبێتە هەوڵدانێك بۆ سـەرلەنوێ سـەیرکردنەوەی هـەموو شـتەکان وەك خۆیـان لـە گۆشـەنیگای ڕزگاربوونەوە. زانین هیچ ڕۆشـناییەکی نیـە جگـا لـەو سنوورەی کە [illegible] ئـەوا زانین بریتیـە لـە داڕشتنی بەڵگەخوازیی یاخود تـەنیا تـەکنیکی هونەریـە، پێویسـتە چـەند ئاسۆیەکی دیـاریکراو بکرێتـەوە کـە لێیانـەوە نـامۆبوونی جیـهان ڕوون دەبێتـەوە، ڕێـك وەك چـۆن جیـهان بـەهاتنی فریـادڕەس شـێواو دەبێـت. ئـەمڕۆ ئـەرکی فەیلەسـوف بریتیـە لـە کردنـەوەی ئـەو ئاسۆیانە بـەبێ جڵەوگرتن و بـێ توندوتیژیـیو لـە توێـی پەیوەندیکردنی زەینیانە بە شتەکانەوە.. ئەمـە ئاسـانترین شـتـە، چونکـە حاڵـەتی جیـهان لـە پێویستیەکی زەرووردایـە بـۆ ئـەم جـۆرە زانینـە، وەلێ ئەمـە مەحاڵـە، چونکـە وا گریمانـەکراوە کـە سـەرەتا شـوێنێکی وەهـا لـە گـۆڕێ نـەبێت کـە تۆزقـاڵێکیش ملکـەچی یاسـای بـوون نـەبێت، لـەکاتێکدا هـەموو زانینێکی شیاو کـە لـە واقیـع وەردەگیرێت، لەهەمان کاتدا تووشی ئەو شێوایە دەبێ کە هەوڵ دەدات لێی دەرباز ببێت.

## سەرچاوە:

*گۆڤـاری "المنـار"، ژمـارە -11- سـاڵی1985، ل158-174.*

*وەرگێرانی بۆ عەرەبی "المنار".*

❑

# ماركۆزو قوتابخانەی فرانكفۆرت

## -گفتوگۆیەك لەگەڵ هێربرت ماركۆزدا-

■ سازدانی: برایان ماگی

• و. لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی



ماركۆز

لای زۆربەی ماركسیستەكان ئەو تەنگژە ئابوورییانەی كە لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا كۆمەڵگا خۆرئاواییەكانی گرفتاركرد، ئەوكاتە مانای داڕمان و فەوتانی رژێمی سەرمایەداری بوو، كە بەردەوام لە تیۆرەی ماركسیستیدا پێشبینی دەكرا.

گەرچی بەگوێرەی ئەو تیۆرەیە دەبووایە ئەنجامی ئەمە بە سەقامگیربوونی كۆمۆنیزم بشكایەتەوە؛ بەڵام لە هیچ یەكێك لەم كۆمەڵگا خۆرئاواییانەدا رژێمی كۆمۆنیستی نەهاتە ئاراوە. بە پێچەوانەوە، ئەوەی لەچەند كۆمەڵگایەكدا هاتە ئاراوە، فاشیزم بوو. هەندێ لە ماركسیستەكان بەجۆرێك سەبارەت بەم مەسەلەیە نائومێدو دڵساردبوون كە بەو پێیەی رووداوەكان ماركسیزمیان بەدرۆ خستەوە؛ دەستبەرداری ماركسیزم بوون. ئەوانی تریش سەرباری بەڵگە مێژووییەكان، بەهیچ جۆرێك

ئامادە نەبوون بەرامبەر ئەو تیۆرەیە دوودڵی پیشانبدەن. کەسانێکیش لە نێوان ئەم دوو گروپەدا بوون، کە مارکسیست بوون -یان دەیانویست بەو جۆرە بمێننەوە- بەڵام هەستیان دەکرد گەر بڕیار بێت تیۆرەی مارکسیزم هەر بیروبۆچوونی خەڵك بەلای خۆیدا رابکێشێت، دەبێ سەرلەنوێ بخرێتەوە بەر لێکۆڵینەوەو رەخنەی توندو بگرە تا ڕادەیەك دیسانەوە دابڕێژرێتەوە.

گروپێك لەم کەسانەش لە کۆتاییەکانی دەیەی 1920دا لە شاری فرانکفۆرت کۆبوونەوەو، لەوسا بەدواوە بە ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ناسران. لە راستیدا ئەم گروپە ماوەیەکی زۆر لە فرانکفۆرت نەمانەوە، بەڵام هەر ئەو ناوەیان بەسەردا دابڕا.

لە سەرەتای سەرهەڵدانی نازیزمدا ئەڵمانیایان جێهێشت و، کەسە سەرەکیەکانی ئەم گروپە تا ناوەڕاستی دەیەی 1930 لە ئەمریکا جێنشین بوون. یەکێك لەمانە تیۆدۆر ئادۆرنۆ بوو کە پێدەچوو لە بوارەکانی فەلسەفەو کۆمەڵناسیو مۆسیقادا وەکو یەك شارەزا بێت، دووەمیان ماکس هۆرکهایمەر بوو کە هەم فەیلەسووف و هەم کۆمەڵناسیش بوو، گەرچی هێندەی ئادۆرنۆ هەڵکەوتوو نەبوو، بەڵام پایەیەکی مەحکەمترو پتەوتری هەبوو، دواجاریش سێیەمیان کە لە هەموویان بەناوبانگترو کاریگەرتر بوو، تیۆرەسازی سیاسی هێربرت مارکۆز بوو. کاریگەریی ئەم کەسانە وردە وردەو بە تێپەڕینی ماوەیەکی تارادەیەك درێژ خایەن بڵاوبۆوە، تا سەرەنجام لە دەیەی 1960دا ئەو کاریگەرییە گەیشتە چڵەپۆپە. لەمەشدا گەلێ هۆکار رۆڵیان هەبوو. یەکێکیان بزاڤی بەهێزی ریفۆرمخوازانی مارکسیست بوو لەوڵاتە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپادا، کە لە بەهاری 1968دا گەیشتە ترۆپك و بۆ یەکەمین جار قوتابخانەی فرانکفۆرتی بە گۆڕانکاریە ناوەکیەکانی جیهانی کۆمۆنیستیەوە بەستەوە. هۆکارێکی تریش کە بە ئاشکرا بە هۆکاری پێشووەوە پەیوەست بوو، تازەبوونەوەی مەیلی خەڵکی خۆرئاواو بە تایبەتیش لاوە خوێندەوارەکانیان بوو بۆ مارکسیزم، کە دیسانەوە ئەمیش لە ساڵی 1968دا، واتە ئەو ساڵەی کە تیایدا توندوتیژیی قوتابیان لە سەرانسەری ئەورووپاو ئەمریکادا کۆتایی هات و بۆ ماوەیەکی کورت، بەتایبەتیش لە پاریس، لای خەڵك وا کەوتەوە کە لەوانەیە شۆڕشێکی ڕاستەقینە رووبدات.

شۆڕشگێڕانی سەوداسەری ئەو رۆژگارە، مارکۆزیان زیاتر لە هەموو کەسێکی دی بە رێنوێن و پێشەوای سیاسی خۆیان راگەیاند. هەندێ رستەی کتێبەکانی ئەویان بە بۆیە لەسەر دیوارەکان دەنووسی، تا بە دونیا رابگەیەنن کە ئامانجیان پراکتیزەکردنی بیروبۆچوونەکانی ئەوە. هەڵبەت شۆڕشەکە رووی نەدا؛ بەڵام لە ساڵانێکدا کە رۆژگارێکیان بەسەردا تێپەڕیوە بیروبۆچوونەکانی مارکۆزو قوتابخانەی فرانکفۆرت لە بەشی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی چەند زانکۆیەکی ئەورووپاییدا بایەخێکی تەواویان پێ دەدراو، بەمجۆرە کاریگەرییەکی گرنگیان لەسەر هەندێ لە لاوانی هۆشیاری خۆرئاوایی جێهێشت.

**ماگی:** *بۆچی دەبوایە لە دەیەی 1960و سەرەتاکانی دەیەی 1970دا بزاڤە شۆڕشگێڕەکانی قوتابیان روو لە نووسینەکانی ئێوە بکەن؟*

**مارکۆز:** من لە دەیەی 1960و سەرەتاکانی دەیەی 1970دا رێنوێن و پێشەوای قوتابیان نەبووم لە چالاکیەکانیاندا. من تەنها هەندێ لەو بیروڕایانەی لەو سەردەمەدا پەرت و بڵاوبوون فۆرمەلەم دەکردن و دەرمدەبڕین. ئەمەندەو بەس. ئەو وەچەیەی قوتابیان کە لەو ساڵانەدا دژ بە کۆمەڵگایەك چالاکییان دەنواند کە هەموو رۆژێك نایەکسانیو ستەم و دڵڕەقیو کاولکاریی دەخستەڕوو؛ پێویستیان بەوە نەبوو شوێن پێی کەسێکی باوکئاسا یان باپیرە ئاسا هەڵگرن. خۆیان بەو ئەزموونانەدا تێدەپەڕین و بەچاوی خۆیان دەیانبینی. یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی ئەو کۆمەڵگایە کە دەتوانم لێرەدا باسی بکەم، میراتی فاشیستی بوو. فاشیزم لەڕووی سەربازیەوە شکستی هێنابوو، بەڵام هێشتا توانای سەرلەنوێ ژیانەوەی هەبوو. هەروەها

دەتوانم باس لە جیاخوازی نەژادو جیاخوازی سێکسی و هەست نەکردنێکی گشتی بە ئاسایش و لەوتانی ژینگەو وێرانی بوارەکانی فێرکردن و پەروەردەکردن و کارو... هتد بکەم. بە واتایەکی دی، ئەوەی لە دەیەی **1960**و سەرەتاکانی دەیەی **1970**دا گەیشتە ئاستی تەقینەوە ناکۆکی لە ڕادەبەدەری سامانی زۆری کۆمەڵایەتیو سوود وەرگرتنی نەنگین و وێرانکەرانە لێی.

**ماگی:** *بەچاوپۆشین لەوە کە کەسێك لەهەموو ئەم شتانەدا، یان هەریەك لەم مەسەلانە لەگەڵ ئێوەدا هاوڕا بێت یان نەو، بەڵام من دڵنیام ئەوەی وایدەکرد ڕوو لە تۆ بکەن، ئەوە بوو کە فەلسەفە بەو شێوەیە لە سەرانسەری خۆرئاوادا لە زانکۆکاندا دەخوێنرێ، بایەخی بەمجۆرە مەسەلانە نەدەدا.*

**مارکۆز:** نەخێر، بایەخیان پێ نەدەدا، ئێمەش لە فرانکفۆرت پاشتریش لە ئەمریکا لە بنەڕەتدا نەماندەتوانی هیچ فەلسەفەیەکی راستەقینەو ڕەسەن بهێنینە بەرچاومان کە بە جۆرێك لە جۆرەکانی ڕەنگدانەوەی باری ئادەمیزاد نەبێ لە دۆخە واقعیو بەرچاوەکەیو، لە دۆخە کۆمەڵایەتیو سیاسیەکەشیدا. بە بۆچوونی ئێمە، فەلسەفە هەمیشە، لە ئەفلاتوونەوە تا ئەمڕۆ، بەشێوەیەکی بنەڕەتی فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتیو سیاسی بووە.

**ماگی:** *ئێوە لە ژیانتاندا، فەلسەفە نەك هەر بایەخێکی زۆری هەبووە، بەڵکو لە راستیدا ئێوە لە هەموو تەمەنتاندا پەیجۆرو ئەکادیمیەکی پیشەمەند بوون: مامۆستاو پەروەردەکاری زانکۆیی بوویت، کتێبت نووسیوەو چەندین کاری تریشت ئەنجامداوە. لەگەڵ ئەمەشدا، یەکێك لە زەقترین تایبەتمەندیەکانی بزاڤی چەپی نوێ کە خۆتان لە دروستکردنیدا ڕۆڵتان هەبووە، دژایەتیکردنی ڕۆشنبیر بووە. لەو بڕوایەدا نیم کە ئەم تایبەتمەندیە جێی ڕەزامەندیی ئێوە بێت، وانیە؟.*

**مارکۆز:** من هەر لە سەرەتاوە دژی ئەم دژایەتیکردنەی ڕۆشنبیر بووم. بەڕای من هۆیەکانی ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ: یەکەم، نەبەستراویی بزاڤی قوتابیان بە چینی کرێکارەوەو، هەروەها بە ڕواڵەت ئەستەمبوونی هەرجۆرە دەسپێشخەرییەکی سیاسی نائاساییو بەرچاو. وردە وردە ئەم مەسەلەیە گۆڕا بۆ - نازانم چۆنی بڵێم- جۆرە گرێیەکی خۆ بە کەمزانی، یان ماسۆشی، کە یەکێك لە نیشانەکانی هەستی بەکەم سەیرکردنی ڕۆشنبیران بوو، چونکە [دەگوترا] کە ڕۆشنبیر بەتەنها هەر ڕۆشنبیرەو "توانای کاری واقعی نیە"، بەبێ ئەوەی بزانن کە ئەم هەستی بەکەم سەیرکردنە یارمەتی بەرەو پێشتربردنی بەرژەوەندیەکانی سەرچاوەکانی دەسەڵات دەدات.

**ماگی:** *لە راستیدا ئەمە کە لەناو هەموو خەڵکیدا ئێوە ڕەخنە لە چەپی نوێ دەگرن شتێکە شایانی گوێگرتنە. بە ڕای ئێوە چەپی نوێ دوچاری چیەها کەموکورتی گرنگی دیکە بووە؟*

**مارکۆز:** بەڕای من، گەورەترین کەموکورتی کە هەیەتی ئەو زمان و دەربڕینە دوور لە راستیەو، لە زۆربەی کاتیشدا ستراتیجە تەواو ناواقیعبینانەکەیەتی. هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە بەسەر هەموو چەپی نوێدا ناچەسپێ، بەڵام لەنێو لایەنگرانیدا بەرچاو دەکەوێ. ئەمانە نایانەوێ قەناعەت بکەن بەوەی کە ئێمە لە وڵاتانی پێشکەتووی پیشەسازیدا نەك هەر لە دۆخێکی شۆڕشگێڕانەدا نین، بەڵکو لە دۆخی بەر لە شۆڕشگێڕیشدا نین و، هەموو ستراتیجێکیش پێویستە لەگەڵ دۆخی واقعیدا بگونجێت. دووەم، حەزنەکردنی کەسانی سەر بە چەپی نوێ بە

سەرلەنوێ پیاچوونەوەو بنیادنانەوەی چەمکەکانی مارکسیزم و مەیلیان بۆ بت دروستکردن لە تیۆرەی مارکسیزم. لەبری ئەوەی دواجار لەوە تێبگەن کە چەمکەکانی مارکس کۆمەڵە چەمکێکی دیالەکتیکیو مێژوویین و دووبارە نابنەوەو دەبێ بە گوێرەی گۆڕانەکانی کۆمەڵ سەرلەنوێ لێیان بپێچرێتەوە، کەچی ئەو چەمکانە بە کۆمەڵێك دۆگماو شتی بابەتی وەردەگرن.

**ماگی:** *دەبێ ئەوە بڵێم کە بە ڕاستی بیستنی ئەم قسانە لە زاری ئێوەوە شتێکی دڵخۆشکەرەو ئەوە پیشان دەدات کە دوای ئەوەی کەسانێك کە خۆیان بە پەیڕەویکاری ئێوە دەزانن و وەکو ئەوەی ئێوە وان، دەسبەرداری فیکربوون، لەکاتێکدا هێشتا خۆتان لەسەر تێفکرین بەردەوامن.*

**مارکۆز:** من لەم ڕووەوە هێندە چەرمەسەریم دیوە کە..

**ماگی:** *تۆ هەر زوو ئێمەت هێنایە سەر قوتابخانەی فرانکفۆرت. واتە سەرلەنوێ لێکۆڵینەوە لە چەمکە مارکسیستیەکان. هەروەکو لە سەرەتای ئەم گفتوگۆیەشدا وتم ئەوەی بووە مایەی سەرهەڵدانی بزاڤەکەی ئێوە ئەو هەستە بوو کە پێویستە مارکسیزم بچێتەوە بەر توێژنەوەی نوێو بینابکرێتەوە. یەکێك لەو هۆیانەی کە بۆ ڕوونکردنەوەی هۆی ئەمە ئاماژەم پێدا سەرهەڵدانی فاشیزم بوو، بەڵام مەسەلەکە تەنها لە فاشیزمدا کورت نەدەبۆوە، کۆمەڵێك هۆی دیکەش هەبوون. دەکرێ داوای ئەوەتان لێ بکەم هەندێ لەو هۆیانە هەڵبژێریت و باسیان بکەیت؟*

**مارکۆز:** کەڵکەڵەیەکی دی پەیوەست بوو بە پیاچوونەوەیەکی ڕەخنەییانەی هەندێ بزاڤی تری وەکو لیبراڵیزم (بەشێوەیەکی گشتیش هی فیکریو سیاسی) لە قۆناغی بۆرژوازیدا. ئەو ئەنجامەی پێی گەیشتین ئەوە بوو کە نەریتی گەورەی لیبرالیزم یان ئازادیخوازی، هەر لەسەرەتاوە توخمەکانی دەسەڵاتخوازیو تۆتالیتاریزمی گرتۆتەخۆ، ئەم توخمانەش لەم چاخەی ئێمەدا هاتوونەتە بەر. بەتایبەتیش مەبەستم دوو لێکۆڵینەوەی هۆرکهایمەرە بەناونیشانی مۆنتانیو خۆپەرستیو بزاڤی ئازادی. بەڵام لەوانەیە لە هەموو ئەوانە گرنگتر سەرقاڵبوون بەخودی چەمکی سۆسیالیزمەوە بێ. لە ڕەوتی گۆڕانی تیۆرەی مارکسیدا (واتە تیۆرەکەی مارکس نەك خودی خۆی) چەمکی سۆسیالیزم بە شێوەیەکی بەردەوام کورت دەکرایەوە بۆ پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان بە شێوەیەکی ئەقڵانیتر و فراوانترو سوود وەرگرتنی ڕۆژانەی زیاتر لە کارو دابەشکردنی ئەقڵانیتری بەرهەم، لەبری جەختکردنەوە لەوەی کە کۆمەڵگای سۆسیالیستی بەو جۆرەی مارکس لێی دەڕوانی (یان لانی کەم بەو جۆرەی مارکس لە لاویدا لێی دەڕوانی) کۆمەڵگایەك دەبێت کە لە ڕووی چۆنێتیەوە جیاوازە لە هەر کۆمەڵگایەکی تری رابردوو. گەر دەشپرسیت لە چ ڕوویەکەوە وەکو چۆنێتی جیاواز دەبێت؟ بە بۆچوونی من لەو ڕووەوە کە لە کۆمەڵگای سۆسیالیستیدا، ژیان خۆی جیاواز دەبێت، پیاوان و ژنان لە ڕێی پەیوەندیانەوە لەگەڵ یەکتریدا شێوەی بوون و ژیانی خۆیان دیاری دەکەن، واتە بە دەربڕینی ئادۆرنۆ، جۆرێك لە بوون و ژیانی بێ ترس. چیدی کار پێوانەی سامان و بەها نابێت و، مرۆڤەکان ناچار نابن هەموو تەمەنی خۆیان بۆ ئەنجامدانی کاری بەردەوام و بێگانە بەخودی خۆیان تەرخان بکەن. ئەم خاڵە ڕۆشنە شاردراوەتەوەو، لە ئەنجامدا، جۆرە پەیوەندیەکی ترسناك لەنێوان وێنەی سەرمایەداریی پێشکەوتوو، ئەوەی کە

پێی دەڵێن "سۆسیالیزمی راستەقینە" هاتۆتە ئاراوە.

**ماگی:** ***واتە رۆژ لە دوای رۆژ سۆسیالیزم چۆتەوە سەر دوژمنەکەی.***

**مارکۆز:** رێك وایە.

**ماگی:** ***لە خوێندنەوەی نووسینەکانتەوە وا تێگەیشتووم کە چ تۆو چ هاوکارانت هەندێ رەخنەی گرنگی ترتان لە تیۆرەی مارکسیستی گرتووە. دەمەوێ دوو رەخنە لەو رەخنانە کە پەیوەندیەکی ئاشکرایان پێکەوە هەیە بخەمەروو کە یەکەمیان بریتیە لەوەی تیۆرەی مارکسیستی بەهیچ جۆرێك یان تا رادەیەکی زۆر بایەخ بە تاکەکەس نادات و لەبەرچاوی ناگرێ، دووەمیشیان ئەوەیە کە مارکسیزم دژی ئازادیخوازی یان ئازادیەکانی تاکەکەسە، یان بەهەرحاڵ لایەنگری ئازادی نیە.***

**مارکۆز:** مارکس بایەخێکی ئەوتۆی بە تاکەکەس نەدەداو نەدەبوو بایەخیشی پێ بدات، لەبەرئەوەی لە چاخی ئەودا بە تەنها بوونی پرۆلیتاریا ئەو چینەی دەکردە چینێکی خۆبەخۆ شۆڕشگێڕ. لەوساوە تا ئێستا بارودۆخەکان گۆڕاون و، ئەمرۆ مەسەلەکە وایلێهاتووە کە: "تا چ رایەدەك دەتوانین بەو چینە هەنووکەییەی کرێکاران لە وڵاتە پێشکەوتووە پیشەسازیەکان بڵێین پرۆلیتاریا؟" حیزبە کۆمۆنیستیەکانی ئەوروپا بەتەواوی دەسبەرداری ئەم چەمکە بوون. مەسەلەکە وایلێهاتووە کە نزیکەی زۆربەی خەڵك لەناو سیستمی سەرمایەداریدا تواونەتەوە. چیدی بەو جۆرە نیە کە چینی کرێکار هیچی نەماوە تەنها زنجیرەکەی دەستی نەبێ [یەخسیری] کە لە دەستی بدات، ئەمرۆ زۆر شتی هەیە لە دەستی بدات، ئەم گۆڕانەش، تەنها لە ئاستی مادیدا رووی نەداوە، بەڵکو لە ئاستی دەروونیشدا. هۆشیاریی ئەم خەڵکە وابەستەیە گۆڕاوە. لەمەش لەبەرچاوتر ئەوەیە کە ئەمرۆ رێکخستنەکانی دەسەڵاتی حوکمڕان تا چ ئاستێك لە توانایدایە نەك هەر بە تەنها هۆشیاری، بەڵکو نەست و نیمچە هوشیاریی تاکەکەسیش دەسکاری بکات و ئاراستەو کۆنترۆڵی بکات. لەبەرئەوە بوو کە هاورێیانی من لە قوتابخانەی فرانکفۆرت دەروونناسییان بە یەکێك لە لقە سەرەکیەکانی زانین لە قەڵەم دەداو بڕوایان وابوو کە پێویستە دەروونناسی لەنێو تیۆرەی مارکسیدا بتوێتەوە، هەڵبەتە نەك بەو مانایەی جێی تیۆرەی مارکسی بگرێتەوە، بەڵکو بچێتە ناویەوە.

**ماگی:** ***ئێوە خۆتان هەوڵتان داوە فرۆیدیزم و مارکسیزم ئاوێتە بکەن. بەڵام کەسانێك هەن دەڵێن ئەمە ناکرێ‌و ئەم دوو شێوەیە لە شیکردنەوەو دیاریکردنی هۆیەکان لەگەڵ یەکدا کۆنابنەوە. بە دەربڕینێکی سادە، تیۆرەی مارکسیستی ئاستی تەکنیك و پیشەسازی بە ئاڵتەرناتیڤی دوا دەربڕی دۆخ و مەسەلە مرۆییەکان دەزانێت. بە پێی ئەو تیۆرەیە، رادەی پێشکەوتنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان لە هەر کۆمەڵگایەکداو هەر سەردەمێکی تایبەتیدا چۆنێتی فۆرمەلەی چینەکان دیاریدەکات، هەروەها ئەم مەسەلەیەش چۆنێتی پەیوەندی کەسەکان لەگەڵ یەکتردا دیاری دەکات وە ئەوەش کە مارکسیستەکان پێی دەڵێن "سەرخان The Superstructure" لەسەر ئەم بناغەیە نەشونما دەکات، واتە ئایدیۆلۆژیاکان و ئاینەکان و مەزهەبەکان و فەلسەفەو هونەرو بونیادە جۆراوجۆرەکانی وەکو سیستمە ئاکاری‌و حقوقیەکان و... هتد. بەڵام بەبڕوای فرۆید، دوا لێکدانەوەی دۆخ و مەسەلە مرۆییەکان خەسڵەتێکی دیکەی هەیەو***

*پێگەکەی وا لە هەست و سۆزو خۆزگەو ترس و خەیاڵاتەکانی نەستماندا، کە لە ئەنجامی لادان (انحراف)ی پەیوەندیە سەرەتایەکانمانەوە بەتایبەتیش لەگەڵ دایک و باوکماندا خەفەدەبن. خەفەبوونی ئەو هەست و خۆزگەو ترسانەو شتی تری لەو بابەتە دەبنە هۆی دروستکردنی دژایەتی (تناقضات)، زۆربەی وزەی دەرونیی ئێمەش، واتە ئەو هاندەرە نەستیانەی کە دەبنە هۆی بزواندنی ئێمە لە سەرتاپای ژیانماندا، زادەی ئەو دژایەتیانەن.*

*بە گوێرەی ئەم تیۆرەیە، بەشی زۆری ئەمەی مارکسیستەکان پێی دەڵێن "سەرخان"، لە راستیدا بریتیە لەو شتە خەفەبووانەی دەروون کە دەرژێنە دەرەوەو رێ بۆ دەرەوە پەیدا دەکەن. کەواتە وەکو سەرنج دەدەن ئەم دوو شێوە دەربڕینە نەک هەر لەگەڵ یەکدا جیاوازن، بەڵکو دوو دەربڕینی جیاوازن لە یەک دیاردە. بەم پێیە، ئێوە چۆن دەتوانن ئەمانە لەیەک تیۆرەدا ئاوێتە بکەن؟*

**مارکۆز:** من وایدەبینم کە بە ئاسانی دەتوانن ئاوێتەی یەکدی بن و ئاوێتەبوونیشیان زۆر قابیلی ئەوەیە کە پەیوەندیەکی باش و شادیبەخش بهێنێتە ئاراوە. بە بۆچوونی من، ئەم دووانە [واتە مارکسیزم یان فرۆیدیزم] دوو دەربڕینن لە دوو ئاستی جیاوازی یەك گشت یان یەك هەمەکێتی. هاندەرە سەرەتاییەکان، ئەو هاندەرە نەستیە سەرەتایانەی کە فرۆید تۆماری کردوون، واتە وزەی ئیرۆتیسکیو وزەی وێرانکاری، ئیرۆس [یا عیشقی ئیرۆتیسکی]و تاناتۆس [یا مەرگ]، غەریزەی ژیان و غەریزەی مەرگ، لە چوارچێوەیەکی کۆمەلایەتی دانراو و دیاریکراودا ئەشونما دەکەن کە بە چەندین شێوەی جۆراوجۆر دەیانخاتە ژێر سیستم و رێساوە.

کاریگەریی کۆمەڵگا لەمەش زیاتر دەڕوات. بە باوەڕی فرۆید، لەهەر کۆمەڵگایەکدا چەپاندن (=خەفەکردن–repression)* چەند زیاتربێت، رادەی شەڕەنگێزی دژی ئەم چەپاندنە فراوانتر دەبێت. لە لایەکی دیکەشەوە، دیسانەوە بە باوەڕی فرۆید، چەپاندن لەگەڵ پێشکەوتنی ژیاردا لەزیادبووندایە، هەروەها هاوتەریب لەگەڵ ئەمەداو بە رادەیەکی فراوان شەڕەنگێزی دێتە گۆڕێ. بەدەربڕینێکی دی، تا ژیار زیاتر پێشبکەوێت، وێرانکاریش– ئیدی لەناوبردنی خودی بێت یان ئەوانیتر، لەناوبردنی بکەر بێت یان بەرکار–زیاتر پەرەدەسێنێت. بەبۆچوونی من، ئەم تێزە زۆرباش ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئەمڕۆ [لە کۆمەڵگادا] روودەدات.

**ماگی:** *هەندێ لەو کەسانەی ئاگاداری ئەم گفتوگۆیەن، بێگومان لێرەدا شتێك بە بیریاندا ختوورە دەکات. ئەو لیستەی تۆ سەبارەت کەموکورتیەکانی تیۆرەی مارکسیستی خستەڕوو، بە راستی ترسناکە: پێشبینی نەکردنی سەرکەوتنی سەرمایەداریو، لە ئەنجامیشدا لەنێوچوون و لەکارکەوتنی چەمکی پرۆلیتاریا، زێدەڕۆیی قوتابخانەی مارکسیستی لە راکێشانی بەها مادیەکانی هەمان ئەو کۆمەڵگایەی خۆی دژایەتی دەکات؛ بەلای خۆیدا، لایەنی دژ بە ئازادیە تاکەکەسیەکان لە مارکسیزمداو، دواجاریش نەبوونی هیچ جۆرە تیۆرەیەك دەربارەی تاکەکەس و تەنانەت هیچ جۆرە تێڕوانینێك. ئێوە لە نووسینەکانتاندا باس لە کەموکورتی زیاتریش دەکەن. جگە لەمە جەختتان لەوە کرد کە دەبێ تیۆرەی تازەتری وەکو فرۆیدیزم لە هزری ئەمڕۆدا رەچاو بکرێن، لەبەرئەوەی بە سەرنجدانی ئەم خاڵانە، کەسانێکی زۆر لە خۆیان دەپرسن کەواتە*

***بۆچی چ خۆت و چ ئەندامانی تری قوتابخانەی فرانكفۆرت بە ماركسیست مانەوە، یان دەتانەوێ وا بمێننەوە؟ تیۆرەیەك كە بەم جۆرە پڕ لە هەڵە بێت، ئیدی خۆلكاندن پێوەی چ سوودێكی هەیە؟ ئێوە بۆچی بەیەكجاری چەمكەكانتان لە كۆتی ئەو تیۆرەیە رزگار ناكەن و سەرلەنوێ لە راستی ناڕواننەوە؟***

**ماركۆز:** وەڵامەكەی ئاسانە؛ لەبەر ئەوەی بە بڕوای من، خودی تیۆرەكە خۆی پووچەڵ نەبۆتەوە، هەروەكو وتیشم مەسەلەكە ئەوەیە كە دەبوایە هەندێ لەو چەمكانەی بە تیۆرەی ماركسیزمەوە پەیوەستن سەرلەنوێ چاویان پێدا بخشێنرێتەوە، بەڵام ئەمە شتێك نیە كە لە دەرەوەی تیۆرەی ماركسیستیدا بێت، بەڵكو شتێكە، لەبەر ئەوەی تیۆرەی ماركسیستی تیۆرەیەكی مێژوویی‌و دیالەكتیكیە، پێویستی پێیەتی. كۆمەڵێك چەمكی گرنگ و یەكلاكەرەوە لە ماركس دا هەیە، كە رەوتی گۆڕانكاریانەی سەرمایەداری، دروستیانی سەلماندووەو بە ئاسانی دەتوانم ئەو چەمكانەت بۆ بژمێرم، یان ریزیان بكەم: لۆكاڵیزەكردنی دەسەڵاتی ئابووری، لكانی دەسەڵاتی ئابووری لە دەسەڵاتی سیاسیەوە، دەستێوەردانی بەردەوامی دەوڵەت لە ئابووری، دابەزینی رادەی قازانج، پێویستی پەنابردنە بەر سیاسەتی ئیمپریالیستیانەی نوێ بۆ هێنانە ئاراوەی بازاڕی نوێ‌و توانای كەڵەكەكردنی فراوانتری سەرمایەو ئیدی بەم جۆرە.. ئەم لیستە شایانی بایەخپێدانەو گەلێ شتمان پێ دەڵێت كە لە سوودی تیۆرەی ماركسیزمدایە.

**ماگی:** ***چەند حەزم دەكرد سەبارەت بە هەموو ئەو مەسەلانە لەگەڵتاندا وتوێژ بكەم، بەڵام بەداخەوە كە دەبێ دان بەخۆمدا بگرم..***

**ماركۆز:** بۆچی؟

**ماگی:** ***لەبەرئەوەی مەبەست لەم گفتوگۆیە ئاگادار بوونە لە بۆچوونەكانی ئێوە سەبارەت كۆمەڵێك بابەت و ئەگەر سەرگەرمی وتووێژ بین دەربارەی ئەو مەسەلانەی باست كردن، ئەوا فریای ئەو بابەتانە ناكەوین. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانم بە تەواوەتی بەسەر قسەكانتاندا تێپەڕم، چونكە لەگەڵ ئەو ئەنجامانەدا كە لێیان دەكەوێتەوە تاڕادەیەكی زۆر ناكۆكم. بۆ نموونە ئێوە دەڵێن لۆكاڵیزەكردنی بەردەوامی دەسەڵاتی ئابووری هەبووە. بەڵام ئایا ئێوە لەو بڕوایەدا نین كە لە ئەنجامی دروستبوونی كۆمپانیا هاوبەشە گشتیەكانەوە، ئەمڕۆ لەهەر رۆژگارێكی دی زیاتر خاوەندارێتی سەرمایە بڵاوبۆتەوە؟ یان باسی پێكەوە لكانی دەسەڵاتی ئابووری‌و دەسەڵاتی سیاسی قسە دەكەین. ئەمە راستە، بەڵام لانی كەم ئەوەی لە دیموكراسیەكانی خۆرئاوادا روویداوە ئەوەیە كە بەشی زۆری بڕیاردانەكان بە شێوەیەكی گشتی-چ لە ئابووری‌و چ لە حكومەتدا- لە دەستی ئەو نوێنەرە سیاسیانەی خەڵكدایە كە راستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن.***

**ماركۆز:** با پێتان بڵێم، ئێوە بەو باسەتان كە یەكەمجار دەربارەی كۆمپانیا هاوبەشە گشتیەكان كردتان، لە راستیدا باسی یەكێك لە چەمكە سەرەكیەكانی سەرلەنوێ چاوپێداخشانەوەی ماركسیزمتان كرد، كە سەرەتا خودی ئینگلیز خۆی بەكاریهێناوە. كۆمپانیای هاوبەشی گشتی كە تیایدا خاوەندارێتی [لەدەستی یەك كەسدا نیەو] بڵاوە، بە یەكێك لە "پێش شێوەكان **Pre-forms**" [یان شێوە سەرەتاییەكان]ی كۆمەڵگای سۆسیالیستی دەژمێردرا. بەڵام ئەمڕۆ ئێمە دەزانین كە ئەم

قسەیە ڕاست نیە. تۆ دڵنیایت لەوەی کە بۆ نموونە لە کۆمپانیا گەورە فرە نەتەوەییەکاندا، خاوەن بەشەکان جڵەوی سیاسەتە نەتەوەیی یان جیهانیەکانی کۆمپانیاکەیان لە دەستدا نیە؟ بە تەنها خاوەندارێتی گرنگ نیە، ئەوەی گرنگی زۆرو دیاریکەری هەیە ئەوەیە کە جڵەوی هێزەکانی بەرهەمهێنان لە دەستی کێدایە. سەبارەت بە دەوڵەت و ڕۆڵی سیاسەتمەدارانیش، ئایا بە ڕاستی ئێوە بڕواتان وایە کە سیاسەتمەداران خۆیان بەتەنیاو وەکو کەسانێکی ئازاد بڕیار دەدەن؟ ئایا هیچ پەیوەندیەك لەنێوان سیاسەتمەداران و دەسەڵاتە ئابوورییە گەورەکانی ناو کۆمەڵگادا نیە؟

**ماگی:** *من دڵنیاتان دەکەم کە سیاسەتمەداران لەژێر ڕکێفی بەرژەوەندی ئابووری تایبەتیدا نین. بە پێچەوانەوە، خاوەن بەرژەوەندیە ئابووریە تایبەتیەکان بەردەوام هەوڵدەدەن ڕای سیاسەتمەداران بەلای خۆیاندا ڕابکێشن و کاریان لێ بکەن. بەهەرحاڵ، بەداخەوە کە دەبێ واز لەم مەسەلانە بهێنین و بگەڕێینەوە سەر قوتابخانەی فرانکفۆرت. لە پێشەکیی ئەم گفتوگۆیەدا، ناوی دوو سێ ئەندامی قوتابخانەکەم برد. جێی خۆیەتی کە شتێك زیاتر دەربارەی تایبەتمەندیە کەسیەکانی ئەوان لە زمانی ئێوەوە ببیستین، لەبەر ئەوەی کە ئێوە باش یەکتریتان ناسیوە.*

**مارکۆز:** بۆتان باس بکەم، هۆرکهایمەر بەڕێوەبەرایەتی دەزگاکەی گرتبووە ئەستۆ، کە لە سەرێکەوە فەیلەسووف و کۆمەڵناسێکی تەواو ڕۆشنبیرو بەئاگا بوو، لە سەرێکی تریشەوە، لە مەسەلە داراییەکاندا کە بناغەی مادیی دەزگاکە بوو، نەك هەر لە ئەڵمانیا بەڵکو لە ئەمریکاشدا، زۆر باش سەرپەرشتی دەکرد و کەسێکی لێهاتوو بوو. هیچ شتێك لە گۆڤارەکانی دەزگاکەدا، تەنانەت دواتریش، بەبێ لێدوانی پێشوەخت لەگەڵ ئەودا —هەروەها لەگەڵ هاوکارانی تریشدا— نەدەنووسرا. ئادۆرنۆش بلیمەت بوو. دەڵێم بلیمەت، لەبەر ئەوەی کەسێکی تری وەکو ئەوم نەدیوە هەروەکو خۆشتان ئاماژەتان پێدا وەکو یەك لە بوارەکانی فەلسەفەو کۆمەڵناسیو دەروونناسیو مۆسیقادا باڵادەست بێت. بە تەواوی کەسێکی سەیربوو. کاتێ قسەی دەکرد، دەکرا بەبێ هیچ دەسکارییەك یەکسەر ئەو قسانەی چاپ بکرانایە، واتە قسەکانی ئامادە بوون بۆ چاپ. هەروەها کەسانێکی دیکەش هەبوون کە بەداخەوە تا ئێستا هەقی خۆیان نەدراوەتێو لە بیرکراون، وەکو لیۆلۆڤینتال کە ڕەخنەگری ئەدەبی دەزگاکە بوو، هەروەها فەیلەسووفێکی هەڵکەوتووی حقوق کە ناوی فرانز نویمان بوو، هەروەها زانایەکی گەورەی دی لە بواری حقوقدا کە ناوی ئۆتۆکیرشهایمەر بوو، پاشان ئابووریناس و مێژوونووسی بێوێنە هنری گرۆسمان کە تا ئێستا کەسێکم نەبینوە وەکو ئەو لە ئابووریی مارکسیدا شارەزابێت و گەیشتبووە ڕادەیەك کە تەنانەت ساڵی ڕووخانی سەرمایەداریشی پێشبینی دەکرد.

**ماگی:** *وەکو هەندێ لە زانایانی ئاینی مەسیحیەت لە سەدەکانی ناوەندا کە پێشبینی ڕۆژی قیامەتیان دەکرد.*

**مارکۆز:** هەروەها یەکێك لەو کەسانەی کە لە ڕووی لێکۆڵینەوە ئابوورییەکانی دەزگاکەوە بایەخی هەبوو فریدریك پۆڵۆك بوو. وابزانم یەکەمین وتار کە بڵاوبۆوەو تیایدا هاتبوو کە هیچ هۆیەکی ئابووری قانعکەر پێویست نیە لە ناوخودی سەرمایەداریدا ئەو سیتسمە هەر دەبێ بڕوخێ، بە پێنووسی پۆڵۆك بوو. هەروەها ئەو سەرمایەداریی دەوڵەتیو بونیادەکان و ئایندەی مێژووییانی خستە بەر ڕەخنە.

***ماگی: یەکێك لەو ئاڵوگۆڕە فیکریانەی کە ئێوە هەمووتان لە ڕێی پەیڕەویکردنی ڕاستەوخۆی "لۆکاچ"ەوە هەوڵتاندا بیهێننە ئاراوە، جەختکردنە سەر نووسینەکانی تافی لاوێتی مارکس بوو؛ لەبری نووسینەکانی تافی کامڵبوونی، واتە ئێوە جەختتان لەو کارانەی کرد کە زیاتر لەژێر کاریگەریی هیگڵ دا نووسیبوونی، یەکێك لە بەرهەمەکانی ئەم کارەشتان، بایەخ و گرنگی پێدانی بەردەوام بوو، لەوساوە تا ئەمڕۆ، بە چەمکی "نامۆبوون" alienation، کە بە بڕوای من ئەو چەمکە بەو مانایەی ئەمڕۆی بۆ هیگڵ دەگەڕێتەوەو دواتریش مارکس هەمان وشەی هێناو واتاو گرنگیەکی نوێی پێدا. پاش ئەوە، لە ماوەی زیاتر لە پەنجا ساڵدا، نامۆبوون تاڕادەیەکی زۆر لە فیکری خۆرئاوادا ئامادە نەبوو. جا لەبەر ئەوەی ئێوە لە قوتابخانەی فرانکفۆرتدا لەگەڕاندنەوەی ئەو چەمکەدا ڕۆڵێکی کاریگەرتان هەبوو، شتێکی سەرنجڕاکێشە گوێمان لە تێبینی و ڕاوبۆچوونەکانی خۆتان بێت لەو بارەیەوە.***

**مارکۆز:** بۆتانی باس بکەم، چیرۆکی ئەمە گەلێ ئاڵۆزە. مارکس بڕوای وابوو کە "نامۆبوون" چەمکێکی کۆمەڵایەتی –ئابووریەو (گەرچی ئەم کورتکردنەوەیەی من زۆر ڕێکوپێك نیە) لە بنەڕەتدا ئەو مانایە دەدات کە لە سیستمی سەرمایەداریدا، ئافرەتان و پیاوان ناتوانن لە کارەکانیاندا هێزە مرۆییە تاکەکەسیەکانی خۆیان و پێداویستیەکانیان قایل بکەن، ئەم دەربەش دەرەنجامی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریەو، تەنها بەگۆڕینی بنەڕەتی ئەو شێوە بەرهەمهێنانە چارەسەر دەکرێ. بەڵام ئەمڕۆ چەمکی نامۆبوون بەڕادەیەك فراوانبووە کە تا ڕادەیەکی زۆر ناوەڕۆکی سەرەکی خۆی لە یاد چووەتەوەو ئێستا ناوێکە بۆ جۆرەها کێشەی دەروونی‌و، خافڵ لەوەی کە هەر کێشەیەك لە ئارادا بوو، بۆ نموونە کەسێك لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا مەرج نیە هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری.

***ماگی: بە واتایەکی دی، ئێوە لەو بڕوایەدان کە چەمکەکە خراوەتە ئاستێکی نزمەوە.***

**مارکۆز:** خراوەتە ئاستێکی نزمەوەو پێویستە بگەڕێتەوە بۆ باری ئەسڵی و دروستی خۆی.

***ماگی: لەبەرئەوەی بە ڕەچاوکردنی ئەو مانایەی کە لە ئەسڵدا هەیبووە، هێشتا گرنگیەکی بنەڕەتی هەیە.***

**مارکۆز:** بەڵێ، گرنگیەکی بنەڕەتی..

***ماگی: تا ئێرە سەبارەت ئەو شتانەی دواین کە قوتابخانەی فرانکفۆرت لەگەڵیاندا ناکۆك بوو: سەبارەت ڕەخنەیان لە مارکسیزم و، لانی کەمیش سەبارەت ڕەخنەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت لە سەرمایەداری. بەڵام ئەو پرسیارە دواتر دێتە پێشێ ئەوەیە کە ئایا قوتابخانە کە لەچی قایل بووەو لایەنگری چی بووە؟ یان ئەگەر ئەم پرسیارە وەڵامی نیە (واتە وەڵامی نیە بەبێ شیکردنەوەو وەسفکردنی باری گشتی کۆمەڵگایەك، کە هەڵبەتە داواکردنی ئەو شتە لە ئێوە لەم گفتوگۆیەدا شتێکی نەشیاوە)، ڕێم بدەن پرسیارەکە بەم شێوەیە دابڕێژم و بپرسم، بەبۆچوونی ئێوە، ئەو یارمەتی‌و خزمەتە پۆزەتیڤیانەی قوتابخانەی فرانکفۆرت ئەنجامیداون چی بوون؟***

**مارکۆز:** لە سادەترینیانەوە دەستپێدەکەم. یەکێك لە کاریگەرترین خزمەتە پۆزەتیڤیەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، پێشبینی‌و تێگەیشتنی فاشیزمە لە ڕووی پەیوەندی ناوەوەیی‌و

خودبیەوە لەگەڵ سەرمایەداریدا. دووەم -کە ئەمەیان شتێکە بە بڕوای هۆرکهایمەر خۆیشی ئەدگاری تایبەتمەندو دیاریکەری قوتابخانەی فرانکفۆرت بوو- بەیەکداچوونی نێوان بوارەکان بوو لە کێشە کۆمەڵایەتیو سیاسیە گەورەکانی سەردەمەکەماندا، واتە وازهێنان لە سنوورە ئەکادیمیەکانی کارو سوودوەرگرتن لە کۆمەڵناسیو دەروونناسیو فەلسەفە بۆ تێگەیشتن و پەیبردن بە کێشەکانی سەردەم و هەروەها بە مەبەستی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە کە بە بۆچوونی من سەرنجڕاکێشترین مەسەلەیە: "چ خەوشێك لە ژیاری خۆرئاوادا پەیدا بووە کە رێك لە لووتکەی پێشکەوتنی تەکنیکیدا، پێشکەوتنی ئادەمیزاد بەدی ناکەین: واتە نەمانی مرۆڤایەتیو مرۆڤدۆستیو هەست و سۆزی مرۆییانەو زیندووکردنەوەی ئەشکەنجەدان وەکو شتێکی "ئاسایی" لە لێپرسینەوەداو پەرەسەندنی لایەنی وێرانکارانەی وزەی ئەتۆمیو ژاراوی بوونی ژینگە غەیری ئەمانە؟ چۆن شتی وا روویداوە؟" ئێمە لە قوتابخانەی فرانکفۆرتدا گەڕاینەوە بۆ مێژووی کۆمەڵایەتیو فیکریو، هەوڵماندا ئەوە روون بکەینەوە کە کارو کاردانەوەیەك لە نێوان پێشکەوتن و چەپاندندا لە مێژووی فیکری خۆرئاوادا هەبووە، بەتایبەتیش لە چاخی رۆشنگەریدا [واتە سەدەی هەژدەیەم] کە بە یەکێك لە پێشکەوتووترین قۆناغەکانی مێژوو لە قەڵەم دەدرێ، ئێمە دەمانویست سەر لەم پێکەوە بوونە بە رواڵەت حەتمیو ناچاریەی مەیلە ئازادی بەخشەکان و مەیلە سەرکوتکەرەکان دەربکەین.

**ماگی:** ***ئەو وێنەیەی ئێوە دەیکێشن وێنەی کۆمەڵێك مارکسیستە کە هەموویان سەوداسەری ئەو خولیا فیکریەن کە لە کوێی کارەکەدا خەوش هەیە؟ لە رێی ئەم وێنەیەوە، جۆرە تیۆرەیەکی سیاسی سەرچاوەگرتوو لە نائومێدی دەبینینەوە. بناغەی هەموو شتەکان وەکو دەردەکەوێ جۆرە روانینێکی سەرچاوەگرتوو لە نائومێدیە: نەك بەتەنها نائومێدی لە تیۆرەی مارکسیستی، بەڵکو هەروەها لە واقیعە کۆمەڵایەتیەکەو بۆ نموونە لە چینی کرێکار لەبەرئەوەی نەیتوانیوە ببێتە ئامرازێکی شۆڕشگێڕانەی کاریگەر. ئایا لە بنەڕەتدا جۆرە نائومێدیو بێ هیواییەك و تەنانەت بەدبینیەك لە قوتابخانەی فرانکفۆرتدا نەبوو؟***

**مارکۆز:** بەو شێوەیەی ئێوە مەسەلەکەتان روون کردەوە، ئەگەر مەبەست لە نائومێدی، نائومێدیە لە چینی کرێکار، من بە دڵنیاییەوە ئەم قسەیە رەت دەکەمەوە. هیچ کەس لە ئێمە مافی ئەوەی نیە چینی کرێکار لەوەی دەیکات یان نایکات بە کەمتەرخەم بزانێت. بەم پێیە ئەگەر مەبەست لەم بەشەی نائومێدیە، ئەوا بەدڵنیاییەوە نەء. بەڵام بەشێکی تر لە نائومێدی هەبوو کە پێشتریش ئاماژەم پێداو، بە بۆچوونی من شتێك بوو بەشێوەیەکی بابەتی هەبوو و، ئەو نائومێدیەش لەوەبوو کە ئەو سامانە کۆمەڵایەتیە لەبن نەهاتووەی کە لە ئەنجامی سەرکەوتنی سەرمایەداریەوە خڕبۆتەوە، بەشێوەیەکی رۆژانە نەك بۆ بیناکردن، بەڵکو بۆ بەرگرتن لە هێنانە ئاراوەی کۆمەڵگایەکی باشترو پاکترو مرۆییتر بەکار دەبرێ. ئەگەر مەبەستی ئێوە لە نائومێدی ئەمەیە، بەڵێ، بەڵام هەروەکو وتم، ئەم جۆرە نائومێدیە پاساودراو و بابەتیە.

**ماگی:** ***پێویستە ئەوە بڵێین کە ئێوە لە قوتابخانەی فرانکفۆرت، ئەرکی سەرەکی خۆتان بە توێژینەوە لە هۆیەکان و چۆنێتیو دروستبوونی ئەم نائومێدیە دەزانی.***

**مارکۆز:** رێك وایە.

***ماگی: کەواتە ئەرکی سەرەکی قوتابخانەی فرانکفۆرت لە بنەڕەتدا ڕەخنەو هەڵسەنگاندن بوو.***

**مارکۆز:** بێگومان. کاتێ دەبینین هەندێ جار بەکارەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەڵێن "تیۆرەی رەخنەیی Critical Theory"، لەوەوە سەرچاوەی گرتووە.

***ماگی: یەکێك لەو بوارانەی کە ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت هەر لەسەرەتاوە بایەخێکی تایبەتیان پێ دەدا ئیستاتیکا بوو. هەر ئەمەش ئەو قوتابخانەیەی لە فەلسەفەکانی تر، بەتایبەتیش فەلسەفە سیاسیەکان جیادەکردەوە. ئێوە خۆتان لەم ساڵانەی دواییدا گەلێ بابەتتان سەبارەت مەسەلەکانی ئیستاتیکا نووسیوە. ئێوەو هاوکارانتان بۆچی ئیستاتیکاتان هێندە بەگرنگ دەزانی؟***

**مارکۆز:** پێتان بڵێم، من لەو بڕوایەدام -هەر ئەمەش هۆی ئەوەیە کە من لە ئادۆرنۆوە نزیکترم وەك لەوانی دی- کە لە هونەرو ئەدەب و مۆسیقادا گوزارشت لە ڕوانین و حەقیقەتی وەها دەکرێ کە ناتوانرێ بەهیچ جۆرێکی دی گوزارشتیان لێ بکرێ. لە شێوە جۆراوجۆرەکانی هونەرو جوانیدا ڕەهەندی تازەی وەها دەکرێنەوە کە لە دونیای واقیعدا یان سەرکوت دەکرێن و یان لەخانەی تابوو (قەدەغە)کاندان، واتە وێنەگەلێکی وەها لە بوونی مرۆڤ و سروشتێك کە چیدی گرفتاری تەڵەزگەی ڕێساکانی پرنسیپی سەرکوتکەری واقیع نیەو، لە ڕاستیدا با بەنرخی مەرگیش بێ هەوڵی وەدیهاتن و ئازادی دەدات. من هەوڵم دا گەواهیەك بۆ ئەم مەبەستەم بهێنمەوەو بڵێم.. ڕێم بدەن لێرەشدا وشەیەکی ترسناك بەکاربهێنم.. پەیامی هونەرو ئەدەب ئەوەیە کە جیهان لە ڕاستیدا بەو جۆرەیە کە عاشقەکان لەهەر سەردەم و زەمانێکدا تێیگەیشتوون، جیهان بەو جۆرەیە کە لای شالیرو ئەنتۆنی و کلیۆپاترا تاقیکراوەتەوە. بە واتایەکی دی، هونەر دابڕانە لە پرنسیپی واقیع و، لە هەمان کاتدا ئاوێزانبوونی وێنەی ئازادیە.

***ماگی: ئەوەی دەیڵێن لەگەڵ ئەو شتەدا کە لە سەرەتادا پێتان لەسەری دادەگرت تەبایە، لەسەر ئەو بناغەیەی کە دەبێ سۆسیالیزم وەکو گوتەیەك سەبارەت چۆنێتیەکی تری ژیان وەربگیرێ، نەك بەتەنها وەکو گوتەیەك سەبارەت بە گۆڕانکاریە مادیەکان. ئەگەر ئەدەب بە گەنجینەیەکی بەها نوێیەکان بزانن، ئەوا هەرگیز بە ڕەخنەیەکی رووتی لەقەڵەم نادەن لە کۆمەڵگای باو -یان بە پێچەوانەی زۆربەی ڕەخنەگرانی مارکسیستی ئەدەبەوە- تەنها بە ئامرازێکی شۆڕشگێڕانەی لە قەڵەم نادەن.***

**مارکۆز:** من هەموو ئەدەبێکی ڕاستەقینە بەهەردووکیان دەزانم. ئەدەب لە سەرێکەوە (دەعوا)یە لەسەر کۆمەڵگای باوو، لە سەرێکی تریشەوە (کە بە لایەنی پێشووشەوە بەستراوەتەوە) مژدە بەخشی ئازادیە. من هەرگیز بڕوام وانیە کە کاری ئەدەبی دەبێ تەنها لە چوارچێوەی خەباتی چینایەتیدا یان پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان relations of production دا گوزارشتی لێ بکرێ.

***ماگی: هەروەکو ئێستا وتم، ئەمە یەکێکە لە بوارە کردەییەکانی بیرمەندانی پەیڕەویکەر لە نەریتی قوتابخانەی فرانکفۆرت، وەك خۆتان، ئایا بەڕای ئێوە ئەم قوتابخانە فەلسەفیەی ئێوە لە ئایندەیەکی نزیکدا یان تا ڕادەیەك نزیك، گرنگی بە چ بوارێکی دی دەدات؟***

**مارکۆز:** من تەنها دەتوانم باسی خۆم بکەم، بەڕای من پێویستە زۆر زیاتر لە جاران بایەخ بە

بزاڤی ئافرەتان بدرێ. من ئەمڕۆ لە بزاڤی ئازادیی ئافرەتاندا توانایەکی بەهێز دەبینمەوە. ڕوونکردنەوەی هۆی ئەمەش پێویستی بە قسەلێکردنی جیاواز هەیە. بەڵام ڕێم بدەن مەسەلەکە بە دوو دێڕ کورت بکەمەوە: تا ئەمڕۆ، هەموو دەسەڵاتەکان لە مێژووی تۆمارکراوی مرۆڤدا دەسەڵاتی باوکسالاری patriarchal domination بوون. بەم پێیە، ئەگەر ماین و نەك هەر یەکسانی ئافرەتان لەبەردەم یاسادا، بەڵکو ئەگەر جێگیربوونی سیفاتە تایبەتە ئافرەتەکانیشمان بینی لە کۆمەڵگادا، لە ڕاستیدا ئەمە دەبێتە بنەمایەکی جیاوازی کۆمەڵگا لە ڕووی چۆنێتییەوە، یان دەکرێ وای لێ بێت، واتە خاڵی بەرامبەر دەسەڵاتی زبرو دڕندانەی پیاوانە. هەڵبەتە من تەواو لەوە بە ئاگام کە ئەم سیفاتە ئافرەتانەیە بەرهەمی هەلومەرجە کۆمەڵایەتیەکانە..

**ماگی:** ***کەسانێك هەن کە قسەکردن لەسەر بوونی سیفاتی ئافرەتانە دەگەڕێننەوە بۆ پێشداوەریی و جیاوازخوازیی ڕەگەزی، وابزانم زۆربەی پەیڕەویکەرانی ئێوە سەر بەو دەستەیەن.***

**مارکۆز:** ئەوەم بەلاوە گرنگ نیە. ئەمانە بەرهەمی هەلومەرجی کۆمەڵایەتین، بەڵام بەهەرحاڵ بوونیان هەیە. لەبەر ئەوەیە هۆیەك نیە وامان لێ بکات ئەم لاوازیە بۆ هێزو ئەم "سروشتە لاوەکیە" بۆ هێزی کۆمەڵایەتی بگۆڕین.

**ماگی:** ***لە کۆتایی باسەکەماندا دەمەوێ یەك دوو ڕەخنە لەو ڕەخنانەی لە ئێوەی دەگرن، بخەمەڕوو. گرنگترین ڕەخنە ئەوەی کە پێشتریش وتم، واتە ئەوەی کە ئێوە بە کۆمەڵێك چەمکی تیۆرەیەکی پووچەڵکراوەوە، کە مارکسیزمە، خۆتان بەستۆتەوەو، لە ئەنجامیشدا، سوورن لەسەر ئەوەی کە هەموو شتەکان بە چاوێکی ترەوە ببینن و وەسفی بکەن. ئەو دونیایەی کە ئێوە باسی لێوە دەکەن، دونیایەك نیە لە دەوروبەرماندا بیبینین، بەڵکو دونیایەکە بەتەنها لە بونیادە فیکریەکانی ئێوەدا بوونی هەیە. ئایا شتێکی ترتان هەیە لەوەڵامی ئەم ڕەخنەیەدا بیڵێن؟***

**مارکۆز:** من پێم وا نیە تیۆرەی مارکسی پووچەڵکرابێتەوە. دەتوانین هەر بەیارمەتی ئەو تیۆرەیە خۆی ئەو شتانەی لە واقیعدا لە گەڵیدا وێکنایەنەوە، ڕوونیان بکەینەوە. واتە لە ڕێی گۆڕانی ناوەوەی چەمکە پەیوەندیدارەکانەوە بەو شتانە.

**ماگی:** ***ئەو هەموو کەموکورتییانەی کە خۆتان دان بە بوونیاندا دەنێن لەنێو مارکسیزمدا واتان لێ ناکات دەستبەرداری مارکسیزم بن، ئەی کەواتە ئەی چی واتان لێ دەکات دەستبەرداری بن؟***

**مارکۆز:** تیۆرەی مارکسی ڕۆژێك پووچەڵ دەبێتەوە کە ناکۆکی نێوان سامانی کۆمەڵایەتیمان ڕۆژانە ڕوو لە زیادبوونە و بەکاربردنی وێرانکەرانەی لە چوارچێوەی خودی سەرمایەداریدا نەمێنێت، ڕۆژێك کە ژاراویکردنی ژینگە نەمێنێت، ڕۆژێك کە سەرمایە بتوانێ ڕێگا ئاشتیخوازەکان بگرێتەبەر، ڕۆژێك کە بەردەوام جیاوازیی نێوان دەوڵەمەندو هەژار ڕوو لە کەمبوونەوە بێت، ڕۆژێك کە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی لە پێناوی گەشەسەندنی ئازادیدا بەکاربرێ، دووپاتیشی دەکەمەوە، هەموو ئەمانە لە چوارچێوەی خودی سەرمایەداریدا ڕوو بدەن.

**ماگی:** ***بە بۆچوونی من، قسەکەی ئێوە ئەوە دەگەیەنێت کە تا ئەو ڕۆژەی سەرمایەداری لە هەموو خەوش و کەموکورتیەك ڕزگاری نەبێت و نەگاتە ڕادەی کامڵبوون، مارکسیزم پووچەڵ نابێتەوەو،***

*ئەمەش لە راستیدا یەکسانە بەوەی بڵێین مارکسیزم مەحاڵە پووچەڵ بێتەوە. بەڵام جگە لەمە، هەندێ رەخنەی تریش هەن کە حەزدەکەم لەگەڵتاندا باسی بکەم. زۆر جار دەوترێ کە بزاڤی چەپی نوێ نوخبەگەرایە. دەوترێ کە چەپی نوێی پێکهاتووە لە گروپی بچووک بچووک و لە ژمارەیەك لە رۆشنبیران بە ئەنقەست خۆیان بە چینی ناوەڕاستەوە بەستۆتەوەو بەخۆیاندا هەڵدەدەن و (هەروەکو ئێوەش لەگەڵ ئەوەدان) بە چینی کرێکار بێگانەن و خۆیان بە پێشرەوی یان سەرقافڵەی شۆڕش دەزانن. دەوترێ کە بەشی زۆری چەپی نوێ دوای مۆدو سەلیقەی رۆژ دەکەوێ و لە چینی راستەقینەی کرێکاران جیابۆتەوە، ئەو چینەی کە بڕیاربوو مەبەست و ئامانجی بزاڤەکە بێت و، لەم نێوەشدا چینی راستەقینەی کرێکاران، دژ بە شۆڕش و موحافەزەکاری لێهاتووەو بۆچوونی لە زەمینەوە تا ئاسمان لە بۆچوون و تێڕوانینی چەپی نوێ جیاوازە.*

**مارکۆز:** بەهەرحاڵ من سیفەتی "نوخبەگەرا" رەتدەکەمەوەو لەو بڕوایەدام کە ئەم وشەیە نیشانەی جۆرە ماسۆشیزمێکە لای هەندێ کەسانی سەر بە چەپی نوێ. ئەوەی لە ئارادایە "نوخبەگەرایی" نیە. ئێمە کۆمەڵێك گروپی بچووکین، کە بە رای من وا باشترە پێیان بوترێ گروپە یاریدەرەکان، یان گروپە خێرایی بەخشەکان، واتە ئەو گروپانەی کە لە رێی ئیمتیازیاتیانەوە یان بەهۆی ئەو خوێندنەوە کە تەواویان کردووە، هۆش و ئەقڵیان دوور لە پرۆسەی مادیی بەرهەمهێنانی گەشە پێدەدەن. ئەم مەسەلەیەش بە فەرماندان چارەسەر نابێ، بەڵکو تەنها لە خودی بزاوتی گۆڕانەکە خۆیدا چارەسەر دەبێ. پاشان، من هیچ کاتێ نەموتووە کە ئەم گروپە یاریدەرانە دەتوانن وەکو بکەری شۆڕش جێی چینی کرێکار بگرنەوە. ئەمانە گروپی فێرکارن کە کاریان فێرکردنی سیاسیە -گەرچی ئەمە تاقە کاریان نیە-، ئەرکیان گەشەدانە بە هۆشیاریو پووچەڵکردنەوەی ئەو بەڕێوەبردن و کۆنترۆڵی هۆشیاریەی لەلایەن رێکخراوە جێگیرەکانی دەسەڵاتەوە لە روانگەی کردەییو تیۆرییەوە. بەڵام قەدەری ئەم گروپانە وایە کە جێگرەوەی چینی کرێکار خۆی نین.

**ماگی:** *زۆر جار رەخنەیەکی تریشتان ئاراستەدەکرێ، ئەویش ئەوەیە کە گوایە نووسینەکانی ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت نەك هەر دژوارن، بەڵکو داخراوو ئاڵۆزو هەندێ جاریش خوێنەر لێیان تێناگات. با ئادۆرنۆ بۆ نموونە بهێنینەوە. ئێوە پێشتر وتتان کە ئادۆرنۆ بلیمەتە. بەڵام بەرای من کارەکانی هەر ناخوێندرێنەوە. بە بڕوای من ئەمە لە نێوان ئەو بیروڕایانەدا کە قوتابخانەی فرانکفۆت دەیویست بڵاویان بکاتەوە لەناو ئەو خەڵکەدا کە دەیانویست بیروڕاکانی خۆیانیان پێ بگەیەنن، رێگرو لەمپەرێکی گەورە دەخولقێنێت. بەم پێیە، ئەو رەخنەیە لەم رووەوە باسدەکرێ رەخنەیەکی گرنگەو گرنگتریش دەبێت کاتێ دەبینین ئەو کەسانەی کە فەلسەفەی دی لەبری بیروبۆچوونەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەخەنەروو، نووسەرانێکی بەتواناترو باشترن. بۆ نموونە لە فەلسەفەی زماندا یان شیکردنەوەی زماندا، نەریتێك بۆ روونووسیو تەنانەت وردبینیو ناسکیو رەوانی نیە. هەرچۆنێك بێت، برتراند رەسل براوەی خەڵاتی نۆبڵە لە ئەدەبدا، بەهەمان شێوە جان پۆل سارتەر، ناسراوترین راڤەکەرو لایەنگری ئێگزستانسیالیزم یان فەلسەفەی وجودیەت. بەم پێیە کاتێ*

***کەسێك فەلسەفەی ئێگزستانسیالیزم یا فەلسەفەی زمان دەخوێنێتەوە، لە زۆربەی کاتدا ڕووبەڕووی پەخشانێك دەبێتەوە کە لە ڕووی (پەخشان)ەوە زۆر بەرزە. بەڵام کاتێ کارەکانی ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەخوێنێتەوە...***

**مارکۆز:** منیش تاڕادەیەك لەگەڵ ئەو ڕایەی ئێوەدام و دانی پێدا دەنێم کە لە زۆربەی شتەکانی ئادۆرنۆ ناگەم. بەڵام حەز دەکەم لێرەدا لانی کەم چەند وشەیەك دەربارەی ئەوەی خۆی بۆ پاساودانی ئەو مەسەلەیە گوتوویەتی، بخەمە ڕوو. بە قسەی ئەو مەسەلەکە ئەوەیە کە زمان و پەخشانی ئاسایی، چەند جوان و زیرەکانەش بن، لەهەر سووچ و پەنایەکیدا پڕە لە کاریگەریی "دەزگا"و، بە ڕادەیەك دەسەڵات و دەستێوەردانەکانی سەرتاکەکەس لەلایەن ڕێکخراوەکانی دەسەڵاتەوە تیایدا ڕەنگ دەداتەوە، کە بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەو ئاراستەیەی، ناچاریت لەو زمانەدا کە بەکاریدەهێنیت ئەوە بخەیتەڕوو کە پەیوەندی خۆت لەگەڵ خەڵکە چوونیەکەکاندا پچڕاندووە. هەوڵدان بۆ گەیاندن و تێگەیاندنی ئەم پچڕانی پەیوەندیە لە ڕێی سینتاکس و ڕێزمان و وشەو تەنانەت خاڵبەندیشەوە، لەم شتەوە سەرچاوە دەگرێ. بەڵام تاقە شتێك کە خۆم دەتوانم بیڵێم ئەوەیە کە هەر جۆرە پەلەکردنێك بۆ قایلکردنی هەموو خەڵك و تێگەیاندنیان لە کێشە ئاڵۆزو ترسناکەکانی ئەمرۆش بەهەمان شێوە شتێکی ترسناکە.

**ماگی:** ***لە کۆتایی ئەم گفتوگۆیەدا ئەگەر ڕێم بدەن حەزدەکەم پرسیارێکی تایبەتیتان لێ بکەم. ئەو ئەزموونەی کە ئێوە [لەژیاندا] هەتانە لە مێژوودا بۆ کەم کەس هەڵکەوتووە. ئێوە تەمەنێك -تەمەنێکی درێژیش- پیاوێکی ئەکادیمی و لێکۆڵەرەوە بوون کە بە تەنها بازنەیەکی بچووك لە قوتابیان و خوێنەرانی تاڕادەیەك پسپۆڕ وتارو کتێبەکانی ئێوەیان دەناسی، بەڵام ناکاو لە پیریدا، لە شەوو ڕۆژێکدا ناوبانگێکی جیهانیتان پەیدا کرد. ئەمە سەیرترین شتە بۆ کەسێك ڕووبدات. لەم بارەیەوە چ هەستێکتان هەیە؟.***

**مارکۆز:** با پێتان بڵێم، لە سەرێکەوە زۆرم پێ خۆش بووە، بەڵام لە سەرێکی تریشەوە هەستم دەکرد من شایانی ئەوە نیم. ئەگەر ئەمەش کۆتایی باسەکەمانە، دەمەوێ تۆزێك بە بێ ڕووییەوە کۆتایی بە قسەکانم بهێنم... بەڵام نا، بێ ڕووییش نیە. کاتێ پرسیارم لێ دەکرا "چۆن شتی وا دەبێت؟" هەمیشە دەمگوت: "من تەنها بۆیە وا دێمە بەرچاوی خەڵك لەبەرئەوەی دیارە خەڵکانی دی لە منیش بە کەم شایانتر دەبینرێن".

**ماگی:** ***کەس چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد. من بڕوام وایە کە لە ڕاستیدا خۆشتان هەرگیز لە خەونیشدا چاوەڕێی ئەوە نەبوون بەم جۆرە ناوبانگ بدەنەوە.***

**مارکۆز:** بەدڵنیاییەوە، تەنانەت لە خەونیشدا چاوەڕێی ئەوە نەبووم*.

**ئەم گفتوگۆیە لەم کتێبەوە کراوە بە کوردی:*
*مردان اندیشه- پدید آورندگان فلسفه معاصر، براین مگی- ترجمه: عزت الله فولادوند- نشر طرح نو- چاپ دوم 1378 (1999)- تهران.*

❑



# وێستگەکانی سەردەم






- هایدگەرو هانا ئارێنت لە نێوان عیشق و فەلسەفەدا
- دیموکراسی و ڕادیکاڵی
- ئەبێ لە بەر باراندا لەگەڵ ئافرەتا بخەوین
- ماڵئاوایی لە ڕابردووم
- نامەیەك بۆ شێرکۆ بێکەس
- ڕۆژهەڵاتی خۆر، ڕۆژئاوای مانگ
- کاپتن لە خوێندا
- هەڕاجکردنی تابلۆیەکی سیزان






مارتن هایدگەر

# "مارتن هایدگەر" و "هانا ئارێنت" لەنێوان عەشق و فەلسەفەدا

• و.سەردەم

ئەم ڕۆمانە تازەیەی خاتوو کاترین کلیمان چیرۆکێکی واقعییە، چیرۆکی خۆشەویستی نێوان "مارتن هایدگەر"ی فەیلەسوفی ئەڵمانی و "هانا ئارنت"ی قوتابییەتی. ئەم پەیوەندییەش لە ساڵی 1924وە دەستی پێکردووەو بە شێوەیەکی پچڕپچڕ بۆ ماوەی پەنجا ساڵ بەردەوام بووە، تا کاتی مردنی "ئارنت" لە ساڵی 1975دا. نووسەری ئەم ڕۆمانە سەرچاوەی نوسینی ئەم بەرهەمە تازەیەی دەگەڕێنێتەوە بۆ کتێبەکەی خاتوو ئەلیزابێث یۆنگ-برۆهل کە تایبەتە بە ژیاننامەی "هانا ئارنت" و خوێندنەوەی ئەو کتێبە وای لێکردووە ڕۆمانی "مارتن هانا" بنووسێت. ساڵی 1986 یۆنگ-برۆهل دەنووسێت: ئەگەرچی ئارنت ساڵی 1974 لە سەردانەکەیدا بۆ لای مارتن هایدگەر سەرکەوتوو نەبوو بەڵام لەگەڵ ئەوەش بڕیاریدا بگەڕێتەوە فرایبۆرگ. ئەوکات هایدگەر نەخۆش بوو ئەلفریدی خێزانیشی لە پای ئەو حاڵەی هاوسەرەکەی، بە لوتفەوە پێشوازی لە ئارنت کردو لەگەڵ یەك ئاشتبوونە).

"ئارنت" لە چواری کانونی یەکەمی 1975داو لە ئەنجامی جەڵدەیەکی دڵی کتوپڕدا لە شاری نیویۆرك کۆچی دوایی کردو، بە چوار مانگ بەر لەو ڕووداوە سەردانی فەیلەسوفی گەورەی ئەڵمانیای کرد لە ماڵەکەی خۆیدا. کلیمان لە ڕۆمانەکەیدا زیاتر بایەخ بە گفتوگۆکانی نێوان "هانا"و "ئەلفرید" دەدات و، لە ڕێی یادەوەری ئەوانەوە چیرۆکی ئەو عیشقە سەرسوڕهێنەرە دەنووسێتەوە کە لە نێوان خوێندکارێکی یەهودیو مامۆستاکەیدا ڕوودەدات. ئەو مامۆستایەی ساڵی 1933 بووە ئەندامێکی نازیەکان کاتێك ڕازی بوو بەوەی ببێتە سەرۆکی زانکۆی فرایبۆرگ و، بەو بۆنەیەشەوە وتارێکی داو تیایدا دەست خۆشی لە "دامەزراندن و دروست بوونی ئەڵمانیایەکی

نویّ" کرد. بەلام. "هایدگەر" زۆر لەم پۆستە تازەیەیدا نەمایەوەو پاش دە مانگ دەستی لە کار کێشایەوە بە بیانووی ناکۆکیو نەگونجانی لەگەڵ سیاسەتی کلتووری نازیزمدا.

لە پایزی 1924دا "هانا" لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو گوێی لەوانە فەلسەفیەکانی "هایدگەر" دەگرت، کە ئەو کاتە ئەو لە تەمەنی سیو پێنج ساڵیدا بوو خاوەنی ژنێك و دوو کوڕ بوو، هاوکات سەرقاڵی کارکردن بوو لە گرنگترین پرۆژە فەلسەفیەکانی سەدەی بیست دا کە ئەویش شاکارە گەورەکەی (بوون و کات) بوو لە ساڵی 1927 لە چاپ درا.

پەیوەندی (هاناو مارتن) پەیوەندیەکی نهێنی بوو، (ئەلفرید)ی هاوسەری "هایدگەر" تەنها لە ساڵی 1950داو دوای چارەکە سەدەیەك بەمەی زانی. چونکە لەو ساڵەداو دوای لێك دابڕانێك بۆ ماوەی بیست ساڵ "هانا" گەڕایەوە فرایبۆرگ تا بە دیداری "هایدگەر" شادبێتەوە.

لە فرایبۆرگ لە سەر داوای "هایدگەر" (هاناو ئەلفرید) یەکتریان ناسیو، دواتر بە درێژایی بیست و چوار ساڵ هەریەك لە (هایدگەرو ئارنت) کەوتنەوە نامە گۆڕینەوەو یەکتر بینین، بەلام ئەمجارەیان لەژێر چاودێریو بە ئاگاداری (ئەلفرید) کەلە نزیکەوە بە وردی دیقەتی ئەو خۆشەویستیە قوڵە دەدا کە سەرلەنوێ تازە بوبووەوە.

(ئارنت) وەك زۆربەی یەهودیەکانی ئەڵمانیا لە دەست هیتلەر هەڵات و لەگەڵ دایکیدا روویان کردە فەرەنسا، لەوێ لە ئۆردوگای "گۆرس" دەسگیر




کران. پاشان توانیان لەوێ هەڵبێن و لە ساڵی 1941 ڕوو بکەنە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لەوێدا شووی کردو دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەو لە چاپدانی چەند بەرهەمێکی فەلسەفی دەربارەی تۆتالیتاریەت و هەڵوێستی دژ بە رەگەزی سامی. (ئارنت) نکوڵی لەوە نەدەکرد کە بڵێت کتێبەکەی (حاڵی مرۆڤی هاوچەرخ) لەزۆربەی بیرو بۆچونەکانیدا قەرزاری فیکری (هایدگەر)ە. هەر لەدوای ساڵی 1950وە هەوڵی زۆریدا تا "هایدگەر" لەو تۆمەتانە دووریخاتەوە کە دەدرانە پاڵی، هەروەها رۆڵێکی بەرچاویشی هەبوو لە وەی کارو بەرهەمەکانی لە ولاتە یەکگرتووەکان دا بە چاپ بگەیەنێت.

ئەم ڕۆمانەی (کاترین کلیمان) باس لە عەشقی ئەو پیاو و ژنە دەکات کە بووە قەدەریان و لە کۆنیسبۆرگەوە بۆ فرایبۆرگ، لە ماربۆرگەوە بۆ بەرلین، لە پاریسەوە بۆ نیویۆرك و بۆ قودس، لە رایخی سێهەمەوە بۆ ئەڵمانیای دوای جەنگ هەر بەردەوام بوو. ئەمێستاش لە رێی ئەم ڕۆمانەوە و چەند کتێبێکی دیکەی وك (نامە گۆڕینەوەی نێوان هایدگەرو ئارنت) و کتێبەکەی فەیلەسوفی فەرەنسی (فرانسوافیدیی) و فیلمە بەڵگەنامەییەکەی (ڕۆنی براومان و ئیال سیڤان) سەربوردەی ئەم دوو فەیلەسوفە عاشقە جارێکی تر دێتەوە بەرباس و قسە لەسەرکردن.

* الحياة (13197) 1999/4/26

❑

# دیموکراسی و رادیکالّی

## (خوێندنەوەی کتێبی "بەهاکانی فرەدەنگی" ویلیەم کۆنۆلی)

■ خوێندنەوەی: کریس ئێریکسۆن

● و. لە ئینگلیزیەوە: پەیوەند فایەق

جەنگی سارد کۆتایی هات، وەك دەبیستین دیموکراسیش بالآدەست بووەو کۆتایی مێژووش هاتووە. هەموو ئەوەشی کە دەمێنێتەوە بۆ ئەوەیە کە ئەو کەمە پاشماوانەی بەرگری لەخۆیان دەکەن بخرێنە ژێر تیشکی عەقڵەوە. بەڵام هێشتا سەرکەوتنی دیموکراسییەتی فرەدەنگی ئێمەی لە بەردەم گومان و جۆرە نادڵنیابوونێکدا راگرتووە. کارکردن لەژێر ناوی ئەو یەکێتیەدا کە میشیل والزەر بە "تێگەیشتنی هاوبەش"ی فرەدەنگی ناوی دەبات زیاتر ئاستی پەرتبوون و دابەشبوون بەرز دەکاتەوە. لە کۆمەڵە وتارێکدا، ویلیەم کۆنۆلی لە ژێر زاراوەی بوونی پەیوەندی لە نێوان فاندەمێنتاڵیزم و فرەدەنگیدا لەو گومان و نادڵنیابوونە دەدوێت. هەر بڕوایەك دەوەستێتە سەر زنجیرەیەك گریمانی بنەڕەتیو فاندەمێنتاڵیزم ستراتیژیەتێکی سیاسیانەیە بۆ ئەوەی ئەو گریمانانە لە هێنانە قسەو وەڵامدانەوە دوور بخاتەوە. فاندەمێنتالیزم بەو جۆرە ڕەخنەگرە نەیارەکانی پێناسە دەکات کە سەرجەم هەموو ئەو کەمو کورتیانەیان هەیە کە پێیان وایە دەبێ فەرمانە سەپێندراوەکانی خوداو سروشت و عەقڵ و فیکر یان سروشتی بوون هەموویان هەڵبوەشێنرێنەوە. ناکۆکیەکی خولقێنەرانە لە نێوان بە فاندەمێنتالیزم بوون و فرەدەنگیدا هەیە، یەکەمیان بەدوای پتەوکردن و پاراستنی سنوورەکاندا دەگەڕێت لە کاتێکدا دووەمیان دژی هەموو سنورێکەو لە ڕوویدا دەوەستێو فراوانیان دەکات. هەروەك هەموو لە ڕووداوەستانێکیش مەترسی بنیادنانی ستراتیژیەتی بەرامبەری لێ دەکرێت و دەشێت فرەدەنگی لەو لە ڕووداوەستانەدا خۆی ببێتە فاندەمینتاڵ. ویلیەم کۆنۆلی هەوڵی شکاندنی ئەو (سوڕە)یان (بازنەیە) دەدات و تەکنیکەکانی جینالۆجیاو هەڵوەشاندنەوە بەکاردێنێت بۆ ئاشکراکردنی ئیحتمالی شاراوەی ڕوودان و

ململانێ یان لە ڕوودا وەستانی هەر زنجیرەیەك لە گریمانی ئەنتۆلۆجیانە کە داوای دەسەڵاتی ڕەها دەکەن.

سەرەڕای قەرزباری بۆ پۆست مۆدیرنیستەکان، ویلیەم کۆنۆلی لێیان جیادەبێتەوە چونکە ئەو بڕوای وایە ئەڵتەرناتیفێك کە شایانی پەرەسەندنە ئامادەیەو لە بەردەستدایە. لە ڕوودا وەستانی سەرجەم داواکاریە فاندامێنتالیەکان - کەئەو پێیان دەڵێت: بوونی سیاسیانە لەبری بوونی ئەنتۆلۆجیانە- کە بە مەبەستی دورخستنەوەی پێشنیاری تاکە لۆجیکێکی ئەنتۆلۆجیانەیە بۆشاییەکی ناجێگر دەکاتەوە کە دەشێ تیایدا کاری سیاسیانە بە ئەنجام بگات. لێرەدا "وەڵامدانەوەی ئەخلاقی ڕەخنەییانەو کەشی ڕێزێکی بە ئازار" دەشێ پەرەبسەنن. دەشێ ئەم جۆرە بەهایە بە مەبەستی بەدەست هێنان باسی لێوە بکرێت کاتێ کە تاکە کەس یان گروپ بە ئاگابێت لە هەردوو لایەنی سروشتی پشت بەستن بە ناسنامەکانی (پیاو/ژن/شت)، هەروەها بە ئاگابێت لەو دوورخستنەوانەی کە لە ئەنجامی ئەو پشت بەستنەدا دەسەپێنرێت. ئەمەش یارمەتیو توانا دەدا بە تاکە کەس یان گروپ بۆ وەڵامدانەوەی جیاوازیەکان بە دوور لە شێوازو ڕێگای دوژمنکارانە بەڵکو لەگەڵ ڕێزدانان و بەهێندگرتنی ئەوەدا کە بوار دەدات بە ناسنامەی خۆیی (پیاو/ژن/شت) هەتا پتەو و بەهێز بێت. ئەم جۆرە وەڵامدانەوەیە چاوەڕوانکراو و ڕەخنەییانەو بەخۆداچوونەوەیە. ئەویش وەڵامدانەوەی فرە دەنگیە پێش ئەوەی هاوشێوەیی لە بابەتدا پتەوو بەهێز بکرێت بۆ ناسنامەیەکی پەسەند یان پۆزەتیف. ئەو وەڵامدانەوەیە دەپرسێ داخۆ ئەم لەو شێوە دەرکەوتنەدا هەوڵدەدات بۆ سەپاندنی ناسنامەی خۆی وەکو ناسنامەیەکی باڵادەست و سزای ئەوانە دەدات کە پێ لە ناسنامەکەی ئەو دەنێن؟

بە پێی بۆچوون و تێڕوانینی ویلیەم کۆنۆلی ئەرکی (ئەخلاقزانی) بۆ ڕێگاگرتنە لە هەر یاسایەکی ئەخلاقی تەنیا بۆ دەسەڵاتکردن بەسەر ئەو بوارەدا.

ئەوەش هەڵوێستی بە خۆداچوونەوەیە کە تیایدا وەڵامدانەوەکان بۆ بە فرەدەنگ کردنی بزوتنەوەکان دەبێ پێداچوونەوەی ناسنامەکانی خۆیان بکەن بە مەبەستی بوارکردنەوە بۆ ناسنامە نوێیەکان.

لە کاتێکدا کە بنەماکانی مۆدێرنیزمی هیگڵ و مارکس لەژێر کاریگەری قورسی خۆیاندا هەرەس دەهێنن، هەڵوێستی نموونەیی (دوای-نیتشەیی) ویلیەم کۆنۆلی باری دەوڵەمەندکردنی ژیانی فرەدەنگی لەسەر حسابی تاکە ناسنامەیەك زیاتر دەسەپێنێت. لە سەردەمێکدا کە پێمان دەڵێن دیموکراسی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، ویلیەم کۆنۆلی هانمان دەدات بۆ ئەوەی بیر لەوە بکەینەوە کە بە ڕاستی دیموکراسی چیەو ژیانی دیموکراسی چ مانایەکی هەیە.

سەرچاوە:

*لە گۆڤاری:*

**Radical Philosophy - no (81)-1997- p. 53.**

❑

# ئەبێ لەبەر بارانا لەگەڵ ئافرەتا بخەوین

**ناوی کتێب: تریفەی تەنیایی (ژیان و شیعری سوهراب سپیهری)**
**هەڵبژاردن و وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی**
**لەبڵاوکراوەکانی: چاپخانەی گوڵزار**
**چاپی یەکەم: سلێمانی**-2000

● سامان حوسێنی




"تریفـــەی تـــەنیایی" هەڵبژاردەیـەك لـە ژیاننامـەو شیعرەکانی شـاعیری نـاوازەی ئـێرانی سـوهراب سـپیهری (1938–1980)یە، کە بەهەوڵ و هیمـەتی ڕۆشـنبیرو وەرگـێڕی بەخشندە کـاك ئـازاد بـەرزنجی وەك چـەندین بەرهـەمی دیکـەی ئـەدەبی فارسـی ماوەیـەك لەمەوپێش کەوتـە کتێبخانـەی کوردیەوە.

دیـارە جیـهانی شـیعری‌و فکریـی سوهراب کـەم و زۆر بـۆ خوێنەری کورد نامۆ نیـە، بـەڵام بێگومـان تـا ئێستا ئەمە تـەنیا کتێبێکی سەربەخۆیە کە بتوانێ تـا ڕادەیـەکی زۆر، بپەرژێتـە سەر لایەنە جۆربەجۆرەکانی ئەم

کەسایەتیە جوان و هەڵبژاردەیەی ئەدەبی فارسی،و ببێتە تەنیا سەرچاوەیەکی جێگای دڵنیایی کە خوێنەری کورد بگەڕێتەوە سەری.

لێرەشەوەیە کە شانازیو ڕچەشکێنی ئەم کتێبە ئەوەندەی دیکە بە نسیب وەرگێڕەکەی دەبێت، کە بێگومان بە هەموو لایەنگرێکی ئەدەبی فارسی ئاشنایەو تا ئێستاش چەندین دەقی بەنرخی دیکەی فارسی گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردی.

شیعری سوهراب بانگەشەیە بۆ مرۆڤ بوون، بەڵام ئەو مرۆڤە نا کە لە هەوڵدانێکی سایکۆلۆجیو لەژێر کاریگەری فاکتەرە جۆراوجۆرەکانی وەك ژینگەو بۆ ماوەیی ڕووداودا دێتە سەرهەڵدان، بەڵکو ئەو مرۆڤەی کە لە خەونی سوهرابدایە، مرۆڤێکی نموونەیی، مرۆڤێك کە خۆی لە هەموو ئەو قەیدو بەندو ڕایەڵانە ڕزگارکردووە کە ئەیبەستنەوە بە دەرەوەی خۆی، کەسێك کە دەبێ بچێتە بن باران تاکو پاکی بەرائەتەکەی خۆی بەدەست بێنێتەوە، کەسێك کە لەگەڵ عەشقدا ئاوێتە بووبێو لە عەشقا توابێتەوە، کەسێکی زاتی.

ئا لێرەوەیە کە جیهانێکی تایبەت دروست دەبێ کە هەموو ئەو عەقڵانە ڕەت دەکاتەوە کە هەر تەنیا لە سنوورەکانی بینین و بیستندا دەتوانن پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤدا ببەستن و مرۆڤ شیبکەنەوە.

سوهراب ئەودیو سنوورەکانی جەستە دەبینێ، ئەو هەرێمانەی کە عەقڵانیەت لێیان بێ خەمەو ڕۆحانیەتیش ئەگەرچی وەڵامی پێ نیە بەڵام توانیویەتی تیا غەرق بێت.

کاری ئێمە پەیبردن نیە بە
نهێنیی گوڵە باخ
ئەشێ کاری ئێمە ئەوەبێ
لە ئەفسونی گوڵە باخدا
مەلە بکەین

سیحرو نهێنی شیعری سوهراب لەوێوە نیە کە ئەویش وەك هەر شاعیرێکی دیکە هەوڵی دابێ خاوەنی تایبەتمەندیو عالەمی تایبەت بە خۆی بێ، بەڵکو لەوێوەیە کە ئەم لەوپەڕی سادەییدا ئاڵۆزترین حەقیقەتەکانمان بۆ شیدەکاتەوە (سادەیی) و (ئاڵۆزی)ش هەردووکیان پێکەوە تایبەتمەندیەکیان بەخشیوە بەزمانی شیعری ئەم شاعیرە، بەڕادەیەك کە دوو حاڵەتی تایبەت بەنیسبەت خوێنەرەوە دەخوڵقێنن، یەکەم ئەوەی کە جۆرو لایەنی تێگەیشتنەکان زۆرترو فراوانتر دەکەن و دووهەمیش ئەوەی کە گۆڕینی ئەو زمانە بەزمانێکی دیکە گران و تەنانەت مەحاڵتر دەبێ، هەر بۆیەش گۆڕینی شیعری سوهراب لەگەڵ ئەوەدا ئەرکێکی قورس و گران و ناسکە، هاوکاتیش جێگای نرخاندن و بایەخێکی بێ سنوورە.

زۆربەی ئەو لێکۆڵەرەوەو ڕەخنەگرانەی کە لەسەر سوهراب نوسیویانە، کۆکن لەسەر ئەو ڕایەی کە ناوبراو تاڕادەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەریی ئاین و کلتوورە شەرقیەکان بەگشتیو ئاینی بوودایزمی هیندی بەتایبەتیدا بووە، هەروەها ناوبراو ڕەگەزێکی عارفانەو سۆفیانەی تیابووەو وەك کریشنامۆرتی هەوڵی ئەوەی داوە وشە بەتاڵ بکاتەوە لە پێناسەکەی خۆیو ئازادی بکات لەو ناوەڕۆکەی کە داگیری کردووە. کەوابێ ئیتر سوهراب ئەبێتە خاوەنی زمانێکی جیاوازتر کە بە جۆرێك لە جۆرەکان ئەو زمانەی کە شیعری پێنووسیوە (زمانی فارسی) دەخاتە ژێر کاریگەریی زمانێك کە ڕەنگە ئازایەتیەکی زۆری بوێ کە بوترێ هەر تەنیا زمانی سوهراب سپیهریەو بەس.

زمانی سوهراب زمانی تەعبیر لە جیهانێکە کە ئەو دونیایە تا ئێستاش زۆر بە دەگمەن لەناو ئەدەبی کوردیداو لە خەون و خەیاڵی داهێنەرەکاندا لە دەقەکاندا وجودی هەبووە، ئەگەر مەحوی و نالیش وەك نموونەی کۆنی خۆنزیك کردنەوە لەو عالەمە جێگای سەرنج بن هێشتا زمانی ئەوانیش بۆ هاوکاری خوێندنەوەو وەرگێڕانی شیعری سوهراب ناتوانن هیچ یارمەتیەکی وەرگێڕو خوێنەری شیعرەکانی بدەن چونکە سوهراب لە کۆتاییەکەوە دێتەوە بۆ سەرەتاکان کە ناشارەزایی و بێئەزموونی دەکاتە دیاری و ئەمەش وا دەکات کە بەناچار هەرجۆرە هەڵسوکەوتێك کە لەگەڵ شیعری ئەودایە دەبێ پشت ئەستوور بێ بە لانی کەم بەشێکی ئەو سەرچاوانەی کە سوهراب لەژێر کاریگەرییاندا بووەو بەهەمان تەئسیرەوە جەزمەی شیعری گرتووە.

وەرگێڕانی شیعری سوهراب بە مەرجی دەقاودەقی ئەو رستەو دەستەواژانە نیە کە قەسیدەو شیعرە کورتەکانی ئەوی پێدارێژراوە بەڵکو پەیوەستە بەو جۆری وەرگرتن و تێگەیشتنی کە وەرگێڕ سەرلەنوێ بەزمانی کوردی دایدەڕێژێتەوە، لێرەوەیە کە کاك ئازاد لەگەڵ ئەو هەموو گیرو گرفتە بێسنوورانەی کە زمانی کوردی بۆ گەیاندن و جاڕدانی شیعری سوهراب هەیەتی هەوڵێکی زۆرو زەحمەتێکی زۆرتری کێشاوەو ئەمەش بە بەرجەستەییەکی ئاشکراوە لە (تریفەی تەنیایی)دا بەدی دەکرێ. بەڵام ئەوەی کە ئەو وەرگێڕانە چەندە توانیویەتی بیروڕاو زمانی سوهراب بە خوێنەری کوردزمان پێشکەش بکات پرسیارێکە کە یەکانگیری رەگەزەکانی فیکرو زمانی شاعیرو دەقە وەرگێڕدراوو بەکوردی کراوەکە ئەیسەلمێنن.

لایەنێکی گرنگی دیکەی ئەم بەهرە بە کوردی کراوە ئەو چەند بابەت و وتارانەن کە لە پێشەکی کتێبەکەدا بۆ زیاتر روونکردنەوەی بوارە جیاوازەکانی روئیاو کەسایەتیو بیرکردنەوەی سوهراب وەرگێڕاون. هەر لەبەر تیشکی رووناکی ئەم نوسینانەشدایە کە خوێنەر دەتوانێ ئاست و رادەی هۆشیاری شاعیرەکە زیاتر دەرك بکات و هاوکاتیش دەتوانێ لە دەلاقەی ئاگاداری لە روانگەکانی سوهرابەوە بۆچوونی خۆی لەسەر دەقە بە کوردی کراوەکان رابگەیەنێ و بزانێ ئاخۆ ئەو جیهانبینیە چەندە گەیشتۆتە زمان و خوێنەری تازە.

*نەشترسین لە مەرگ*
*مەرگ کۆتایی کۆتر نیە*
*......................*
*......................*
*سیەکانی لەزەت پڕن*
*لە ئۆکسجینی مەرگ*

"مەرگ" و "عیشق" و "بوون" باگراوندە سەرەکیەکانی شیعرو هونەرو فیکری سوهراب سپیهرین، ئەو لە پێناو شۆڕبوونەوە بە قووڵاییەکانی "مەرگ"دا ناچارە بیکاتە شتێکی ئاشکرا، بەڵام ئاشکرایەك کە ئەو مەرگە بە پێوەری ژیان:

*ژیان پەڕو باڵی هێندەی مەرگە*
*عەشقیش ئەبێتە تووشبوون:*
*-عاشق*
*-ئینجا بزانە چەند تەنیایە*
*گەر ماسیەکی چکۆلە*
*تووشی ئاوی دەریایەکی*
*بێسنوور بێ.*

ئەم کتێبە لە قەبارەیەکی مام ناوەندیداو لە 130 لاپەڕەدا لەلایەن چاپخانەی گوڵزارەوە چاپ و بڵاوبۆتەوە. ❑

# ماڵاوایی لە ڕابردووی خۆم

## -بیرەوەریەکانی ڕۆمان ڕۆلان-

● س.ح.

نووسەری فەڕەنسی سەدەکانی نۆزدەو بیست ڕۆمان ڕۆلان (1866-1944) لەگەڵ ئەوەشدا کە لە سەردەمی خۆیدا پلەیەکی تایبەت و حاشا هەڵنەگری بەدەست هێنابوو بەڵام هێشتاش بەو جۆرەی کە شیاو بێ نەناسراوە، چیها تۆمەتی دیاریکراو کە لێی نەدراوە! کتێب نووسی سەرەتایی" (ژان کریستۆف) خائین بە نیشتمان" (بە سەرسەری شەڕەوەو هاوڕێیان) پڕوپاگەندەچی شۆڕشی سۆڤیەتی و...

ڕاستە کە زۆر جار ڕۆلان سەبارەت بە خۆی ئەو وتەیەی گۆتەی بەکاردێنا کە دەڵێ: "بمرەو ببە!" بەڵام بە ڕواڵەت هەموو جارێك ئەیتوانی خۆی لە چوارچێوەی ئەم "گۆڕان"ە یەك لە دوای یەکانە ڕزگار بکات.

ژیانی ڕۆلان تا ساڵی 1930 بە تەواوی روونە، بەڵام ئاگاداری ئێمە لە 15 ساڵی دوایی تری تەمەنی ناوبراو کەم بووەو نووسینە ئوتوبیوگرافیەکانی لەم بارەیەوە کەم و کووڕی زۆریان هەیە. بەو هەمووشەوە ئەگەر ژیانی ڕۆلان لە ڕەوتێکدا پێوشوێن بگرین کە لە "ڕەوتی دەروونی"دا بۆ خۆی هێناویەتە ئاراوەو لەودیو ئەو جۆراو جۆریە دەرەکیەدا بە دوای لێکۆڵینەوەی وەك یەکی ژیانی ئەودا بچین، کارێکی ئەوەندەش زەبەلاحمان نەکردوە.

### فەلسەفەی "گۆڕان"

ڕۆلان کە هەموو کات ناخی خۆی لە بۆچوونەکانی گۆتەو شیللەرو ڤیکتۆر هۆگۆو میشلەو موسیقارە مەزنەکانی سەدەی نۆزدە بە تایبەت بیتهۆڤن- تێر ئاو ئەکرد، باوەڕێکی پتەوی بە فەلسەفەی جیهانی گۆڕان هەبوو، ئەو لە ژێر شوێنەواری بەهێزی سپینوزاو تۆلستۆیدا دنیای بە بوونەوەرێکی ئاوی دەزانیو هەر کام لە تاکەکانی مرۆڤیشی بە بەشێك لەم ژیانە دەزانی کە لە جوڵەیەکی هەتا هەتاییدایە. ڕۆلان لەبەر ڕەشبینی بنەڕەتی خۆی بەجۆرێکی تراژیك هەستی بە مێژوو ئەکرد بەڵام ئیمانی بەم بوونەوەرە جیهانیە هەبوو پەیڕەوی لە گیوم دورانژ ئەکرد کە وتبووی "نە بۆ دەست پێکردنی ئیش نیاز بە هیوا هەیە نە بۆ لێبووردنیش نیاز بە گەیشتن بە چێژ هەیە".




رۆلان بەقووڵی ئاینی بوو، ڕێزێکی قووڵی بۆ خواوەندگاری خۆی هەبوو، ئەو ئیمانێکی پتەوی بە بەهاکانی ئەوپەڕی مرۆڤ هەبوو بەردەوام پێداگر بوو لە سەر ئەوەی کە پرێشکەکانی ئیلاهی ئەو جۆرە بەهاو بایەخانەی کەلە ناخی هەر مرۆڤێک دا بدۆزێتەوە، لە گیانیەوە هەڵیدەڕژێنێ.

لە رۆڵان دا بەر لەوەی لەگەڵ دیسپلینێکی لە سەریەک لە ئەندێشە رووبەڕوو، بین لەگەڵ شێوەیەکی غەریزەدا رووبەڕوو ئەبین کە زۆربەی کات بە هێزێکی تەواوەوە دەرئەبڕێن، چونکە ئەو لە هەموو حاڵەتێکدا چ ئەو کاتەی کە بۆچوونێك دێنێتە ئاراوە، چ ئەو کاتەی دەست ئەداتە کارێك هەموو کاتێك مرۆڤێکی حەماسیە، مرۆڤێکە ناسك و لە هەمان کات دا توورە، بەو هەمووەشەوە حەماسەتەکەی ناتوانێ بەر بەڕووناك بینینەکەی بگرێ ئەو مەجالەی کە دەبێت هەبن بۆ دابەزین لە هەڵوێستەکانی دا.

هەر بۆیە رولان هۆشیارە تا هەموو کات لە لێکەوتنەوەدا هێڵە گشتیەکانی جیهان بدۆزێتەوە.

پیاوی لەیەك دابڕانەکانە (دابڕان لە خۆی، لە هاورێکانی، لە بە ناو "رولانیستەکان" و..) پیاوی ماڵاواییەکانە ("ماڵاوایی لەگەڵ ژان کریستۆف" لە 1912) "ژیان زنجیرەیەکە لە مەرگەکان و لە دۆزەخەکان". (ماڵئاوایی لەگەڵ ڕابردوودا. 1931). پیاوێك کە هەمووکات دەست پێ ئەکاتەوە تاکو نەك هەر لە شەپۆلی هەڵرژاوی ژین دا یەکبوون و سەقامگیری خۆی بدۆزێتەوە بەڵکو مۆرێکی نوێشی لەم زانە ئەبەدیەدا بێ:

"کریستۆف وەرە پێکەوە بمرین تا سەرلەنوێ زیندوو ببینەوە".

بەمجۆرە ئەکرێ لە بەرهەمە چیرۆکیو شانۆییەکانی رولان دا لە هۆکاری گرنگی مەرگ تێبگەین. "ئانتوانت"و "ئولیویە" پێویستیان بە مردنی باوك و دواتر دایکیانە تا بتوانن بژین، ئۆلیویە بۆ ژیان پێویستی بە مەرگی ئانتوانتە تاکو رۆحی خوشك لە گیانی برادا جێگیر بێ‌و روباری ژیان لەمەوە بۆ ئەوی تر بەردەوام بێ، لە "گیانی شەیدا"دا وەزع بەمجۆرەیە "ئانت" دایکی

"مارکە" بەڵام ئەم بە مەرگی خۆی ژیانێکی نوێ دەکاتە خەڵاتی دایکی، ئالێرەدا تێدەگەین کە بۆچی ڕۆلان لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەیتوانی بە باشی لە ڕۆمانە کورتەکانیدا "کولابرۆنیون" و "پیرۆلۆس" وەك چاودێری ئەم ئیدیعایە سەرکەوتوو ببێ وای پێ باشتر بوو خەریکی نوسینی بەرهەمی دەورەیی بێ. ئەم کتێبانە دەرفەتیان بۆ دەرەخساند کە ڕوباری هەموو کات گۆڕدراو بەڵام بەردەوامی ژیان شی بکاتەوەو بە جێگرکردنی ژیانی پاڵەوانی خۆی ڕوانگەی جیهانی خۆی لە کۆکراوەیەکی بەربڵاوتردا بپارێزێ، ژیانی کریستۆف هەروەك خۆرێکی عەزیم بەدیار ئەکەوێ. ڕۆمانەکە بە بوولیلەکە دەست پێ ئەکات و بە ڕۆژێکی رووناك کۆتایی دێ. لە "گیانی شەیدا"دا ئانت و کوڕەکەی بێجگە چەند چرکە ساتێك لە "خۆهەڵدانی گەورە" نین و ڕۆمانەکە بە "زان" کۆتایی دێ. لە دەورانی بەرهەمەکانی "شۆڕش"یشدا کەسەکان بێجگە چرکەساتێکی کورت نین لە مێژوویەکی بەربڵاودا کە ئەو مێژووە لەوان بەرەو سەرتر دەچێ. بەمجۆرە "یاسای گەورەی ئاهەنگ" کە لە سەراسەری تەمەنی ڕۆلان دا لە دەنگدانەوەدا بوو، دێتە نواندن.

### "ماڵاوایی لەگەڵ ڕابردووی خۆم"

منالی دوورەپەرێزی شارستانی کە لە خەیاڵیدا بە بیر لە شکسپیر و لەگەڵ دەست پێ کردنی نووسینی چەند ڕۆمان دا ڕۆحی خۆی دەخاتە باڵەفڕە، خوێندنی خۆی لە پاریس درێژە پێداو هەر کە چووە ناو پەیمانگای بەرز، ئاسۆکانی خۆی بەربڵاو کرد. لە سویس پەیوەندی لەگەڵ سروشت داو خوێندنەوەی بەرهەمەکانی تۆلستۆیو سپینوزاو مۆسیقی کە گوێی بۆ دەگرت و بۆخۆشی دەیژەنی بەرەبەرە بەرەو ڕوانگەیەکی هەمەلاگیر رایکێشا کە ئەو شتەی کە "ئیمانم هەیە چونکا حەقیقەتە". کردۆتە جۆرێکی بیرلێکراوە. بە بزووتن لەو ڕوانگەیەوە بوو کە ڕۆلان دەستی کرد بە گەلالە دارشتنی یەکەمین بەرهەمەکانی خۆی بە تایبەت "مێژووی شەڕە ئاینیەکان لە فەرانسەی سەدەی شانزە"دا کە لەودا لایەنێکی حەماسی بە گەشەکردنی مێژوویی بەخشیوە. ڕۆلان بەم گیانەوە دەستی کرد بە نوسینی یەکەمین دراماکانی خۆی کە بە چاپ نەکراوی مانەوە. ئەم نووسینانەی لاویشی بە بێگومان کاردانەوەی بەختەوەری پیاوێکە کە عەشق و سۆزی ناسیبوو. بەڵام ئەو نوسینانە لە هەمان کاتدا حەماسەتی ژیانی جیهانیو تەنانەت نائومێدی ڕۆلانیش دەردەخەن کە لە چرۆی مەرگی شاردراوە لە تەواوی شارستانیەتەکان دا سەرسوڕماو ببوو. ڕۆلان لە ساڵی 1985 ەوە قۆناغێك لە سەرشکان تێ ئەپەڕێنێ. نهێنی دڵی خۆی ئەسپاردە ڕۆژنامەی بیرەوەریەکانیو بە نووسینی شانۆنامەی تازە لە هەوڵی ڕێگایەکدا بوو بۆ ڕزگاری خۆی. کاری لەسەر ڕۆمانێك ئەکرد کە لە ساڵی 1890 وە بیری لێ کردبۆوەو چەند لاپەڕەیەکیشی لێ نووسیبوو. سەرەنجام مۆسیقا مۆسیقای بیتهۆڤن ی لە بیر نەئەکرد. ئالۆزی هەل و مەرج لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا ئەو هەستەی ئەبەخشیە ڕۆلان کە گوایا شارستانیەت بەرەو لەناو چوونە. بە هۆگریەکی زۆرەوە چاودێری گەشەی سوسیالیزمی تازە لە دایکبوو، بوو. پێی وابوو سۆسیالیزم توانای دوبارە گیان

بە بەراکردنی کۆمەڵگەی پیرو وێستاوی هەیە، لەو حاڵەدابوو کە هیوایە بە ڕێنسانسێکی نوێ، بە بناغەیەکی تازە لە ژیان دا، بە ئامانجێکی نوێو خواوەندێکی سەر لەنوێ بیرکردنەوەی ناوبراوی ئەلاواندەوە.

بۆ رۆلان ساڵی 1901 خاڵی وەرچەرخانێکی مەزن دێتە ئەژماردن. بەدوای جیابوونەوە لە هاوسەرەکەی، تەنیا بە بەرەکەتی بیتهوڤن بوو کە لە نائومێدی خەلسا. لە هەموو تەمەنی‌دا کرنووشی بۆ ئەم ئاهەنگسازە ئەبرد، لەم کاتەدا هەستێکی هێمن بوونەوە، لە چەشنی هەستی گۆتە بەسەریدا زاڵ بوو، کە دواتر لە ژان کریستۆف دا رەنگی دایەوە. رۆلان کە لە نوسینی "ژیانی بیتهوڤن" و ئەوەی کە دەتوانێ بڵاوی بکاتەوە نووسینی شانۆی لاخست، تاکو خەریکی نوسینی ئەو شتە بێ کە پێی وابوو وەسیەت نامەکەیەتی‌و ئەمەش یەکەمین "ڕەوتی دەروونی" ئەو بوو. رولان دەستی دایە بەراوردی سەر لەنوێی ژیانی خۆی‌و رزگارکردنی خۆی لە چنگی رابردووی خۆی‌و ئەو کاتەی کە ئەو زەمانە ئەهاتە کۆتایی دەیتوانی بڵێ: "ماڵاوایی لە گیانی رابردووم" ئەو کاتە ئەیتوانی "راکردن بۆ ئامێزی حەماسەتە تازەکان" و "کۆلابرینۆن" بنووسێ.

## "ئەوروپا سەرتاپا ماڵی شێتەکان"

شەڕ دەستی پێکرد. رۆلان لە سەیرانگای بەجێی لایەنە شەرکەرەکان لە سویسراوە هاواری خۆی "بە سەرسەری شەڕەوە" (نوامبری1915) چڕی، لە 1917دا "بۆ سۆڤیەتی رزگارو رزگاریدەری" نووسی. چون شۆڕشی سۆڤیەتی بەهیوایەك دەزانی لە بەرامبەر لە بەر یەك هەڵتەکانی شارستانیەتی ئەورووپادا: "قۆناغی نوێ، رێگای نوێو هیوای نوێ دەخوازێ". بەلام لەم دروشمەدا هوشیارکردنەوەیەکیشی تیایە: :هەوڵی ئەوە بدەن شۆڕشەکەی ئێوە شۆڕشێکی خەڵکی (جەماوەری) مەزن، تەندروست و برایانەو مرۆڤانە بێو وەك ئێمە نەکەوێتە داوی سنووربەزاندن! (....) لە ئێمە خۆڕاگرتر بن!

بە دوادا هاتنەکەی ئەزمونی شەڕ لە "پیرولوس" "کلرئامبو" و "لی‌لولی" (یەکەمین بەش لە بەرهەمێکی سیانەی کە دوویەشی دیکە ئەنووسران) دوایش لە سێ بەرگی یەکەمینی گیانی شەیدادا دەرخست، رولان لە پەیماننامەی وەرسای‌دا بێجگە هەناسەدانێکی پێکەنین هێنەر لە نێوان دوو کوشتاری مەزنی مرۆڤەکاندا شتێکی دیکەی نەئەبینی هەر بۆیەش تێکۆشانێکی نێونەتەوەیی لە رێگای ئاشتی‌دا دەست پێکردو راگەیاندراوی "سەربەخۆیی گیانەکان"ی بلاوکردەوە (1919) کە بە دوادا هاتنێکی وای نەبوو. رۆلان باوەڕێکی پتەوی بە زەروورەتی شۆڕشی کۆمەلایەتی هەبوو بەلام نەیدەزانی چۆن بەشێکی هەبێت لە وەدی هێنانی ئەو خەونەداو بە کردەوە بەجێی بگەیەنێ و چۆن دنیای نوێی خۆی دروست بکات بەلام بەخۆڕانەگرتنی حیزبانێك کە لە جیابوونەوەی تور هاتبونە دەرێی رازی نەدەبو و توندوتیژی شۆڕشگێڕانەی ڕەت ئەکردەوەو ئەمەش خاڵی بنەڕەتی جیاوازی ئەو لەگەڵ باربوس دا بوو. رۆلان هەستی دەکرد کە "گەردەلول بە سەر ئەورووپا" بەڕێوەیەو بەدوای ئەوەوە بوو تاکو دیوارێك بەرامبەر ئەودا هەڵچنێ.

**"خۆر سەرلەنوێ لە رۆژهەڵاتەوە دەدرەوشێتەوە"**

رۆلان لەم زەمانەدا وەك ئەو سەردەمەی کە ژان کریستۆفی تەواو کردبوو لە شوێنی جیابونەوەی جادەکان دا بە دوودڵییەوە وێستابوو، گەڕایەوە سویس، ئەو چوار ڕێیانەی ئەورووپا. رۆلان ئەیویست سەیرکەرێك بێت لە پێناو دۆزینەوەی "هێزی ئەفسووناوی ڕێنیشاندەری سەردەمی خۆی" رووی بەرەو ئاسیا وەرگێڕا لەوێ "بولێڵەی بەشکۆ" خۆی بەدیارخست. رۆلان خەیاڵی ئامومکینی هەبوو، ئەوەی کە شۆڕش بەبێ توندو تیژی بەڕێوە بچێ، سۆڤیەتی لینینی لەگەڵ هیندستانی تاگورو گاندی بەراورد دەکرد. بەرهەمەکانی رۆلان گاندیو سیحری زیندووی هیندی لە ئەورووپادا ناساند، بەڵام دواجار لە هیندستانیش رووی وەرگێڕا چونکە لە بەرامبەر زۆر بوونی جوڵانەوەی فاشیەت لە ئەورووپادا کە بەربەرەکانیەی خۆڕاگرانەی دەویست، نەبوونی توندوتیژی نەیدەتوانی رێگاچارەیەکی بەجێ بێ.

**"ماڵاوایی لە رابردوو"**

رۆلان نائومێد لە هیندوستان، لە ئەورووپا هیوا خەیانەت پێ کراوەکانی خۆی ئاراستەی یەکێتی سۆڤیەت کرد و سەرەنجام توندوتیژی شۆڕشگێڕانەی قبوول کردو کۆمۆنیزمی لە روانگەی گەشەکردنی خۆیدا جێ کردەوە، بڕوای هێنابوو کە ئارمانی کۆمۆنیزم لوتکەیەکی قارەمانانەیە. بڕوایەکی کۆمەڵایەتیو بنیات نەری جیهانێکی نوێیە، لێرەدا لەگەڵ هەمان سۆفیگەری حەماسیانەی "ئیمانم هەیە چونکا حەقیقەتە". رووبەڕوو دەبینەوە تاك وەك بەشێك لە کۆ دەبێ خۆی لەگەڵ مرۆڤایەتیدا بکاتە یەك. دەبێ خۆی بسپێرێ بە دەستی ئەم لافاویی توانایی ئیمان و شادمانیە کە لە هەموو خەیاڵەکان واوەتر ئەچێ". رۆلان لەو لایەنەوە کۆمۆنیزم وەردەگرێ کە بە هەڵگری ئەو بیرو بەهایانەی دەزانێ کە هەموو کات بۆخۆشی پارێزەری هەمان ئەو بەهایانە بووە، ئەو بیرو بەهایانەی کە بە بڕوای ئەو لە جیهانی لە حاڵی گۆڕاندا لەگەڵ جیهانی هەمیشەیی ئەودا لەیەك ئەچوون. لێرەدا بوو کە ئەو لە هەموو حەماسەتی خۆیەوە خەریکی پاساوی ئەو شتانە بوو کە تا دوێنێ پێی وابوو هێشتا بۆ قبوول کردن نابن، راکێشرانی ئەو بۆ لای کۆمارەکانی یەکیەتی سۆڤیەتی بەتایبەت سەرچاوەگرتووی نیگەرانی ناوبراوە لە پەل هاویشتنی فاشیزمی هیتلەری کە بە بێ ماندووبون بە دژی شەڕی دەکرد لەم سەردەمەدا رۆلان بە جیددی توشی خەباتی دژی فاشیستی بوو لە پەنای باربۆسیدا بوو بە داهێنەری رەسمی کۆنگرەی ئاشتی ئامیستردام (1932) "گیانی شەیدای" کۆتایی پێ هێنا، ئێستا بە تەواوی هاتبروە ریزی کۆمۆنیستەکانەوە سەفەرێکیشی بۆ مۆسکۆ کرد لە ساڵی 1936دا سەرکەوتنی چەپی فەڕانسەی لە قەوارەی "بەرەی جەماوەری"دا بەچاوی خۆی بینیو بڕیاریدا بگەڕێتەوە فەڕانسەو لە وزلە نیشتەجێ بێ.

**"لە جوغزی کردەوە کەوتوومەتە دەر"**

بەڵام خەیاڵ نێوانێکی زۆر لەگەڵ واقیع دا هەبوو. ئایا رۆلان نەکەوتبووە "داوی خەیاڵات"ەوە؟ کۆچی دوایی گۆرکێ لە 1934 دا تەئسیرێکی زۆری لە رۆلان کرد، دواتر سەرە گەیشتە دادگاییەکانی مۆسکۆ، لە 1939دا رێکەوتنی ئاڵمان و سۆڤیەت رۆلانی ئاڵۆز کرد.

کاتێ کە شەڕ ڕاگەیاندرا ڕۆلان، ئەم خەباتگێڕە پیرەی ئاشتی رووی دەمی لە دالادیە "وەفاداری خۆی بە ئامانجی دیموکراسیەکان" دەربڕیو چووە ریزی کەسانێکەوە کە هەستابوون تاکو ڕێگا لە سەرکوتی هیتلەر بگرن".

ئێستا چرکەساتی دوورە پەرێزی هاتبوو "کار بۆمن تەواو بووە. !..." دواین پەڕەی دەفتەری خەیالاتیش هەڵدراوەتەوە. لە جوغزی کردەوە کەوتومەتە دەر. بەو حاڵەش ڕۆلان تا دواین ساتەکانی تەمەنیشی، ڕووناکبینی خۆی هێشتەوە، بە گیانێکی خۆبەکەم زانینەوەو لەگەڵ پاراستنی ئازادی تەواوی خۆیدا خۆی خەریك کرد بە ئاکامی بەرهەمی دە ساڵی رابردووی خۆیەوە، و ڕەوتی دەروونی تەواو کرد. لە 1935دا نووسی "هوشیاری من هیچ کاتێك لە فروفێڵەکانی حەماسەت و کەموکوڕیەکانی کەسایەتیم دا دەوریان نابێ".

لەگەڵ هاوڕێ کۆنەکانی لویی ژیلە و پل کلۆدل پەیوەندی گرتەوە، کتێبەکەی "بیتهوڤن قۆناغە گەورەکانی داهێنان"ی تەواو کرد بە نووسینی کتێبی "بیرەوەریەکان"ی خۆی کە بۆ دانانی ژیانی پگی" هەندێکجار نووسینەکەی دەبڕی، دواترین کتێبی کە جێگای ستایشترین بەرهەم لە زنجیرە ژیاننامەکانی پاڵەوانانی ڕۆلان بوو لە هەلومەرجێکدا نووسرا کە ناوبراو لە رادەبەدەر بە دەست نەخۆشیەوە زەجری دەچێشت.

ئەمە بوو بە سەرهاتی ژیانی ڕۆلان کە مۆرێکی لە دڵئاوایی لێدرابوو. کەسایەتی شادی هێنی ناوبراو کۆمەڵێك لەو چەند لایەنیانە بوو کە هیچ ترسێکی لە دژ بوون نەبوو. ئەم رستەیە کە ڕۆلان لە ستایشی پگیدا نووسیبووی رەنگە بکرێ سەبارەت بە خۆشی بەکاربهێندرێو پێی داگرت کە دژایەتی ناوبراو لەلای ئەو دیاردەیەکی بە تەواوی ڕواڵەتی بوو. ڕۆلان تەواوی ژیانی خۆی تەرخانی وەفاداری هێزێکی نادیارو خواوەندێکی نهێنی کردبوو کە دنیای دەخستە جوڵە، ئەم رستەیەی تریش لە بارەی ناوبراوەوە جێی خۆیەتی "هیچ حیزبێك، هیچ هاوڕێیەك. هیچ موریدێك، نابێ ئەو گیانە ئازادە بە تەنیا هەر بە هی خۆی بزانێ!" مەخابن ڕۆلان چارەنووسێکی زۆر خەمناکتری لە "پگی" هەبوو زۆرجار سەبارەت بەو ئەیوت: "ئەو سیما لە هەموو لایەکەوە جوان"ە بێجگە دیمەن گەلێکی مەسخ کراو لە چوارچێوەدا هیچی تر بەدیار ناکەوێ.

بەرهەمە چیرۆکیەکانی ڕۆلان لە لایەنی بەربڵاویانەوە شیاوی سەرنجێکی تایبەتین، یەکەمین رۆمان لە "رۆمان–ڕووبار"ەکانی واتە ژان کریستۆف تا ئێستا شوێنێکی حاشاهەڵنەگری لە مێژووی رۆماننوسیدا داگیر کردووە "کولابرنیون" خەڵکی ترین رۆمانی ناوبراوە کە لە سەرانسەری جیهان دا بەزۆرترین کەڕەت وەرگێڕدراوە سەبارەت بە "گیانی شەیدا" بۆچوونەکان جیاوازن. بایەخی زنجیرە شانۆنامەکانی شۆڕش زیاتر بەهۆی سریوەیەکی دلڕفێنە کە دانەر لە گیانی گەڕاندوون. بەڵام نرخی ڕۆلان وەك رۆمان نووس پەیمانی ناوبراو لە "بەسەر سەری شەڕەوە" لایەنی مۆسیقاناسیەکەی و لێهاتوویەکەی لە دانانی ژیاننامەی پیاوە گەورەکان دا (بیتهوڤن. پگی...) لە بیر ناکا. لەناو بەرهەمەکانیدا ئەوەش کە سەبارەت بەژیانی خۆی نوسیویەتی نەمرە، بەتایبەت "ڕەوتی دەروونی"و "بیرەوەریەکان و کۆمەڵێکی زۆر لە نامەکانی کە زۆربەیان هێشتاش نەناسراون.

**سەرچاوە:**

*کتێبی "خاطرات جوانی" نوسینی رۆمان ڕۆلان، وەرگێڕانی بۆ فارسی ناسر فکوهی، لاپەڕەی 367 تا 376*

